# كتاب التوحيد
## الذي هو حق الله على العبيد

للإمام محمد بن عبد الوهّاب

ومعه

# یەکتا پەرستی

مافی خودایە لە سەر بەندەکانی

تەرجەمە و ڕوونکردنەوە لە سەر

كتاب التوحيد

ئامادە کردنی  إدریس کوڕی عبدالعزیز

- ناوی کتێب : تەوحید
- نوسەر : ئیمام محمد کوڕی عبد الوهاب
- ئامادە کردنی و ڕوونکردنەوەی : إدريس کوڕی عبدالعزيز
- تیراژ: دانە.
- چاپخانە :
- نۆبەتی چاپ : چاپی دووەم پوختە و زیادە کراوە
- ژمارەی سپاردنی ( ) پێدراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

مافي هەمو موسڵمانێکە بەڵام بەبێ دەستکاري کردني بەرپێچەوانە خیانەتە

بورەخنەو پێشنیارەکانتان پەیوەندی بکەن بە:

F.K.B.2012.HMK@Gmail.COM
www.HMK2kurdblogger.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## كتاب التوحيد

وقول الله تعالى﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات

وقوله: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾النحل ٣٦

---

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

( **كتاب التوحيد** ) ئەمە كتابی تەوحیدە .

شێخ عبد الرحمن السعدی دەڵێت :﴿ئەم ناونیشانە مەبەستی دانەر دەر دەخات لە نوسینی ئەم کتێبەدا ...واتە ئەم کتێبە باسی یەکتاپەرستی دەکات ، باسی حوکمەکانی دەکات لە گەڵ سنورەکانی ، مەرجەکانی، چاکەکانی، بەڵگەکانی، پێویستیەکانی. تەوحید (واتە یەکتاپەرستی) بە چی زیاد دەکات و بە هێز دەبێت یان بە چی لاواز دەبێت ، بە چی تەواو دەبێت و کامڵ دەبێت ﴾

دانەر بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە تەوحید واجبە پێنج ئایەتی هێناوە

یەکەم :﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾

واتە : خودا دەفەرموێت :(جنۆکەو ئینسانم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە تەنها من بپەرستن)

دووەم :﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾

واتە :( وەڵلاهی بە تەئکید لە هەموو ئومەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردوە کە پێیان بڵێن خودا بپەرستن، وە دوور بکەونەوە لە گشت تاغوتیٚ )

وقوله : ﴿ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ ﴾ الآية

وقوله : ﴿ ۞ وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا ﴾النساء: ٣٦

وقوله : ﴿ ۞ قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ ﴾الأنعام

---

سێیەم :﴿ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾ الإسراء

واتە : (وە پەروەردگارت فەرمانی داوە کە تەنهاخۆی بپەرستن، وە فەرمانی داوە کە لەگەڵ دایك و باوکدا چاکە بنوێنی (هەر چی جۆرە چاکەیەك کە لە توانادا بێت)، ئەمما کاتێك یەکیان یا هەردوکیان لای تۆ دەکەونە تەمەنەوە، قسەی نابەجیٚ مەدەن بە گوێیاندا، هەتا نەکەن بشڵێن ئۆف، کاروکردەوەی نا بەجێش بەرانبەریان مەنوێنن، قصەیەکی وایان لەگەڵدا بکەن کە نەرم و جوان بێت و بە ئەدەب و وەقارەوە بێت، باڵی زەلیلی لە ڕووی ڕەحمەت و میهرەبانیەوە بۆ هەردووکیان ڕابخەو بڵیٚ: پەروەردگارم، ڕەحمیان پیٚ بکە لە کاتی پیری و وەفات کردنیاندا هەروەك ئەوان منیان لە بچوکیمدا پەروەردە کرد).

چوارەم :﴿ ۞ وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا ﴾النساء: ٣٦

واتە: {تەنها خودا بپەرستن لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێك مەکەن بە شەریکی ئەو ، لە پەرستنەکاندا}

پێنجەم : ئایەتی دە وەصیەتەکان:﴿ ۞ قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ

وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ
ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۖ وَأَوۡفُواْ
ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ وَإِذَا قُلۡتُمۡ فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰۖ
وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ
وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ﴾ ئەنعام

**واتە :﴿ئەی پیغەمبەر، بەو موشریکانە بڵێ : وەرن با بۆتان باس بکەم کە خودا چی حەرام کردوە لە سەرتان،**

**1. حەرامی کردووە و نابێت شەریکی بۆ دابنێن نە زۆر و نە کەم .**

**2. وە بەرامبەر دایك و باوك گوتە و گوفتار و کردەوەی چاکە بنوێنن هەرچەند دەتوانن،**

**3. وە منداڵەکانتان لە ترسی هەژاری و نەبونی مەکوژن ئێمە رزقی ئێوە وئەوانیش دەدەین.**

**4. وە نزیکی گوناه و کردەوەی خراپە مەکەونەوە چ ئاشکرا بێت چ نهێنی .**

**5. ئەو نەفسانەش مەکوژن کە خودا حەرامی کردووە، مەگەر بەحەقی خۆی.**

□□□□

**ئەمەی کە باس کرا خودا ئامۆژگاری ئێوەی پێ دەکات بۆ ئەوەیە عەقڵتان بخەنە کار وکاری پێبکەن**

**6. نزیکی ماڵی منالی بێ باوك مەکەونەوە، مەگەر بەو جۆرەی کە زیاتر لە بەرژەوەندی هەتیوەکە بێت ، هەتا ئەو کاتەی بالغ دەبێت ولە مەصلەحەتی خۆی تێدەگات**

**7. وە پێوانەو کێشانەش بە دادپەروەرانە بەڕێوە بەرن .هیچ شتێ داوا ناکرێ لە هیچ کەس ، تەنها ئەوە نەبێت کە لە توانایدا هەیە.**

**8. وە ئەگەر لە بەینی خەڵکیدا قصەتان کرد. ئەوا دادپەروەرانە قصە بکەن**

**9. وە بەعەهد و پەیمانێك کە بەناوی خوداوە دەیدەن وەفاتان هەبێت .**

**ئەوانەی کە باس کران خودا ئەمری کردووە پێتان بۆ ئەوەیە کە پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرن .**

10. با بۆشتان باس بکەم کە بە تەئکید ئەمە شاڕێگای منە و ڕاست و ڕەوانە و شوێنی بکەون . شوێن ئەو ڕێچکانە مەکەون کە پێچەوانەی ئەم ڕێبازەیە چونکە گومڕاتان دەکەن . ئەمە ئامۆژگاری خودایە بۆ ئێوە . ئەگەر واتان کرد، ئەوا دەچنە ڕیزی لە خودا ترسان و عەبدە سەر فرازە کانەوە ﴾

1- قال ابن مسعود رضي الله عنه : من أراد أن ينظر إلى وصية محمد ﷺ التي عليها خاتمة فليقرأ قوله تعالى: (قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ) – إلى قوله – (وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا..).

2- وعن مُعَاذٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى حِمَارٍ فَقَالَ يَا مُعَاذُ هَلْ تَدْرِي حَقَّ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ وَمَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ ؟ قُلْتُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ حَقّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَحَقّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ أَنْ لَا يُعَذِّبَ مَنْ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا أُبَشِّرُ بِهِ النَّاسَ قَالَ لَا تُبَشِّرْهُمْ فَيَتَّكِلُوا" أخرجاه في الصحيحين

---

1 . [1]عبدالله ی کوڕی مەسعود رضي الله عنه دەڵێت :(هەر کەس دەیەوێت سەیری ئەو وەصیەتەی محمد ﷺ بکات، کە مۆری ئەوی پێوە بێت بائەو ئایەتە بخوێنێتەوە کە خودا دەفەرموێت : ﴿ قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ هەتا وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا ﴾ الأنعام: ١٥٣

2. [2]موعازی کوڕی جەبەل رضي الله عنه دەڵێت : لە گەڵ پێغەمبەری خودا دا سواری پشتی کەرێ بوو بووین منیش لە دوای ئەوەوە بووم، فەرموی ئەی موعاز ئایا دەزانیت کە حەقی خودا لە سەر گشت بەندەکانی چییە ؟

وە حەقی بەندەکان چییە لە سەر خودا ؟ گوتم :خوداو پێغەمبەرەکەی دەزانن .

---

[1] حسن . أخرجه الترمذي ( 3072) وابن المنذر و ابن ابی حاتم في الدر المنثور والطبراني في الكبير10060 والأوسط (1208)

2 البخاري (2856) ومسلم (30 )

فەرموی : حەقی خودا لە سەربەندەکان ئەوەیە کە عیبادەتی بۆ بکەن وهیچ شەریکی بۆ دانەنێن . حەقی بەندەکانیش لە سەر خودا، ئەوەیە سزای کەسێك نادات کە هیچ شەریکی بۆ دانەنابێت .

گوتم : ئەی پێغەمبەری خودا ، ئایا مژدە بدەم بەو خەڵکە یان بێدەنگ بم ؟

فەرموی : نەکەی مژدەیان پیٚ نەدەی ، ئەگەرنا پاڵی لێدەدەنەوە و لە کردەوەی چاکە سارد دەبنەوە ).

فيه مسائل: الأولى: الحكمة في خلق الجن والإنس.

الثانية: أن العبادة هي التوحيد؛ لأن الخصومة فيه.

الثالثة: أن من لم يأت به لم يعبد الله، ففيه معنى قوله؟ ولا أنتم عابدون ما أعبد)

الرابعة: الحكمة في إرسال الرسل. الخامسة: أن الرسالة عمَّت كل أمة.

السادسة: أن دين الأنبياء واحد. السابعة: المسألة الكبيرة أن عبادة الله لا تحصل إلا بالكفر بالطاغوت؛ ففيه معنى قوله: ( فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله... )

الثامنة: أن الطاغوت عام في كل ما عُبِد من دون الله.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1-حیکمەت لە دروستکردنی جن وئینساندا. تەنها عیبادەتە

2- ئەوعیبادەتەش کە داوا کراوە تەوحیدە . چونکە ناکۆکی پێغەمبەرەکان لە گەڵ گەلەکانیان تەنها لەسەر ئەوە بووە.

3- هەر کەس تەوحید لەخۆیدا بەدی نەهێنێت ئەوە خودای نەپەرستووە، ئەمەش واتای ئەو ئایەتە دەگەیەنێت کە دەفەرمویٚ

:وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴿٣﴾ واتە ئەی کافرەکان ، ئێوەش ئەو جۆرە خوداپەرستییە ناکەن کە من دەیکەم . ( چونکە خودا پەرستیەکەی ئێوە تێکەڵاوی شیرکە ، ئەوەی من تەوحیدە)

4- حیکمەت  لە ناردنی پێغەمبەراندا، تەوحیدە.
واتە :( پەرستنی خوداو دوورکەوتنەوە لە هەموو تاغوتیٚ)
5- پەیامی خودا بۆ هەموو ئوممەتەکان هاتووە کە تەوحیدە .
6- دینی پێغەمبەران یەك دینە. کە تەوحیدە .
7- ئەو مەسئەلە گەورەیە کە پەرستنی خودا نایەتە دی، ئیلا بەوە نەبێت کە کوفر بە تاغوتە . لەو بارەیەوە ئەو وتەی خودا هەیە کە دەفەرمویٚ :﴿ هەر کەس کوفر بکات

التاسعة: عظم شأن ثلاث الآيات المحكمات في سورة الأنعام عند السلف. وفيها عشر مسائل، أولها النهي عن الشرك.

العاشرة: الآيات المحكمات في سورة الإسراء، وفيها ثماني عشرة مسألة، بدأها الله بقوله:
(لا تجعل مع الله إلهاً ءاخر فتقعد مذموماً مخذولاً) ؛ وختمها بقوله:
(ولا تجعل مع الله إلهاً آخر فتلقى في جهنم ملوماً مدحوراً)، ونبهنا الله سبحانه على عظم شأن هذه المسائل بقوله: (ذلك مما أوحى إليك ربك من الحكمة)

الحادية عشرة: آية سورة النساء التي تسمى آية الحقوق العشرة، بدأها الله تعالى بقوله:
(واعبدوا الله ولا تشركوا به شيئاً).

الثانية عشرة:التنبيه على وصية رسول الله ﷺ عند موته.الثالثة عشرة: معرفة حق الله تعالى علينا.

---

بەرامبەر بە هەرچی تاغوتە وئیمان بهێنیٚ بە خودا ئەوە دەستی گرتووە بە گرێیەکەوە کە درزی تیٚ ناکەوێت کە ئەویش (لاإله إلاالله) یە﴾

8- تاغوت لەو ئایەتەدا واتایەکی گشتی هەیە، هەموو پەرستراوێك دەگرێتەوە جگە لە ألله

9- گەورەیی ئەو سیٚ ئایەتانەی سوڕەتی ئەنعام کە مەعناکانیان ڕوون و ئاشکرایە لای سەلەف، کە دە مەسەلە یان تێدا باسکراوە، یەکەمیان قەدەغە کردنی شیرکە .

10- ئەو ئایەتانەی سوڕەتی ئیسرا کە مەحکەمن واتە : واتایان ڕوون و ئاشکرایە ، هەژدە مەسەلەیان تێدایە کە خودا بەوە دەستی پیٚ کردووە

﴿لەگەڵ خودادا پەرستراوێکی دیکە دامەنێ﴾ بەوەش کۆتای هێناوە :﴿ لەگەڵ خودادا پەرستراوێکی دیکە دامەنێ﴾ خوداش لە گەورەیەتی ئەم مەسەلانە ئاگادارمان دەکاتەوە، بەوەی کە فەرمووی :﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ ﴾

11- ئایەتەکەی سورەتی نیساء کە ناودەبرێت بە ئایەتی دە مافەکان، خودای بڵند بەوە دەستی پێکردوە کە دەفەرموێ : :( خودا بپەرستن و لە گەڵ ئەوەشدا شەریکی بۆ دامەنێن)

الرابعة عشرة: معرفة حق العباد عليه إذا أدوا حقه.

الخامسة عشرة: أن هذه المسألة لا يعرفها أكثر الصحابة.

السادسة عشرة: جواز كتمان العلم للمصلحة.

السابعة عشرة: استحباب بشارة المسلم بما يسره.

الثامنة عشرة: الخوف من الاتكال على سَعَةِ رحمة الله.

التاسعة عشرة: قول المسؤول عما لا يعلم: الله ورسوله أعلم.

العشرون: جواز تخصيص بعض الناس بالعلم دون بعض.

الحادية والعشرون: تواضعه ﷺ لركوب الحمار مع الإرداف عليه.

الثانية والعشرون: جواز الإرداف على الدابة.

الثالثة والعشرون: فضيلة معاذ بن جبل. الرابعة والعشرون: عظم شأن هذه المسألة.

---

12- ئاگادار بوون لە وەصیەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی سەرەمەرگیدا . کە یەکەم وەصیەتی تەوحید بووە.

13- ناسیی مافی خودا لەسەر بەندەکانی .

14- ناسینی مافی عەبدەکان لەسەر خودا ، ئەگەر مافی خودایان هێنایەدی

15- ئەم مەسەلەیە زۆرێ لە ئەصحابەکان نەیان زانیوە .

16- شاردنەوەی (هەندێك عیلم لە هەندێك کەس ) لە بەر بەرژەوەندی. (واتە عیلمی زیاد لە پێویست)

17- سونەتە مژدە بدرێت بە مسوڵمان لە بارەی شتێكەوە كە دڵی پێی خۆش دەبێت.

18- ترسان لە وەی پاڵ بدرێت بە ڕەحمە تی خوداوە كە لە فراواندا سنوری نییە.

19- هەركەسێك سوئالی لێكرابێت لە بارەی هەر شتێكەوە كە نەیزانی بێت لە جوابدا گوتویەتی : خودا و پێغەمبەرەكەی دەزانن .

20- دروستە، عیلمێك فێری هەندێك كەس بكرێت، بە تایبەت، و لەهەندێكیان بشاردرێتەوە، واتە :(عیلمی زیاد لە پێویست )

21- تەوازع و بێ تەكەبوری پێغەمبەر ﷺ بەوەی كە سواری كەر بووە، كەسێكی دیكەشی لەگەڵدا سوار بوو بوو.

22- دروستە دوو كەس سوار پشتی ولاخێك بن .

(ئەگەر ولاخەكە توانای هەبوو)

23- پلە وپایەی بەرزی موعازی كوڕی جەبەل رضي الله عنه

24- گەورەیی ئەم مەسئەلەیە كە تەوحیدە. (چونكە مافی خودایە )

***ڕوونكردنەوە*** :

پێناسەی عیبادەت :

[الْعِبَادَةُ " اسْمٌ جَامِعٌ لِكُلِّ مَا يُحِبُّهُ اللَّهُ وَيَرْضَاهُ : مِنْ الْأَقْوَالِ وَالْأَعْمَالِ الْبَاطِنَةِ وَالظَّاهِرَةِ ﴾

واتە : هەر كارێك خودا پێی خۆش بێت و لێی ڕازی بێت ئەوە عیبادەتە چ گوتە بێت یا كردەوە بێت ، چ لە لە دڵدا بێت یا بە ئاشكرا بێت .

پێناسەی تاغوت [ قال الجوهري: الطاغوت الشيطان وكل رأس في الضلالة﴾

تاج اللغة وصحاح العربية"

واتە: تاغوت شەیتانە جا ئینسان بێت یا جنۆكە وە هەموو سەركردەیەك دەگرێتەوە لە گومڕاییدا

## 1 باب فضل التوحيد وما يكفر من الذنوب

وقول الله تعالى:﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢ ﴾ الأنعام

**3–عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ:**

**[ مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ وَالْجَنَّةُ حَقٌّ وَالنَّارُ حَقٌّ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنْ الْعَمَلِ ]**. أخرجاه.

---

## بابی1 باسی تەوحید کە چ فەزڵێکی هەیە و ڕوونکردنەوەی ئەوەش کە گوناهەکان هەڵدەوەرێنێت

**خودای بڵند فەرمویەتی :**

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢ ﴾

**واتە :(ئەوانەی ئیمانیان هێناوە ( بە دڵ و بە کردەوە ) و ئیمانەکەیان تێکەڵی زوڵم نەکردووە ( واتە تێکەڵی شیرکیان نەکردووە ) ، تەنها ئەوانە بەردەوام، لە هێمنایەتیدان لە دنیا وئاخیرەتدا، تەنها ئەوانەش هیدایەت دراون . کەواتە غەیری ئەوان گومڕان )**

3–[3]عوبادە کوڕی صامت ﷺ گوتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموی:( هەر کەسێك شاهیدی بدات کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نیە جگە ألله، بە تەنهایە و هیچ شەریکی نیە ، شاهیدیش بدات کە محمد بەندە و ڕەوانە کراوی خودا یە، عیسای کوڕی مەریەمیش بەندە و ڕەوانەکراوی خودایە و کەلیمەی خودایە (واتە بە کەلیمەی خودا دروست بوە ) و ڕۆحێکە لە لایەن ئەمری خوداوە ( واتە حاشا بکات لە عەقیدە وفکری نەصرانی و یەهودەکان ) شاهیدیش بدات کە بەهەشت

4– ولهما في حديث عتبان: (فإن الله حرم على النار من قال: لا إله إلا الله يبتغي بذلك وجه الله).

5– وعن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه عن رسول الله قال:[ قَالَ مُوسَى: يَا رَبِّ عَلِّمْنِي شَيْئًا أَذْكُرُكَ بِهِ ، أَوْ أَدْعُوكَ بِهِ ، قَالَ : يَا مُوسَى ، قُلْ : لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ ، قَالَ : يَا رَبِّ ، كُلُّ عِبَادِكَ يَقُولُون هَذَا ، قَالَ : يَا مُوسَى لَوْ أَنَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعَ وَعَامِرَهُنَّ غَيْرِي ، وَالأَرَضِينَ السَّبْعَ وُضِعْنَ فِي كِفَّةٍ ، وَلا إِلَهَ إِلا اللَّهُ فِي كِفَّةٍ ، لَمَالَتْ بِهِنَّ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ "
[رواه ابن حبان، والحاكم وصححه].

---

حەقە و جەهەنەمیش حەقە، ئەوا خودا ئەوکەسە دەخاتە بەهەشتەوە با کردەوەی هەرچی بێت)

4– [4]هەر ئەوان لە عیتبانەوە ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی ﴿ بەڕاستی خودا قەدەغەی کردووە لەسەر ئاگر، کەسێك بسوتێنێ کە لەبەر گەیشتن بەڕوخساری خودا وتویەتی( لاإله إلا الله)﴾ تەواو.

واتە : (بەدڵ و زمان و کردەوە وتویەتی).

5– [5]ئەبوسەعیدی خودریﷺ دەڵێت : پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی:

---

[3] البخاري (3435) ومسلم (28)

4 البخاري (425) ومسلم (33)

5 يشبه حسن، أخرجه ابن حبان . والحاكم والنسائي في عمل اليوم والليلة والبيهقي في الأسماء والصفات

(موسا وتی: ئەی پەروەردگارم  فێری شتێکم بکە  کە بیکەم بە وەسیلەیەك زیکری تۆی پێبکەم و دوعای تۆی پێوە بکەم، واتە دەمەوێت زیکرێکم فێر بکەیت کە تایەت بێت بە خۆم خـوداش فەرمووی: ئەی موسا بڵێ :(لاإله إلاالله).

موسا گوتی: ئەی پەروەردگارم ، هەموو عەبدە موسڵمانەکانت  ئەمە دەڵێن.

6-  وللترمذي وحسنه عن أنس قال سمعت رسول الله يقول :(قال الله تعالى: يا ابن آدم؛ لو أتيتني بقراب الأرض خطايا، ثم لقيتني لا تشرك بي شيئاً لأتيتك بقرابها مغفرة).

فيه مسائل:    الأولى: سَعَة فضل الله.

الثانية: كثرة ثواب التوحيد عند الله.    الثالثة: تكفيره مع ذلك للذنوب.

الرابعة: تفسير الآية (82) التي في سورة الأنعام.

الخامسة: تأمل الخمس اللواتي في حديث عبادة.

---

خوداش فەرمووی : (ئەی موسا ئەگەر هەر حەوت ئاسمانەکان و هەموو ئەوانەی کە ئاسمانەکانیان ئاوەدان کردۆتەوە(بەعیبادەت ) جگە لە خۆم، لە گەڵ  حەفت زەمینەکەدا لە تایەکی تەرازودا دابنرێت . وە تەنها (لاإله إلاالله ) لە تایەکی دیکەدا دابنرێت، ئەوا (لاإله إلا الله) لە هەموو ئەوانە قورستر دەردەچێت.

6- ئەنەس ﵁گوتی: گوێبیستی پێغەمبەری خودا بوم ﷺ کە دەیفەرموو (خودای بەرزو بڵند فەرمویەتی: ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر پڕ بە زەمین گوناهت ببێت و پاشان

---

6 حسن . أخرجه الطبراني في الكبير (12346) والصغير (820)، والأوسط، والدارمي، وأحمد، وابن ماجة

بگەڕێیتەوە بۆلام ( بە مردن ) لە حاڵێكدا هیچ شەریكت دانەنابێت بۆم چ زۆر و چ كەم ، منیش پڕ بە زەمین لێخۆشبونت پێ دەبەخشم )

## مەسەلەكانی ئەم باسە

1- فراوانی فەزڵی خودا .

2- گەورەیی پاداشتی تەوحید لای خودا . كە لە پێنج خاڵدا ڕوون دەبێتەوە : یەكەمیان : هێمنایەتیە بەپێی ئایەتەكە. دووەمیان : چونە بەهەشتە بەپێی حەدیسی یەكەم سێیەمیان : پارێزاوی لە ئاگری جەهەننەم بەپێی حەدیسی دووەم . چوارەمیان : تەوحید لە ئاسمانەكان و زەوی قورسترە بەپێی حەدیسەكەی موسا. پێنجەم : ئینسانی یەكخوداپەرست خودا لە هەموو گوناهەكانی خۆش دەبێت مادام شیركی گەورەو بچوكی تێدا نەبێت بە پێی حەدیسەكەی ئەخیر.

السادسة: أنك إذا جمعت بينه وبين حديث عتبان وما بعده تبين لك معنى قول:

(لا إله إلا الله) وتبين لك خطأ المغرورين.

السابعة: التنبيه للشرط الذي في حديث عتبان.

الثامنة: كون الأنبياء يحتاجون للتنبيه على فضل لا إله إلا الله.

التاسعة: التنبيه لرجحانها بجميع المخلوقات، مع أن كثيراً ممن يقولها يخف ميزانه.

العاشرة: النص على أن الأرضين سبع كالسموات. الحادية عشرة: أن لهن عماراً.

---

3- لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بە كەفارەت و گشت گوناهەكان هەڵدەوەرێنێت .

4- تەفسیری ئایەتی 82 ی سورەتی ئەنعام .

5- سەرنجی ئەو پێنج شتە بدە لە حەدیسەكەی عوبادە دا . .

( واتە بەبێ ئەوانە شایەتومان قبوڵ نیە )

6- ئەگەر ئەو حەدیسەی عوبادە، وحەدیسەكەی عیتبان و حەدیسەكانی دواتریش بدەینەوە لە یەك، ئەوكاتە مەعنای گوتنی (لا إله إلا الله)ت بۆدەر دەكەوێت، هەڵەی ئەو كەسانەشت بۆ دەردە كەوێت كە گومڕا بوون

( واتە: ئەوانەی کە دەڵێن تەنها گوتنی(لا إله إلا الله) سەر زارەکی بەسە)

7- ئاگاداربون لەوشەرتەی کە لە حەدیسەکەی (عیتبان) دا هاتووە .

(کە شەرتی یەکتاپەرستی و ڕاستگۆییە)

8- پێغەمبەران پێویستیان بەوە هەیە کە لە فەزڵی (لا إله إلا الله ) ئاگادار بکرێتەوە .

9- ئاگاداربوون لەوەی کە ئەو کەلیمەیە، لە هەموو مەخلوقات و دروست کراوەکان قورسترە، لەگەڵ ئەوەشدا، زۆرێك لەوانەی کە ئەو کەلیمەیە دەڵێنەوە تای تەرازوەکەیان (لا إله إلا الله ) شی تێدایە هەرسوکە .

(چونکە شەرتەکانی لە خۆیدا بەدی نەهێناوە ).

10- دەقی حەدیسەکە باس لەوە دەکات کە زەمینەکان حەفتن وەك ئاسمانەکان.

11- ئاسمانەکان و زەمینەکان، ئاوەدانن

الثانية عشرة: إثبات الصفات، خلافاً للأشعرية.الثالثة عشرة: أنك إذا عرفت حديث أنس، عرفت أن قوله في حديث عتبان: (فإن الله حرم على النار من قال لا إله إلا الله، يبتغي بذلك وجه الله) أنه ترك الشرك، ليس قولها باللسان.

الرابعة عشرة: تأمل الجمع بين كون عيسى ومحمد عبدي الله ورسوليه.

الخامسة عشرة: معرفة اختصاص عيسى بكونه كلمة الله.

السادسة عشرة: معرفة كونه روحاً منه.

السابعة عشرة: معرفة فضل الإيمان بالجنة والنار. الثامنة عشرة: معرفة قوله: (على ما كان من العمل).

التاسعة عشرة: معرفة أن الميزان له كفتان. العشرون: معرفة ذكر الوجه.

---

12- ئیسپات کردنی صیفاتەکانی خودا (واجبە )، ئەمەش بە پێچەوانەی (عەقیدەی ) ئەشعەریەکانە.

13- ئەگەر حەدیسەکەی ئەنەست زانی، ئەو کاتە تێدەگەیت کە مانای فەرمودەکە لە حەدیسەکەی عوتباندا (خودا ئەو کەسەی لە ئاگر قەدەغە کردوە کە دەڵێت (لا إله إلا الله ) لەبەر گەیشتن بە ڕوخساری خودا )

مەبەستی دوور کەوتنەوەیە لە شیرك، نەك تەنها گوتنی سەر زارەکی.

14- سەرنج لەوە بدە كە محمد و عیسا بە یەكەوە، ناویان بەوە هاتوە كە بەندە و پێغەمبەری خودان .

15 – زانینی ئەوەی كە عیسا تایبەتمەندی ئەوەی هەیە كە، وتەی خودایە .

16- زانینی ئەوەی كە عیسا ڕۆحێكە لەلایەن خوداوە . (دروست كراوە )

17- زانینی فەزڵ و چاكەی ئیمان هێنان ، بە بەهەشت وجەهەنەم .

18- تێگەیشتن و زانینی واتای ئەوحەدیسە كە فەرمووی (باهەر چییەكی كردبێت ) واتە: جگە لە شیرك.

19- زانینی ئەوەی كە میزان و تەرازوی حسابی قیامەت، دووتای هەیە .

20- تێگەیشتن لە باسكردنی ڕوخساری خودا .

(واتە : سەلماندنی صیفەتی ڕوخساری خودای گەورە )

## 2- باب من حقق التوحيد دخل الجنة بغير حساب

وقول الله تعالى: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾ النحل

وقال: (وَالَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ). [ المؤمنون : 59 ]

7- عن حُصَيْن بْن عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ كُنْتُ عِنْدَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فَقَالَ أَيُّكُمْ رَأَى الْكَوْكَبَ الَّذِي انْقَضَّ الْبَارِحَةَ ؟ قُلْتُ أَنَا ثُمَّ قُلْتُ أَمَا إِنِّي لَمْ أَكُنْ فِي صَلَاةٍ وَلَكِنِّي لُدِغْتُ قَالَ فَمَاذَا صَنَعْتَ قُلْتُ اسْتَرْقَيْتُ قَالَ فَمَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ قُلْتُ حَدِيثٌ حَدَّثَنَاهُ الشَّعْبِيُّ فَقَالَ وَمَا حَدَّثَكُمْ قُلْتُ حَدَّثَنَا عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ حُصَيْبٍ أَنَّهُ قَالَ لَا رُقْيَةَ إِلَّا مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ فَقَالَ قَدْ أَحْسَنَ مَنْ انْتَهَى إِلَى مَا سَمِعَ وَلَكِنْ حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ أنه قَالَ:

---

## بابی 2 هەركەسێ تەوحید بە پوختەیی بەدی بهێنێت لە خۆیدا ئەوا بەبێ حساب و عەزاب دەڕواتە بەهەشتەوە

خودا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾ النحل

واتە :(بەڕاستی ئیبڕاهیم چوار صیفەتی هەبووە
یەكەم : پێشەواو پێشەنگی خەیر بووە،
دووەم : بەردەوام لە تاعەتدا بووە تەنها بۆ خودا .
سێیەم : ڕوو لە خودا، و پشتی لە هەمووشتێك بووە جگە لە خودا
چوارەم : بە تەواوی بەریی بووە و دوور بووە لە تەواوی موشریكان، لە بەینی خۆی و موشریكاندا بە دڵ و بە زان و بە كردەوە هیچ دۆستایەكی نەهێڵابوو )

﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ {المؤمنون }

واتە :(وە ئەوانەش كە لەگەڵ خوداپەرستیەكەیاندا هەرگیز شەریك بۆخودا دانانێن ).

7–[7]حصین كوڕی عبدالرحمن ﷺ گوتی : لای سعیدی كوڕی جوبەیر بووم گوتی: كامتان شەوی ڕابردوو ئەو ئەستێرەیەی بینی كە كشا ؟

8– عُرِضَتْ عَلَيَّ الْأُمَمُ فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ وَمَعَهُ الرُّهَيْطُ وَالنَّبِيَّ وَمَعَهُ الرَّجُلُ وَالرَّجُلَانِ وَالنَّبِيَّ لَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ إِذْ رُفِعَ لِي سَوَادٌ عَظِيمٌ فَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ أُمَّتِي فَقِيلَ لِي هَذَا مُوسَى وَقَوْمُهُ فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ عَظِيمٌ فَقِيلَ لِي هَذِهِ أُمَّتُكَ وَمَعَهُمْ سَبْعُونَ أَلْفًا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ وَلَا عَذَابٍ ثُمَّ نَهَضَ فَدَخَلَ مَنْزِلَهُ فَخَاضَ النَّاسُ فِي أُولَئِكَ ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ فَلَعَلَّهُمْ الَّذِينَ صَحِبُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ بَعْضُهُمْ فَلَعَلَّهُمْ الَّذِينَ وُلِدُوا فِي الْإِسْلَامِ فلَمْ يُشْرِكُوا بِاللَّهِ شيئا ، وَذَكَرُوا أَشْيَاءَ

---

منیش گوتم : من ،پاشان گوتم : ئەڵبەتە من لە نوێژدا نەبووم،( واتە ئەو گومانە باشەم پێ نەبەن ). بەڵكو دووپشك پێوەمی دابوو . سەعید گوتی: جاچیت كرد ؟
گوتم : بەدوای یەكێكدا دەگەڕام كە دوعام بە سەردا بخوێنێت .
گوتی: جاچی بەڵگەیەك هانی دایت ئەوكارە بكەیت؟
گوتم : فەرمودەیەك كە شەعبی بۆمانی گێڕاوەتەوە.
گوتی : چی بۆتان گێڕایەوە ؟

---

7 أخرجه أحمد والترمذي (2057) وأبو داود (3884)

گوتم : شەعبی بۆمانی گێڕایەوە کە بوڕەیدە کوڕی حوصەیب وتی: دوعا بەسەردا خوێندن نیە ، مەگەر بۆ کەسێك کە چاولێی دابێت. یا بۆ کەسێك کە پێوەدراو بێت.

(واتە دۆعا بە سەردا خوێندن کاریگەری وشیفایەکی بە قوەتە بۆ ئەو دوو نەخۆشیە بە بەراورد لەگەڵ نەخۆشیەکانی دیکەدا)

سەعید گوتی: هەرکەسێ کار بەو زانستە بکات کە پێی دەگات، کارێکی زۆر جوانی کردووە. (واتە : کارەکەت جائیزە بەڵام پلەیەك هەیە لەوە باشترە )

8[8]بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا( ابن عباس ) بۆمانی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی :﴿ئومەتەکانم نیشان دران، پێغەمبەرم دەبینی لە دە کەس کەمتری لە گەڵدابوو، پێغەمبەر هەبوو پیاوێك یا دوو پیاوی لە گەڵدا بوو پێغەمبەریش هەبوو هیچ کەسی لەگەڵدا نەبوو، هەروا مامەوە هەتا ڕەشاییەکی گەورەم نیشان درا . منیش وام زانی ئەوە ئومەتەکەی منن، لەوێدا پێم گوترا ئەوە موسا و قەومەکەیەتی، (واتە : ئەوانەی کە شوێن موسا کەوتون )پاشان سەیرم کرد ڕەشاییەکی گەورەم بینی فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرُوهُ فَقَالَ هُمْ الَّذِينَ لَا يَسْتَرْقُونَ وَلَا يكتوون ولا يَتَطَيَّرُونَ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ فَقَالَ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ فَقَالَ أَنْتَ مِنْهُمْ ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ فَقَالَ سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ )

---

،ئەو سا پێم گوترا ئەمانە ئومەتی تۆن . جگە لەمانەش لەگەڵیاندا حەفتاهەزاری دیکە بەبێ حساب ولێپرسینەوە وعەزاب دەچنە بە هەشتەوە﴾

پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ لە مەجلیسەکە هەستاو چوە ماڵەکەی خۆی .

ئنجا خەڵکانی ئامادە بوو، لە بارەی ئەوحەفتا هەزارەوە کەوتنە گفتوگۆ :( دەبێ کێ بن وبە چ کردەوەیەك بگەنە ئەو پلەیە)، هەندێکیان گوتیان : لەوانەیە ئەو کەسانە بن کە هاوڕێیەتی پێغەمبەریان کردووە، هەندێکیشان گوتیان لەوانەیە ئەوانە

---

[8] البخاري (5705) ومسلم (220)

بن كە بە ئیسلامەتی لەدایك بون، هیچ شەریكیان بۆ خودا دانەناوە، هەندێك شتی دیكەشیان باس كرد.

پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتەوە ناویان وخەبەری ئەو گفتو گۆو باسەیان پێدا . ئەویش فەرموی :ئەو حەفتا هەزارە ئەوانەن  كە داوا لە كەس ناكەن دوعایان بەسەردا بخوێنی، داوا لە خەڵكیش  ناكەن داخكردنیان بۆ بكەن بۆ شیفای نەخۆشی، خۆشیان نایكەن. و شومی ڕەشبینی ناكەن نە بە باڵندە و نە بە شتی دیكەشەوە، تەنها پشت بە خودا دەبەستن و تەوەكولیان لەسەر ئەوە  ئنجا عوكاشە هەستایەوە وگوتی:ئەی پێغەمبەر دۆعام بۆ بكە كە من یەكێ بم لەوانە.

فەرموی: تۆ یەكێكی لەوان .

پاشان پیاوێكی دیكە هەستایەوە و گوتی

دۆعام بۆ بكە كە خودا بمكات بە یەكێ لەوانە.

ئەویش فەرموی : عوكاشە پێشت كەوت

فیه مسائل:                    الأولى: معرفة مراتب الناس في التوحيد.

الثانية: ما معنى تحقيقه.            الثالثة: ثناؤه سبحانه على إبراهيم بكونه لم يكن من المشركين.

الرابعة: ثناؤه على سادات الأولياء بسلامتهم من الشرك.

الخامسة: كون ترك الرقية والكي من تحقيق التوحيد.

السادسة: كون الجامع لتلك الخصال هو التوكل.

السابعة: عمق علم الصحابة لمعرفتهم أنهم لم ينالوا ذلك إلا بعمل.

الثامنة: حرصهم على الخير.      التاسعة: فضيلة هذه الأمة بالكمية والكيفية.

---

### مەسەلەكانی ئەم باسە

1- زانینی مەرتەبەكانی خەلكی لە تەوحیدا.

( کە سێ مەرتەبەن یەکەمیان: ئەصڵە ئەوانەی شەریکین بۆ خودا دانەناوە.
دووەمیان: واجبە کە بەرائەتەکەی ئیبڕاهیمە. سێیەمیان : بەدی هێنانی تەوحیدە بە پوختەیی کە کاروکردەوەی حەفتا هەزارەکەیە)

2- مەعنای بەدی هێنانی تەوحید بە تەواوی چیە ؟. (دوور کەوتنەوەیە لە شیرك وبیدعە و بەردوام نەبون لەسەر مەعصیەت)

3- ستایش کردنی ئیبراهیم لە لایەن خوداوە بەوەی کە بەری بووە و دوور بووە لە گشت موشریکان .

4- ستایش کردنی ئەولیاکان کە گەورەی هەموو خەڵقین ، لەلایەن خوداوە بەوەی کە سەلامەتن و دوورن لە شیرك.

5- وازهێنان لە داوا کردنی ڕوقیە واتە دوعا بە سەردا خوێندن لە خەڵکی، و داخکردن بەشێکە لە بەدی هێنانی تەوحید بە پوختی .

6- هەموو صیفەتەکانی بەدی هێنانی تەوحید، لە یەك کەلیمەدا جێی دەبێتەوە کە ئەویش : تەوەکول و پشت بەستنە بە خودا .

7- قوڵی زانست وعیلمی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەوەدا دەردەکەوێت کە زانیویانە کە ئەو پلەوپایە بەرزە ، بە بێ کردەوە نایەتە دی .

العاشرة: فضيلة أصحاب موسى. الحادية عشرة: عرض الأمم عليه، عليه الصلاة والسلام.
الثانية عشرة: أن كل أمة تحشر وحدها مع نبيها. الثالثة عشرة: قلة من استجاب للأنبياء.
الرابعة عشرة: أن من لم يجبه أحد يأتي وحده.
الخامسة عشرة: ثمرة هذا العلم، وهو عدم الاغترار بالكثرة، وعدم الزهد في القلة.
السادسة عشرة: الرخصة في الرقية من العين والحمة.
السابعة عشرة: عمق علم السلف لقوله: قد أحسن من انتهى إلى ما سمع، ولكن كذا وكذا. فعلم أن الحديث الأول لا يخالف الثاني. الثامنة عشرة: بعد السلف عن مدح الإنسان بما ليس فيه.

---

8- سوربونی ئەصحاب ،لە سەر ئەوەی کە خێرو چاکە بە دەست بهێن .

9- پایە بەرزی وفەزڵی ئەم ئومەتە لە چەندایەتی وچۆنیەتیدا. واتە زۆرترین و باشترین ئوممەتن .

10- پایە بەرزی و فەزڵی هاوەڵانی موسا.

11- نیشاندان وخستنە پێش چاوی ئومەتەكان بە پێغەمبەر ﷺ

12- هەر ئومەتێك بەجیا لەگەڵ پێغەمبەرەكەیدا حەشر دەكرێت .

13- كەمی ئەوانەی كە شوێن پێغەمبەران دەكەون .

14 - ئەوەی كەس شوێنی نەكەوێت و جوابی نەداتەوە، خۆی بە تەنها ڕێدەبڕێت .

15- بەرهەمی ئەم عیلمە واتە ئەم حەدیسە ئەوەیە كە بە زۆرینە مەغرور نەبیت، وپشت نەكەین لە كەمینەی ئەهلی حەق .

16- ڕوخصەت دراوە بەوەی كە ڕوقیە بەكار بهێنن بۆ چارەی چاوپیسی و پێوە دراوی دوپشك و مار وهەر گیاندارێكی ژەهراوی دیكە.

17- قووڵی عیلمی سەلەف لەوەدا كە گوتی: (هەركەس چی بیستبێ كاری پێ بكات، ئەوە كارێكی جوانی كردووە بەڵام ئاواو ئاوا ) زانی كە حەدیسی یەكەم دژایەتی حەدیسی دووەم ناكات .

18- دووری سەلەف، لەمەدح كردنی ئنسان، بەشتێ كە تیایدا مەوجود نەبێ.

التاسعة عشرة: قوله: (أنت منهم) علم من أعلام النبوة.

العشرون: فضيلة عكاشة. الحادية والعشرون: استعمال المعاريض.

الثانية والعشرون: حسن خلقه ﷺ

---

19- وتەی پێغەمبەر ﷺ كە فەرموی :(تۆیە كێكیت لەوانە) یەكێكە لە نیشانەكانی پێغەمبەرایەتی. (چونكە عوكاشە بە شەهیدی وەفاتی كرد)

20- پلەوپایە و فەزڵی عوكاشە.

21- بەكارهێنانی مەعاریز یابڵێین قصەی ناڕاستەوخۆ

(بەوەی كە فەرمووی : عوكاشە كەوتە پێشت وە نەیفەرموو نەخێر تۆ یەكێك نیت لەوانە )

## 22- ئەخلاقی جوانی پێغەمبەر ﷺ

## 3- باب الخوف من الشرك

وقول الله عز وجل: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ ﴾

وقال الخليلُ عليه السلام: { وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ }

**9-** وفي حديث: (أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر)، فسئل عنه فقال: (الرياء)

---

## بابی 3 باسی ترسان له شیرك

مەبەستی دانەر لەم ناونیشانە ئەوەیە کە واجبە ئەهلی تەوحید لە شیرك بترسێت و خۆی لێ بپارێزێت . هۆکارەکانی و وەسائیلەکانی و نەوعەکانی بزانێت نەوەك تێی بکەوێت و بە خۆی نەزانێت .

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾(النساء 48 )

واتە : (خودا لەعەبدەکەی خۆش نابێت کە پێی بگات و موشریك بێت یا کافر بێت ، جگە لەو گوناهە لە هەموو گوناهێکی دیکە خۆش دەبێت ).

( ئەمە ئەگەر بمرێت وتۆبەی نەکرد بێت ).

﴿وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ٣٥﴾ (إبراهيم)

واتە (ئیبراهیم وتی: خودایە من و نەوەکانم لەوە دووربگرە کە بت بپەرستین یا غەیری تۆ بپەرستین )

9–[ئ] پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ئەوەی کە زۆری لێی دەترسم توشتان بێت و زیانتان پیٚ بگەیەنێت شیرکی بچوکە، سوئالی لێکرا شیرکی بچوك چیە ؟ فەرمووی: ڕیایە).

10– وعن ابن مسعود رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال:

(من مات وهو يدعو من دون الله نداً دخل النار) [رواه البخاري].

11– ولمسلم عن جابر رضي الله عنه، أن رسول الله ﷺ قال:

(من لقي الله لا يشرك به شيئاً دخل الجنة، ومن لقيه يشرك به شيئاً دخل النار).

فيه مسائل: الأولى: الخوف من الشرك. الثانية: أن الرياء من الشرك.

الثالثة: أنه من الشرك الأصغر. الرابعة: أنه أخوف ما يخاف منه على الصالحين.

---

9 أخرجه أحمد والطبراني في الكبير(4301) والبغوي في شرح السنة، قال الأرناؤوط إسناده قوي

الخامسة: قرب الجنة والنار. السادسة: الجمع بين قربهما في حديث واحد.

---

10- [10](ابن مسعود) ﵁ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی :(هەرکەسێك بمرێت و حاڵی وابێت جگە لە ألله هەرشتێکی دیکەی پەرستبێت، وکردبێتی بە هاوتای خودا، ئەوا دەچێتە ئاگرەوە ) .

11- [11]موسلیم لە جابرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی :﴿ هەرکەسێك بگات بە خودا و هیچ شەریکی بۆ دانەنابێت دەڕواتە بەهەشتەوە، وە هەرکەسێك پێی بگات و هەرشتێکی کردبێت بە شەریکی خودا ئەوا دەچێتە ئاگرەوە﴾

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- ترسان لە شیرك . واجبە شارەزابوون لە شیرك واجبە .

2- ڕیا بەشێکە لە شیرك .

3- ڕیا نەوعێکی شیرکی بچوکە .( ئەگەر کەم بوو)

4- ڕیا ، یان شیرکی بچوك ترسناکترین شتە کە زیان لە صالحان دەدات .

5- نزیکی بەهەشت و جەهەنەم ( لە هەموو کەسێکەوە ) .

السابعة: أنه من لقيه لا يشرك به شيئاً دخل الجنة. ومن لقيه يشرك به شيئاً دخل النار ولو كان من أعبد الناس. الثامنة: المسألة العظيمة: سؤال الخليل له ولبنيه وقاية عبادة الأصنام.

التاسعة: اعتباره بحال الأكثر، لقوله: ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ﴾

العاشرة: فيه تفسير (لا إله إلا الله) كما ذكره البخاري.

الحادية عشرة: فضيلة من سلِم من الشرك.

---

10 البخاري ( 4497 ) ومسلم( 92)

11 مسلم (93 )

6- لەیەك حەدیسدا باسی نزیکی هەردووکیان کراوە .

7- هەرکەسێك بگاتەوە بەخودا و ( کەم و زۆر ) شەریکی بۆخودا دانەنابێت ئەوا دەڕواتە بەهەشتەوە ، هەرکەسێ پێی بگات و هەرشتێکی کردبێت بەشەریکی ئەو، ئەوا دەڕواتە جەهەنەمەوە با لە هەمووخەڵکی زیاتریش خودا پەرستی کردبێت.

8- ئەم مەسئەلەیە زۆرمەزنە( کە سەری باسەکەیە، ئەوە بوو ئیبڕاهیم داوای لە خودا کرد، کە خۆی و نەوەکانی لە بتپەرستی بپارێزێت . کەواتە ئەگەر ئیبڕاهیم لە شیرك بترسێت کە ئیمامی ئەهلی تەوحیدە لەهەموو کەس زیاتر دوورە لە شیرکەوە، ئەوا دەبێت ئێمە چەندەها جار لەو زیاتر لە شیرك بترسین).

9- زۆرینەی خەڵکی بتپەرستی دەکەن، بەڵگەش ئەوەیە کە ئیبڕاهیم فەرموی :(خودایە ئەوانە زۆربەی خەڵکیان گومڕا کردووە )

10- تەفسیری (**لاإله إلاّالله**) هەروەك بوخاری باسی کردوە .

( لە کتابی تەفسیردا لە صەحیحەکەیدا)

11- فەزڵ و پایەی بەرزی هەرکەسێ کە سەلامەت و پارێزراو بێت لە شیرك .

***ڕوونکردنەوە***: عبد الرحمن بن قاسم دەڵێت : (**والشرك الأصغر حكمه أنه لا يُغفر لصاحبه إلا بالتوبة لعموم (إن الله لا يغفر أن يشرك به) ويدخل تحت الموازنة اهـ**) حاشية كتاب التوحيد

واتە: خودا لە شیرکی بچوك خۆش نابێت، مەگەر بە تەوبە، بەپێی ئەو ئایەتە، بەڵام دەکەوێتە ترازوی کردەوەکانیەوە.

## 4 باب الدعاء إلى شهادة أن لا إله الله

وقوله الله تعالى: ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِىۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ يوسف

12- عن ابن عباس رضي الله عنهما، أن رسول الله ﷺ ، لما بعث معاذاً إلى اليمن قال له: (إِنَّكَ تَأْتِى قَوْمًا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ فليكن أولُ ما تدعوهم إليه شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ . وفي رواية: إلى أن يوحدوا الله .. فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِى كُلِّ

يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ فِى فُقَرَائِهِمْ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ » أخرجاه

## بابی4

## باسی بانگەوازکردن بۆ شاهیدی ( لاإله إلاّالله ) کە واجبە

تەفسیری ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ ... یوسف : 108 ﴾

**واتە :( بڵێ ئەم بانگەوازی تەوحید و یەکتاپەرستیە ڕێگای منە، بانگەواز دەکەم تەنها بۆلای خودا لەم کارەشمدا هیچ شتێ ناکەم بە شەریکی خودا . لەسەر چاو ڕۆشنی وعیلم و یەقینم لەو کارەمدا، خۆشم و هەر کەسێکیش کە شوێنم کەوتووە، لەسەر چاو ڕۆشنی وعیلم ویەقینە وبڵێ : خودا پاك وبێگەردە لەوەی کە شەریکی هەبێت، ومنیش بەریم و دوورم لە تەواوی موشریکان)**

**12- [12]ابن عباس ﷛ دەڵێت :( کاتێك پێغەمبەری خودا مەعازی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو : تۆ دەڕۆیت بۆلای قەومێك کە خاوەنی کتابن (واتە :تەوڕات و ئنجیل ) . یەکەم شت کە بانگیان دەکەیت بۆی باشاهیدی لاإله إلاّالله بێت .**

13- ولهما عن سهل بن سعد رضي الله عنه، أن رسول الله ﷺ قال يوم خيبر: (لأعطين الراية غداً رجلاً يحب الله ورسوله، ويحبه الله ورسوله، يفتح الله على يديه. فبات الناس يدوكون ليلتهم أيهم يعطاها. فلما أصبحوا غدوا على رسول الله ﷺ كلهم يرجو أن يعطاها. فقال: (أين علي بن أبي طالب؟) فقيل: هو يشتكي عينيه، فأرسلوا إليه، فأتى به فبصق في عينيه، ودعا له، فبرأ كأن لم يكن به وجع، فأعطاه الراية فقال: (انفذ على رسلك حتى تنزل بساحتهم، ثم ادعهم إلى الإسلام

---

12 البخاري في كتاب الوحيد (4347) مسلم (19) وأحمد

وأخبرهم بما يجب عليهم من حق الله تعالى فيه، فوالله لأن يهدي الله بك رجلاً واحداً، خير لك من حمر النعم). يدوكون: يخوضون. ـــــــ

لەڕیوایەتێکی دیکە دەڵێت : بانگیان بکە بۆئەوەی  کە تەنها خودا بپەرستن ،جا ئەگەر لەوەدا گوێڕایەڵیان کردی، ئەوا پێیان ڕابگەیەنە کە خودا پێنج نوێژی لەسەریان فەڕز کردووە، لە شەو و ڕۆژێکدا . جا ئەگەر لەوەشدا گوێڕایەڵیان کردیت ئەوا پێیان رابگەیەنە کە خودا زەکاتی فەڕز کردووە لەسەریان . لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان.

ئەگەر لەمەشدا  گوێرایەڵیان کردیت . ئەوا خۆت بپارێزە لە سەروەت و سامانە فرە جوانەکانیان (واتە کام ڕزقە لە چاکی وخراپیدا ناوەندییە ئەوەیان لێوەربگرە) وە خۆشت بپارێزە لە دۆعای مەزڵوم چونکە لە نێوان دۆعای مەزڵوم  و لە نێوان خودادا هیچ ڕێگرێك نییە ﴾

13–[سمتر]سەهل کوڕی سەعد ﵁ دەگێڕێتەوە: کە لە ڕۆژی خەیبەردا پێغەمبەر ﷺ فەرموی : ( وەڵلاٌهی سبەینیٚ ئەم ئاڵاٌی جەنگە دەدەم  بە کەسێك کە خوداو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت . خوداو پێغەمبەریش ئەویان خۆشدەوێت، لە سەر دەستی ئەودا فەتحی خەیبەر دەکرێت. ئەو شەوە خەڵکی کەوتنە گفتوگۆوە کە ئایا  دەبێت ئەو کەسە کیٚ بێت، کە ئاڵاٌکەی پێدەدرێت . کاتیٚ بەیانیان بە سەردا هات هەر زوو ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ هەموویان  تەماعی ئەوەیان هەبوو کە ئاڵاٌکەی پیٚ بدرێت.

فيه مسائل:        الأولى: أن الدعوة إلى الله طريق من اتبعه ﷺ

الثانية: التنبيه على الإخلاص، لأن كثيراً لو دعا إلى الحق فهو يدعو إلى نفسه.

الثالثة: أن البصيرة من الفرائض.

ـــــــ

---

13 البخاري( 2942) مسلم

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموی: عەلی کوڕی ئەبو تالب لە کوێیە ؟ گوتیان :ئازاری چاوی هەیە . فەرموی: بنێرن بە شوێنیدا.

چوون دەستیان گرت و هێنایان و تفی کردە هەردوو چاویەوە ودۆعای شیفای بۆ کرد ویەکسەر چاك بویەوە، هەروەك هەرگیز ئازاری نەبوو بێت . پاشان ئالأکەی دایە دەستی فەرموی لە سەرخۆت برۆ هەتا لە ساحەکەیاندا دادەبەزیت . ئەوجا بانگیان بکە بۆ ئیسلام بوون، پێیان رابگەیەنە کە چییان لە سەر واجبە هەرچییەك کە حەقی خودابێت لەو ئیسلامەتیەدا، جا سوێند بە خودا ئەگەر بەهۆی تۆوە ،خودا هیدایەتی تەنها یەك کەس بدات بۆ تۆ باشترە لە گەلە وشتری سور )

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1-بانگەواز کردن بۆلای خودا، ڕێگای هەرکەسێکە کە شوێن پێغەمبەر بکەوێت . (واتە واجبە)

2- ئاگادار بوون لەوەی کە ئیخلاص واتە تەوحید (ئەساسە) ،چونکە زۆربەی خەڵکی کە بانگەوازی کرد بۆلای حەق (لەڕاستیدا) بانگەواز بۆلای خۆی دەکات ( واتە بانگەزاز کردن بۆ لای خودا عیبادەتە نابێت شیرکی تێکەڵاو بکرێت ).

3-چاوڕۆشنی و بەصیرەت یەکێکە لە واجبات لەسەرشانی بانگخواز .

4- یەکێك لە نیشانەکانی جوانی تەوحید ئەمەیە کە تەوحید : بەپاك زانین وبە دوور زانینی خودایە لە هەر شتێك کە (مەعناکەی ) جوێن دان بێت بە خودا. بە بەڵگەی

وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾

الرابعة: من دلائل حسن التوحيد: كونه تنزيهاً لله تعالى عن المسبة.

الخامسة: أن من قبح الشرك كونه مسبة لله.

السادسة: وهي من أهمها – إبعاد المسلم عن المشركين لئلا يصير منهم ولو لم يشرك.

السابعة: كون التوحيد أول واجب.

الثامنة: أن يبدأ به قبل كل شيء، حتى الصلاة.

التاسعة: أن معنى: (أن يوحدوا الله)، معنى شهادة: أن لا إله إلا الله.

العاشرة: أن الإنسان قد يكون من أهل الكتاب، وهو لا يعرفها، أو يعرفها ولا يعمل بها.

الحادية عشرة: التنبيه على التعليم بالتدريج.

الثانية عشرة: البداءة بالأهم فالأهم. الثالثة عشرة: مصرف الزكاة.

---

**( كە واتە نابیٚ وەسیلەی شیركی لە بانگەوازدا بە كار بهیٚنریٚ)**

**5-بەشیٚك لە قەباحەتی شیرك ئەوەیە كە واتاكەی جویٚن دانە بە خودا .**

**6- یەكیٚ لە: گرنگ ترینی ئەم مەسەلانە : دوور كە وتنەوەی موسڵمانە لە موشریكان , نابیٚت خۆی بخاتە ڕیزی ئەوانەوە، باخۆشی شەریكی بۆ خودا دانەنابیٚت . ئەم شەش خاڵە لە ئایەتەكە وەرگیراوە.**

**7- تەوحید یەكەمینی واجباتەكانە.**

**8- دەبیٚت تەوحید لەپیٚش هەموو شتیٚكەوە دەستی پیٚ بكریٚت هەتا دەبیٚت بخریٚتە پیٚش نویٚژیشەوە. (چونكە موشریك نویٚژەكەی بەتاڵە)**

**9- ئەوەیە كە مەعنای (خودا بە تەنها بپەرستن) هەمان مەعنای لاإله إلاّالله یە..**

**10- ڕیٚی تیٚدەچیٚت كە ئینسان خاوەنی كتیٚبی ئاسمانی بیٚت ( واتە : زانای ئاینی بیٚت ) و نەزانیٚت مەعنای(لاإله إلاّالله) چیە، یان لەوانەیە بزانیٚت و كاری پیٚ نەكات .**

**(وەك جولەكە و نەصرانیەكان كە دەیانگوت لاإله إلاّالله بەڵام مەعناكەیان نەدەزانی).**

**11- ئاگاداربوون لەوەی كە فیٚركردن پلە لە دوای پلەیە.**

**12 – دەست پیٚكردن بە گرنگترین، پاشان دەچیٚتە سەر گرنگ .**

**13-چۆنیەتی سەرف كردنی زەكات .**

الرابعة عشرة: كشف العالم الشبهة عن المتعلم.الخامسة عشرة: النهي عن كرائم الأموال.

السادسة عشرة: اتقاء دعوة المظلوم. السابعة عشرة: الإخبار بأنها لا تحجب.

الثامنة عشرة: من أدلة التوحيد ما جرى على سيد المرسلين وسادات الأولياء من المشقة والجوع والوباء.

التاسعة عشرة: قوله: (لأعطين الراية) إلخ. علم من أعلام النبوة.

العشرون: تفله في عينيه علم من أعلامها أيضاً.

الحادية والعشرون: فضيلة علي رضي الله عنه.

الثانية والعشرون: فضل الصحابة في دوكهم تلك الليلة وشغلهم عن بشارة الفتح.

الثالثة والعشرون: الإيمان بالقدر، لحصولها لمن لم يسع لها ومنعها عمن سعى.

الرابعة والعشرون: الأدب في قوله: (على رسلك).

الخامسة والعشرون: الدعوة إلى الإسلام قبل القتال.

---

14- دەبێت زاناو عالم هەموو گومان و شوبهەیەك لە لای فێرخواز بڕەوێنێتەوە (وەك ئەوەی باسی چۆنیەتی صەرفکردنی زەکاتی کرد)

15- نەهی کراوە لەوەی کە جوانترین سەروەت و سامان لە زەکاتا وەربگیرێت .

16-خۆپاراستن لە دوعای ستەملێکراو .

17- ئاگادارکردنەوە لە وەی کە دوعای مەزڵوم لای خودا ،بێ پەردەیە .

18- لە نیشانەکانی ڕاستی تەوحید ئەوەیە کە چ ناڕەحەتی وبرسیەتی و وەبایەك ،بەسەر گەورەی پێغەمبەر ان و ئەولیاکاندا دا هاتووە کە گەورەی هەموو خەڵقین .

19- ئەوەی کە فەرمویە( ئالأیەك دەدەم بە کەسێك ...)نیشانەیە کی ڕوونی پێغەمبەریە .

20- تف کردنە چاوی عەلیەوە بۆچاك بونەوە،نیشانەیە کی دیکەی پێغەمبەرایەتیە .

21- فەزڵ و پایەبەرزی عەلی کوڕی ئەبو تالب

السادسة والعشرون: أنه مشروع لمن دعوا قبل ذلك وقوتلوا.

السابعة والعشرون: الدعوة بالحكمة، لقوله: (أخبرهم بما يجب عليهم).

الثامنة والعشرون: المعرفة بحق الله تعالى في الإسلام.

التاسعة والعشرون: ثواب من اهتدى على يده رجل واحد.

الثلاثون: الحلف على الفتيا.

---

22- فەزڵ و پایەبەرزی ئەصحاب لەوەدا کە ئەو شەوەیان بردە سەر بەوەی ئاخۆ کێ بێت خوداو پێغەمبەر خۆشیان دەوێت وئەوانیش ئەمیان خۆش دەوێت .لەبەرامبەر ئەمەشدا ئەو گرنگیەیان نەدا بە مژدەی فەتحی خەیبەر .

23- ئیمان هێنان بە قەدەر . بەوەی کە کەسێك هەوڵی نەدا بۆ شتێ خودا کردی بە قسمەتی وە ئەوەی هەوڵی بۆ دا نەبووبە قسمەتی.

24- فێربوونی ئەدەب لەوەدا کە فەرمووی (لە سەرخۆ برۆ)

25- بانگەواز کردن بۆ ئیسلام دەکەوێتە پێش جەنگەوە.

26- بانگەواز کردنی ئەوانەی کە لەوەو بەر بانگەواز کراون وجەنگیان لە گەڵدا کراوە، سوننەتە.

27- بانگەواز کردن بە حیکمەتەوە .

(واتە حیکمەت ئەوەیە تەوحید بخرێتە پێش واجباتەکان)

28- تێگیشتن لە حەقی خودا لە ئیسلام بوندا (وەك نوێژکردن و زەکات دان )

29- پاشتی هەر کەسێ کە لە دەستی ئەودا هیدایەتی تەنها کەسێ بدرێت .

30- سوێند خواردن لە فتوادانذا دروستە ئەگەر کەسیش سوێندی نەدات .

## 5- باب تفسير التوحيد وشهاده أن لا إله إلا الله

وقول الله تعالى﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ ﴿٥٧﴾ ﴾ الإسراء

وقوله: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى ﴾ الآية

وقوله ﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ الآية **التوبة** : 31

**وقوله:** ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ﴾ الآية

---

## بابی 5

# ڕوونکردنەوەی یەکتاپەرستی و شەهادەتی لاإله إلاّالله

**دانەر بۆ ڕوونکردنەوەی یەکتاپەرستی چوار ئایەتی هێناوە :**

**یەکەمیان : باسی تەوحیدە لە داوا کردندا .**

**دووەمیان : باسی تەوحیدە لە دۆستایەتی ودوژمنایەتیدا .**

**سێیەمیان : باسی تەوحیدە لە گوێڕایەڵیدا**

**چوارەمیان : باسی تەوحیدە لە خۆشەویستیدا .**

**یەکەم :** ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ ﴾ الإسراء

**واتەی ئەم ئایەتە وئایەتی 56: ( بڵێ : بەو موشریکانە دەی داوا بکەن لە هەموو ئەوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن تا بۆتان دەربکەوێت ، ئایە دەتوانن بەڵایەك بە تەواوی لابدەن لە سەرتان یا دەتوانن بەڵاکە بگۆڕن یا بیگوێزنەوە بۆ شوێنێکی دی . دیارە کە ناتوانن . دەی بزانن ئەو پێغەمبەران و صالحان و مەلائیکەتانەی کە ئێوە دەیانپەرستن و داوایان لێ دەکەن ، ئەوانە خۆیان بە دوای سەبەب وهۆکارێکدا دەگەڕێن کە لە خودا نزیکیان بکاتەوە، هەر چی کردەوەیەك لە خودا نزیکیان دەکاتەوە ، ئەوە ئەنجام دەدەن .( دەی سەرنج بدەن کامتان لە خوداوە نزیك ترە). لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان بە تەمای ڕەحمەتی خودان و لە عەزابی خودا دەترسن )**

**14**– وفي (الصحيح) عن النبي ﷺ أنه قال: "مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاّ اللّهُ, وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللّهِ, حَرُمَ مَالُهُ وَدَمُهُ. وَحِسَابُهُ عَلَى اللّهِ عز وجل" وشرح هذه الترجمة: ما بعده من الأبواب.

---

**دووەم:** ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾**الزخرف**

**واتە:( وەکاتێ ئیبراهیم بە بابی و قەومەکەی گوت : بەتەئکید من بەریم لە هەر چیەك کە ئێوە دەیپەرستن جگە لەو خودایەی کە ئێوەش دەپەرستن تەنها دۆستایەتی ئەو**

**دەکەم هەر ئەویش منی خەڵق کردوە . وە هەر ئەویش هیدایەتم دەدات (بۆ مەصڵەحەتی دونیا و ئاخیرەتم). وە ئەم شاهیدی و خۆبەری کردنەی کرد بە کەلیمەیەکی مەزن کە بە وەصیەتی خۆی و بە فەرمانی خودا ، لە دوای خۆی ولە ناو نەوەکانیدا مایەوە، بۆئەوەی بگەڕێنەوە لە شیرکەوە بۆلای ئەوکەلیمەیە ...)**

**سێیەم :** ﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾ ﴾
**التوبة** : 31

**واتە :(ئەو جولەکە و گاورانە زاناو خوداپەرستەکانی خۆیان کرد بە خودا و پەرستراوی خۆیان، مەسیحی کوڕی مەریەمیشیان کردبوو بە پەرستراوی خۆیان )**

**چوارەم :** ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾ البقرة: ١٦٥

**واتە :﴿ وە هەندێك لە خەڵكی هەن هاوتایان بۆ خودا داناوە (لە خۆشەویستیدا ) ئەوانەیان خۆش دەوێت، وەك خۆشەویستیان بۆخودا، ئەوانەش کە ئیمانیان هێناوە خۆشەویستیان بۆ خودا زۆر بە هێزترە لە خۆشەویستی کافرەکان بۆ خودا (یا بۆ بتەکان )﴾**

فيه أكبر المسائل وأهمها: وهي تفسير التوحيد، وتفسير الشهادة، وبيَّنَها بأمور واضحة.

منها: آية الإسراء، بيَّن فيها الرد على المشركين الذين يدعون الصالحين، ففيها بيان أن هذا هو الشرك الأكبر.

ومنها: آية براءة، بيَّن فيها أن أهل الكتاب اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أرباباً من دون الله، وبين أنهم لم يؤمروا إلا بأن يعبدوا إلهاً واحداً، مع أن تفسيرها الذي لا إشكال فيه: طاعة العلماء والعباد في المعصية، لادعائهم إياهم.

---

**14-[شمتر] پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی :﴿ هەركەسێ بڵێت (لاإله إلاّالله) لە گەڵ ئەوەشدا كافر بێت بە هەرشتێك كە دەپەرسترێت جگە لە ألله، ئەوا ماڵ و خوێنی حەرام و پارێزراوە، وحسابی لەلای خودای گەورەیە﴾**

**درێژە وشەرحی ئەم ناونیشانە لە باسەكانی دواتر دادێت (واتە : ئەو باسانەی كە لە مەودوا دێن تا كۆتایی كیتابەكە تەفسیری ئەم كەلیمەیە دەكات).**

**لەم باسەدا گەورەترین مەسەلە و گرنگترین مەسەلە ڕوونكراوەتەوە : ئەویش تەفسیری تەوحید و تەفسیری شاهیدی (لاإله إلاّالله)یە، بە چەندین شێوازی ڕوون و ڕەوان، ڕوونكراوەتەوە.**

***لەوانە :*** **ئایەتەكەی سورەتی ئیسراء بە ڕوونی ڕەدی ئەو موشریكانەی تێدا دراوەتەوە كە داوا لە پیاوچاكان دەكەن، یان دەیانپەرستن هەر لەوێدا ڕوونكراوەتەوە كە ئەو كارە شیركی گەورەیە.**

***لەوانەش:*** **ئایەتەكەی سورەتی بەڕائەت لەوێدا خودا ڕوونی دەكاتەوە كە ئەهلی كتاب زانایان وخودا پەرستەكانی خۆیان كرد بە خودا و پەرستراوی خۆیان جگە لە ألله . ڕوونیشی كردەوە كە هیچ فەرمانێكیان بە سەردا نەدراوە تەنها ئەوە نەبێت كە یەك خودا بپەرستن . لەگەڵ ئەوەشدا تەفسیری ئەو ئایەتە كە هیچ گومانی تێدا نیە ئەوەیە كە گوێڕایەڵی كردنی زانایان و خودا پەرستەكانە لە هەر كارێكدا كە بێفەرمانی خودای تێدا بێت ( ئەوە عیبادەتە)**

ومنها قول الخليل (عليه السلام) للكفار: [ الزخرف : 26- 27 ] { إِنَّنِي بَرَاءٌ مِمَّا تَعْبُدُونَ }{ إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي } فاستثنى من المعبودين ربه، وذكر سبحانه أن هذه البراءة وهذه الموالاة: هي تفسير شهادة أن لا إله إلا الله. فقال:

---

**14** مسلم (23) وأحمد ، وابن حبان

{ وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ } [ الزخرف : 28 ]
ومنها: آية البقرة: في الكفار الذين قال الله فيهم: { وَمَا هُمْ بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ } [ البقرة : 167 ] . ذكر أنهم يحبون أندادهم كحب الله، فدل على أنهم يحبون الله حباً عظيماً، ولم يدخلهم في الإسلام، فكيف بمن أحب الند أكبر من حب الله؟! فكيف لمن لم يحب إلا الند وحده، ولم يحب الله؟!.

---

، نەك (مەبەست ئەوە بێت ) كە پەرستنیان بۆ بكرێت و داوایان لێ بكرێت .

***لەوانەش*** : وتەكەی ئیبڕاهیم خەلیلە علیه السلام كە بە كافرانی گوت:

(من بەریم ودوورم لە هەر چییەك كە ئێوە بیپەرستن جگە لەو خودایەی كە دروستمی كردووە و ئێوەش دەیپەرست ) لەناو گشت پەرستراوەكاندا تەنها أللە ی جیا كردەوە. خوداش باسی ئەوەی كرد كە ئەم خۆبەری كردن و خۆ دوورخستنەوەیە لە گەڵ ئەم دۆستایەتی كردنە . ئەوە تەفسیری **لاإلـە إلاّالله** دەكات بۆیە فەرمووی: كردی بە كەلیمەیەكی مەزن كە لە نەوەكانیدا بمێنێتەوە . بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ لای .

***لەوانەش***: ئایەتەكەی سورەتی بەقەرە لە بارەی كافرانەوە كە دەفەرمویٚ

﴿ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ١٦٧ ﴾ البقرة

واتە :( ئەوانە هەرگیز لە ئاگری جەهەننەم دەرناچن ) .باسی ئەوەی كرد كە هاوتا پەرستراوەكانی خۆیان خۆش دەوێت بەقەد خۆشەویستیان بۆ خودا، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە كافرەكان خودایان زۆر خۆش دەوێت . بەمەش نەهاتنە ناو ئیسلامەوە . ئەی جا دەبێت حاڵی ئەو كەسە چۆن بێت، كە خۆشەویستی هاوتا پەرستراوەكە لە لایدا گەورەتر بێت لە خۆشەویستی خودا

ومنها قوله ﷺ (من قال: لا إله إلا الله وكفر بما يعبد من دون الله حرم ماله ودمه، وحسابه على الله) وهذا من أعظم ما يبيِّن معنى (لا إله إلا الله) فإنه لم يجعل التلفظ بها عاصماً للدم والمال، بل ولا معرفة معناها مع لفظها، بل ولا الإقرار بذلك، بل ولا كونه لا يدعو إلا الله وحده لا شريك له، بل لا يحرم ماله ودمه حتى يضيف إلى ذلك الكفر بما يعبد من دون الله، فإن شك أو توقف لم يحرم ماله ودمه. فيالها من مسألة ما أعظمها وأجلها، وياله من بيان ما أوضحه، وحجة ما أقطعها للمنازع.

---

؟!! ئەی ئاخۆ ئەو کەسە حاڵی چۆن بێت کە تەنها هاوتاکەی خۆش بوێت و خودای خۆش نەوێت.

<u>***لەوانەش***</u>: فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ

(هەر کەس بڵێ **لاإله إلاّالله** و لەگەڵ ئەوەشدا کوفر بکات بەهەرچی پەرستراوە جگە لە ألله، ئەوا ماڵ وخوێنی پارێزراوە وحسابی لەلای خودایە )

ئەمەش یەکێکە لەو بەڵگە هەرە مەزنانەیە کە مەعنای (**لاإلە إلاّالله**) ڕوون دەکاتەوە، چونکە لێرەدا تەنها گوتنی سەرزارەکی نەکردوە بە پارێزەری خوێن و ماڵ،

تەنانەت ئەوەشی نەکردوە بە پارێزەری کە مەعناکەی بزانێت و بەدەم بڵێت،

تەنانەت ئەوەش نا کە دان بنێت بە مەعنای بەوەدا کە باس کرا.

تەنانەت ئەوەش نا کە خودا بەتەنها بپەرستێت و شەریکی بۆ دانەنێت.

بەڵکو ماڵ و خوێنی پارێزراو نابێت هەتا لەگەڵ تەواوی ئەوانەشدا دەبێ کوفربکات بە هەرچیەك کە دەپەرسترێت جگە لە الله، جا ئەگەر شك یا گومانی هەبو یان لێیان ڕاوەستا، ئەوا ماڵ و خوێنی پارێزراو نابێت .

جا سەنج بدە کە ئەم مەسەلەیە چەند گەورەو گرنگە .

جاسەیری ئەوە چ ڕوونکردنەوەیەکە و چەند ڕۆشنە (ئەو حەدیسەش) چ بەڵگەیەکی بە قوەتە بۆ هەر کەسێك کە لەگەڵ گومراکاندا لەو بارەیەوە بکەوێتە نیزاعەوە .

<u>ڕوونکردنــەوە</u> : دانەرگرنگیــەکی زۆری بــەم بابــە داوە هــەر خۆشــی بــە دریـّـژی شەرحی کردووە. ئەمەش تەنها بابێکە کە خۆی شەرحی کردبێت. ئەمـەش لەبـەر گرنگیەکەی ..

# بەشی دووەمی كتاب التوحيد

## روونكردنەوەی تەوحید بە درێژی

## 6- باب من الشرك لبس الحلقة والخيط ونحوهما لرفع البلاء أو دفعه

وقول الله تعالى: ﴿ قُلۡ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلۡ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ ﴿٣٨﴾ ﴾ الآية

15- عن عمران بن حصين رضي الله عنه، أن النبي ﷺ رأى رجلاً في يده حلقة من صفر، فقال: (ما هذه)؟ قال: من الواهنة. فقال: (انزعها فإنها لا تزيدك إلا وهناً، فإنك لو مت وهي عليك، ما أفلحت أبداً) رواه أحمد بسند لا بأس به.

---

## بابی 6

## یەكێ لە نەوعەكانی شیرك : بەكارهێنانی بازنە، حەڵقە، دەزوو، وە هاوشێوەكانیانە بە نیازی لابردنی بەڵا یا گێڕانەوەی بەڵا

﴿ قُلۡ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلۡ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوۡ أَرَادَنِي بِرَحۡمَةٍ هَلۡ هُنَّ مُمۡسِكَٰتُ رَحۡمَتِهِۦۚ قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الزمر

واتە :(ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو موشریكانە مادام ئیعتراف دەكەن كە تەنها خودا خالیقە ، دەی پێم بڵێن ئەوانەی كە ئێوە داوایان لێ دەكەن و پەرستنیان بۆ دەكەن جگە لە ألله، ئەگەر خوداویستی هەر زەرەرێكم پێ بگەیەنێت، ئایا ئەوانە دەتوانن ئەو زەرەرە لابدەن، یان ئەگەر ویستی هەر جۆرێك ڕەحمەتی خۆی ببەخشێت بە من ئایا ئەوان دەتوانن ڕەحمەتەكەی بگەڕێننەوە ؟ ( دیارە دەڵێن نەخەیر ) دەی تۆش بڵێ بەسمە خودا. تەنها بە خودا پشت دەبەستن ئەوانەی كە دەیانەوێت پشتیوانێكی بەهێزیان هەبێت ) .

15– [15]عيمران كوڕى حوصەين ﵁ دەڵێت پێغەمبەرى خودا ﷺ پياوێكى بينى حەلقەيەكى زەردى لە دەستدابوو، فەرمووى : ئەوە چيە ؟
پياوەكە وتى: ئەوە بۆ چارەسەرى لاوازى وئازارى قۆلە

16– وله عن عقبة بن عامر رضي الله عنه مرفوعاً: (من تعلق تميمة فلا أتم الله له، ومن تعلق ودعة فلا ودع الله له) وفي رواية: (من تعلق تميمة فقد أشرك).
17– ولابن أبي حاتم عن حذيفة أنه رأى رجلاً في يده خيط من الحمى فقطعه، وتلا قوله: (وما يؤمن أكثرهم بالله إلا وهم مشركون) [ يوسف : 106 ]

---

. فەرمووى :( لايبدە، چونكە ئەوە جگە لاوازى دەرونى هيچى ديكەت بۆ زياد ناكات، خۆ ئەگەر بمريت و ئەوەشت پێوەبێت هەرگيز ڕزگارت نابێت .
16– [16]عوقبەى كوڕى عامر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: هەركەسێك چاوەزارێك هەڵبواسێت يا دڵى بەوشتەوە پەيوەست بێت دەك خودا كارى ڕاست نەهێنێت و مەبەستى نەهێنێتە دى، هەر كەسێك صەدەف (**ودعة** ) هەڵبواسێت، يا دڵى پەيوەست بكات بەو شتەوە، ( بەپێچەوانەى مەبەستەكەى ) دەك خودا ئارامى و ئيسراحەتى پێ نەدات. ( لە ڕيوايەتێكدا ئاوا هاتووە هەر كەسێك (تەميمە ) واتە : چاوەزارێك هەڵبواسێت ئەوا بە تەئكيد شەريكى بۆ خودا داناوە )
***ڕوونكردنەوە*** : دانەر دەڵێت (پێغەمبەرى خودا ﷺ دوعاى گيرايە ... پاشان دەڵێت هەر لەبەر ئەوەيە دەبينين ئەو كەسانەى ئەم شتانە هەڵدەواسن لە هەمووكەس زياتر خەم و خەفەتيان هەيە (دەرون ) لاوازو ڕوخاون، بە پێچەوانەى ئەهلى تەوحيدەوە، كە ئەمان عەزيمەتيان لەخەڵكى ديكە بە قوەتتر و كردەوەيان بەهێزترە.

---

[15] حسن . أخرجه أحمد وابن ماجة وابن حبان والطبراني في الكبير391 . حسّنه عبدالرزاق وضعّفه الألباني في الضعيفة.

16 جيد . أخرجه أحمد ( 17451 ) والطبراني في الكبير

17–بەئ حوزەیفـە پیـاوێکی بینــی کـە دەزوی لــە دەســت کردبــوو بــۆلادانی تــاداری، یەکسەر بە دەستی خۆی پساندی و ئەو ئایەتەی خوێندەوە :
﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللّٰهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ ﴾ واتـە:(زۆر بـەیان کـە ئیمان بـە خـودا دەهێنن لە هەمان کاتدا، ئیلا شەریك بۆ خودا دادەنێن.

فيه مسائل: الأولى: التغليظ في لبس الحلقة والخيط ونحوهما لمثل ذلك.

الثانية: أن الصحابي لو مات وهي عليه ما أفلح. فيه شاهد لكلام الصحابة: أن الشرك الأصغر أكبر من الكبائر الثالثة: أنه لم يعذر بالجهالة.

الرابعة: أنها لا تنفع في العاجلة بل تضر، لقوله: (لا تزيدك إلا وهناً).

الخامسة: الإنكار بالتغليظ على من فعل مثل ذلك.

السادسة: التصريح بأن من تعلق شيئاً وكل إليه.

السابعة : التصريح بأن من تعلق تميمة فقد أشرك.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1– توندی نواندن ( لە حەرام کردندا) لە بەرانبەر بەکارهێنانی حەڵقە و دەزوو و هاوشێوەکانیان کە بۆ لابردنی زیان ، یان قازانج پێ گەیاندن بێت.

2– ئەگـەر ئەصـحابەکە بمردایـە، ئەوشـتەی لـە دەسـتدا بمایـە هـەرگیز ڕزگـاری نەدەبوو، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (ئەصحاب فەرمویانـە )شیرکی بچوك لە تاوانە گەورەکان گەورەترە.

3– نەزانی ئەوپیاوە نەکرایە عوزر بۆی.

4– ئەوحەلقـە و دەزووە لـە دونیـادا سـودی پـێ ناگەیـەنێت، بـەڵکو زیـانی پـێ دەگەیەنێت، ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی کە فەرموی
:(جگە لەلاوازی هیچی دیکەت بۆ زیاد ناکات )

---

17 صحيح لغيره دون قراءة الآية . أخرجه ابن أبي حاتم في تفسيره ( 12040 ) وإسناده منقطع ، ولكن أخرجه ابن ابى شيبة في المصنف ( 23452 )بسندين الثاني صحيح .

5- ئینکاری کردن و گۆڕانکاری بە توندی ، بەرانبەر هەر کەسێك کارێکی وا بکات (سونەتە )

6- ڕوونکردنەوەی ئەوە کە هەرکەسێك شتێك هەڵبواسێت یا دڵی پێوەی پەیوەست بێت ،ئەوا دەدرێتە دەست ئەوشتە (کە هیچ سودی پیٚ ناگەیەنێت خواش هیچی بۆ ناکات)

الثامنة: أن تعليق الخيط من الحمى من ذلك.

التاسعة: تلاوة حذيفة الآية دليل على أن الصحابة يستدلون بالآيات التي في الشرك الأكبر على الأصغر، كما ذكر بن عباس في آية البقرة. العاشرة: أن تعليق الودع عن العين من ذلك.

الحادية عشرة: الدعاء على من تعلق تميمة، أن الله لا يتم له، ومن تعلق ودعة، فلا ودع الله له، أي لا ترك الله له.

---

7- ڕوونکردنەوەی ئەوە : کە هەر کەسێك چاوەزار هەڵبواسێت، ئەوا شەریکی بۆ خودا داناوە.

8- هەڵواسینی دەزوو بۆ تاداری، هەمان شتە.

9- خوێندنەوەی ئایەتەکە لە لایەن حوزەیفەوە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئەو ئایەتانەی باسی شیرکی گەورە دەکەن ئەصحاب دەیانکرد بە بەڵگە لەسەر شیرکی بچوك. هەروەك ابن عباس لەبارەی ئایەتەکەی سوڕەتی بەقەڕەوە باسی کرد.

10- هەڵواسینی صەدەف( **ودعة** ) هەمان حوکمی هەیە.

11- دۆعا کردن لەو کەسەی کە مورو و ئەشیای چاوەزار هەڵدەواسێت بەوەی کە خودا کاری ڕاست نەهێنێت و مەبەستی نەیەتەدی، هەرکەسێکیش (صەدەف) هەڵواسێت ، خودا هێمنی و ئارامی پێنەبەخشێت.

<u>**ڕوونکردنەوە**</u> : دانەر دەیەوێت ڕوونی بکاتەوە کە بەکارهێنانی حەلقە و دەزوو بۆ لابردنی بەڵا دوای دابەزینی یا لادانی بەڵا پێش دابەزینی ، جۆرێکە لە شیرك ئەمەش دوو جۆری هەیە .

<u>**یەکەم**</u> : (الشرك في الربوبية ) ئەگەر باوەڕی وابوو کە ئەو شتانە خۆیان بەڵاکە لادەدەن یا لادەبەن، ئەمەیان شیرکی گەورەیە لە پەروەردگاریدا ، چونکە مەعنای وایە : باوەڕی بەوە هەیە کە جگە لە ﷲ شتێکی دیکە هەیە خالق بێت .

<u>**دووەم**</u>:( الشرك الأصغر ) ئەگەر باوەڕی وابوو کە ئەو شتانە سەبەبن و خودا خۆی کردونی بە سەبەب، خودا هەر خۆی بەڵاکە لادەدات یا لا دەبات، ئەمەیان شیرکی بچوکە .

نیشانەی ئەم بەشەیان ئەوەیە کە چەسپا بێت ئەوشتە نە لە ڕووی شەرعەوە نە لە ڕووی قەدەرەوە، سەبەبی لادان و لابردنی بەڵا نین.

لە ڕووی شەرعەوە وەك هەنگوین و ئاوی زمزم .

لە ڕووی قەدەرەوە : وەك ئەوەی کە بە تەجروبە سەلما بێت ئەو شتە چارەی فلاّن نەخۆشی دەکات .

**نمونەی دیکە کە بەر ئەم باسە دەکەوێ**: دانانی کتێبی شەرعی لە سەیارەو دوکاندا بۆ چاوەزار یا لادانی بەڵا، لە دەستکردنی بازنەی موگناتیسی بۆ ڕۆماتیزم هەڵواسینی مووروی شین : یا مووروی زەرد بۆ زەردوویی پەت لە دەست کردن، بازنەی زەرد لە دەست کردن، صەدەف ، هەڵواسینی ناڵی کەر، یا

كەللە و پاشماوەی ئاژەڵان... دانانی چەقۆ لە ژێر سەری منداڵی تازە لە دایك بوو..

## 7- باب ما جاء في الرقى والتمائم

18- في (الصحيح) عن أبي بشير الأنصاري رضي الله عنه أنه كان مع رسول الله ﷺ في بعض أسفاره، فأرسل رسولاً أن لا يبقين في رقبة بعير قلادة من وتر أو قلادة إلا قطعت.

19- وعن ابن مسعود رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: (إن الرقى والتمائم والتولة شرك) [رواه أحمد وأبو داود].

---

بابی7

## چی لە بارەی حوكمی دۆعای شیفاو چاوەزارەوە هاتووە.

18-[18] ئەبو بەشیری ئەنصاری رضي الله عنه دەگێڕێتەوە كە :(خۆی لەگەڵ پێغەمبەردا بووە لە هەندێك لە سەفەرەكانیدا. نێراوێكی نارد كە بانگەواز بكات: هیچ ملوانكەیەك ( كە لە پەتە كۆنەی كەوان دروست كراوە ) یان گوتی هیچ ملوانكەیەك لە ملی هیچ وشترێكدا نەمێنێت ئیلا دەبێت بقرتێنرێ ولێ بكرێتەوە.

19-[19] درێژەی حەدیسەكەی ابن مسعود رضي الله عنه بەم جۆرەیە : زەینەبی خێزانی دەڵێت : عبدالله هاتە ژوورەوە و لە پاڵمدا دانیشت . پاشان دەزوویەكی بینی لە گەردنمدا گوتی ئەمە چییە ؟ گوتم دەزوویەكە ، دوعایان خوێندووە بۆم بە سەریدا . ئەویش

---

18 البخاري (305) و مسلم (2165)

19 جيد أخرجه أبو داود 3833 . وأحمد 3615 والطبراني في الكبير 10503 وصححه أحمد شاكر في تحقيق المسند .

گرتی و قرتاندی و پاشان گوتی : ئەڵبەتە بنەماڵەی عبداللە پێویستیان بە شیرك نییە ، خۆم گوێبیستی پێغەمبەری خودا بووم ﷺ (دەیفەرموو: ﴿بە تەئكید ئەم ڕوقیە و چاوەزارانە ، ونوشتەی شیرینی جۆرێكی شیركن﴾

زەینەب دەڵێت : گوتم بە عبداللە چۆن وا دەڵێیت ، (زۆر جار ) چاوم دەفڕی . منیش دەچووم بۆ لای ئەو جولەكەیە دوعای بۆم دەخوێند ، دوای ئەوە چاوم ئارام دەبوو ؟

عبداللە گوتی : ئەوە تەنها كاری شەیتانە بە دەستی تێی دەژەنێ كاتێ ئەو جۆرە دوعایە بەكاردەهێنێ لێی دەگەڕێت : بەڵكو هەر ئەوەندەت بەس بوو كە وەك

**20**– وعن عبد الله بن عكيم مرفوعاً: (من تعلق شيئاً وكل إليه). [رواه أحمد والترمذي].

(التمائم): شيء يعلق على الأولاد من العين، لكن إذا كان المعلق من القرآن، فرخص فيه بعض السلف، وبعضهم لم يرخص فيه، ويجعله من المنهي عنه، منهم ابن مسعود رضي الله عنه.

و(الرقى): هي التي تسمى العزائم، وخص منه الدليل ما خلا من الشرك، فقد رخص فيه رسول الله ﷺ من العين والحمة.

و(التولة): شيء يصنعونه يزعمون أنه يحبب المرأة إلى زوجها، والرجل إلى امرأته.

---

پێغەمبەری خودا ﷺ بڵێیت : « أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا »

(التمیمە ) شتێكە بە منداڵەوە هەڵدەواسرێت بۆ لادانی چاوی پیس، بەڵام ئەگەر هەڵواسراوەكە ئایەتی قورئان بوو، ئەوا هەندێك لە سەلەف ڕوخصەتیان پێداوە، هەندێكی دیكەشیان ڕێگەیان پێ نەداوە و نەهیان لێ كردووە، لەوانەش ابن مسعود.

(الرقی) ئەو دوعاو زیكرانەیە كە بە زارەكی دەگوترێت، ئەگەر شیركی تێدا نەبێت، ئەوەدروستە، و بەڵگەی تایبەتی لەسەرە كە پێغەمبەر خۆی ڕوخصەتی پێداوە بۆ لادانی چاوی پیس یا بۆ چارەكردنی پێوە دراوی دوپشك ومار یا بۆ خۆپاراستن لێیان.

(التوله) شتێکه لای خۆمان پێی دەگوترێت نوشتەی شیرینی دیعایەی ئەوە دەکەن کە ژن لای پیاو خۆشەویست دەکات، پیاویش لای ژنەکەی خۆشەویست دەکات .

20 – [20] عبدالله کوڕی عوکەیم دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

﴿ هەرکەسێك شتێ هەڵبواسێت ( بۆ لادانی زیانێك یا بۆ هێنانی سودێك . یا دڵی پەیوەست بکات بەو شتەوە ) ئەوا خودا لێی دەگەڕێت و پشتی بەر دەدات﴾.

**21**– وروى أحمد عن رويفع قال: «قَالَ لي رَسُول الله ﷺ : يَا رويفع ، لَعَلَّ الْحَيَاة ستطول بك بعدِي ، فَأخْبر النَّاس أَن من عقد لحيته أَو تقلد وترا أَو استنجى برجيع دَابَّة أَو عظم ؛ فَإِن مُحَمَّدًا بَرِيء مِنْهُ» .

**22**– وعن سعيد بن جبير رضي الله عنه ، قال: (من قطع تميمة من إنسان كان كعدل رقبة) [رواه وكيع]

**23**– وله عن إبراهيم قال: كانوا يكرهون التمائم كلها، من القرآن وغير القرآن.

---

21– [21] روەیفع رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی :﴿ئەی ڕوەیفع ئومێد هەیە تەمەنت درێژ ببێت ئەو کاتە خەڵکی ئاگادار بکەرەوە کە هەر کەس ڕیشی گرێ بدات (بۆ فەخرو شانازی یا لە ترسی چاو ) یا پەتی تیروکەوانەکەی بکاتە ملی وشتر . یا بە پاشەڕۆی ئاژەڵ خۆی پاك بکاتەوە لە پیسایی. ئەوا ڕاییگەنە کە محمد لەو کەسە بەرییە﴾

22 [22] سەعیدی کوڕی جوبەیر گوتی :(هەر کەسێ چاوەزارێك بپچڕێنێت بە هەر شتێکەوە بێت ( پاداشتەکەی ) وەك ئەوە وایە کۆیلەیەکی ئازاد کرد بێت ).

---

20 صحيح لشواهده . أخرجه أحمد والترمذي ( 2073).

21 حسن . أخرجه أحمد . وأبو داود 36 والطبراني في الكبير (4491 )

22 أثر . أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف (3524)

23-[23]إبراهيم النخعي دەڵێت :(هاوڕێیانی عبدالله ی کوڕی مسعود (واتە : تەلەبەکانی) چاوەزاری هەڵواسراویان به مەکڕوه داناوە جا بە قوڕئان بێت یا بە غەیری قورئان ).
مەکڕوهیش لای سەلەف واتە حەرام

فيه مسائل:

الأولى : تفسير الرقي والتمائم. الثانية: تفسير التولة.

الثالثة : أن هذه الثلاثة كلها من الشرك من غير استثناء.

الرابعة: أن الرقية بالكلام الحق من العين والحمة ليس من ذلك.

الخامسة: أن التميمة إذا كانت من القرآن فقد اختلف العلماء هل هي من ذلك أم لا؟.

السادسة: أن تعليق الأوتار على الدواب عن العين، من ذلك.

السابعة: الوعيد الشديد على من تعلق وتراً. الثامنة: فضل ثواب من قطع تميمة من إنسان.

التاسعة: أن كلام إبراهيم لا يخالف ما تقدم من الاختلاف، لأن مراده أصحاب عبد الله بن مسعود.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ڕوقیەی هەڵواسراو وچاوەزار .

2- تەفسیر و ڕوونکردنەوەی نوشتەی شیرینی .

3- ئەو سیانە هەرسێکیان شیرکن بە بێ جیاوازی .

---

23 أثر .أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف (3518

4- خوێندنی دوّعا بە وتەی حەق بۆ چارە کردنی چاولێدراو  پێوەدراوی مار ودوپشك  (یاهەر نەخۆشییەکی دیکە ) ئەو حوکمەی نیە.

5- چاوەزاری هەڵواسراو ئەگەر بە ئایەتی قورئان بێت زانایان لەو بارەیەوە یەکدەنگ نین کە جائیز بێت یان نا؟

6- هەڵواسینی پەت وقایش و ملوانکەی موروو بە ئاژەڵانەوە (یا بە خانوو یا بە سەیارەوە ) لە ترسی چاو شیرکە .

7- ئەو هەرەشە توندە لە هەر کەسیٚ کە پەت و قایش دەکاتە ملی ولاغەوە بۆ چاوەزار

8- گەورەیی پاداشتی هەرکەسێك کە چاوەزارێك بە ئینسانێکەوە لیٚ بکاتەوە .

9- وتەکەی ئیبڕاهیمی نەخەعی، پێچەوانەی ئەو ناکۆکیە نیە  کە لەوە بەر باس کرا ، چونکە مەبەستی ئیبراهیم هاوڕێیانی عبدالله ی کوڕی مەسعودە .

## 8- باب من تبرك بشجره أو حجر ونحوهما

وقول الله تعالى: ﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ ﴾ النجم

24- عن أبي واقد الليثي، قال: خرجنا مع رسول الله ﷺ إلى حنين ونحن حدثاء عهد بكفر، وللمشركين سدرة يعكفون عندها وينوطون بها أسلحتهم، يقال لها: ذات أنواط، فمررنا بسدرة فقلنا: يا رسول الله أجعل لنا ذات أنواط كما لهم ذات أنواط فقال رسول الله ﷺ: (الله أكبر! إنها السنن، قلتم. والذي نفسي بيده. كما قالت بنو إسرائيل لموسى: (اجعل لنا إلهاً كما لهم آلهة قال إنكم قوم تجهلون) [ الأعراف : 138 ]  (لتركبن سَنَن من كان قبلكم). [رواه الترمذي وصححه].

---

**بابی8  هەرکەسێك بەردێك یادارێك یاهەرشتێکی لەوبابەتانە بکات بە تەبەڕوك ، موشریکە.**

تەفسیری ﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ ﴾ النجم

واتە :(پێم بڵێن لات و عوزا وە مەنات سێیەم و ئەخیریان چ گەورەییەکیان هەیە و چ سودێکیان هەیە ) ئەم ئایەتە شاهیدە لە سەر ئەوەی کە تەبەڕوك کردن بە دار و بەرد شیرکە .

24–[24](أبو واقد الليثي ) دەڵێت :( لەگەڵ پێغەمبەری خودا دا (ﷺ) چوینە دەر بۆ حونەین. لەو کاتەشدا تازە موسڵمان بووین موشریکەکانیش دارێکی سیدریان هەبوو واتە داری نەبق لە پاڵیدا دەمانەوە بۆ موبارەکی. سیلاحەکانیان پێوە هەڵدەواسی بۆ موبارەکی پێیان دەگوت (ذات انواط) واتە درەختی هەڵواسین بۆ بەرەکەت .

ئێمەش کە بەلای درەختەکەدا تێپەڕ بووین گوتمان ئەی پێغەمبەری خوداﷺ

فيه مسائل: الأولى: تفسير آية النجم.

الثانية: معرفة صورة الأمر الذي طلبوا. الثالثة: كونهم لم يفعلوا.

الرابعة: كونهم قصدوا التقرب إلى الله بذلك، لظنهم أنه يحبه.

الخامسة: أنهم إذا جهلوا هذا فغيرهم أولى بالجهل.

---

تۆش درەختێکمان بۆ دابنێ، وەك ئەوان چەکەکانمانی پێوە هەڵبواسین (واتە بۆ موبارەکی بۆ ئەوەی تیژ بێت و کاریگەری زۆر بێ لە سەر دوژمن)

پێغەمبەریش ﷺ فەرموی : (الله أكبر) ئەوە ڕێبازەکانە. سوێند بەو زاتەی ڕۆحی محمد ی بەدەستە ئەوەی وتتان، هەر وەك ئەوە وایە کە نەوەکانی ئیسڕائیل بە موسایان گوت :ئەی موسا پەرستراوێکمان بۆ دابنێ هەر وەك چۆن کافرەکان پەرستراوێکیان هەیە ، موساش فەرموی (بە ڕاستی ئێوە قەومێکن

---

24 صحيح . أخرجه الترمذي (2180). والطبراني في الكبير( 3290)

نەفامن ) سوێند بە خودا ئەی ئومەتەکەم ئێوەش دەکەونە شوێن ڕێبازی قەومەکانی پێش خۆتان). تەواو

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی سوڕەتی نەجم

2- ناسینی شێوازی ئەو کارەی کە داوایان کرد (واتە : داوایان کرد درەختێکیان بۆ دابنێ بۆ موبارەکی) لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەر دەکەوێت .

3- ئەوان کارەکەیان ئەنجام نەدا (بەڵکو تەنها داوایان کرد، تازە موسڵمانیش بوون )

4- ئەوان مەبەستیان ئەوە بوو کەخۆیان لەخودا نزیك بکەنەوە چونکە گومانیان وا بوو کە خودا ئەو کارەی پێخۆشە

5- ئەوان کەئەصحابی پێغەمبەرن ، لەترسناکی ئەومەسەلە ئاگادار نەبون ، جاغەیری ئەوان لە پێشترن، کە ئاگاداری ئەومەسەلەیە نەبن .

السادسة: أن لهم من الحسنات والوعد بالمغفرة ما ليس لغيرهم.

السابعة: أن النبي ﷺ لم يعذرهم، بل رد عليهم بقوله: (الله أكبر إنها السنن، لتتبعن سنن من كان قبلكم) فغلظ الأمر بهذه الثلاث.

الثامنة: الأمر الكبير، وهو المقصود: أنه أخبر أن طلبتهم كطلبة بني إسرائيل لما قالوا لموسى: (اجْعَل لَّنَا إِلَهًا) التاسعة: أن نفي هذا معنى (لا إله إلا الله)، مع دقته وخفائه على أولئك.

العاشرة: أنه حلف على الفتيا، وهو لا يحلف إلا لمصلحة.

الحادية عشرة: أن الشرك فيه أكبر وأصغر، لأنهم لم يرتدوا بهذا.

---

6- ئەوان چاکەی زۆریان هەیە، وەعدی ئەوەشیان پێ دراوە کەخودا لێیان خۆشبووە، کە غەیری ئەوان، ئەو چاکە و وەعدەیان پێ نەدراوە .

7- پێغەمبەر : ﷺ ، عوزری ئەوەی بۆ نەهێنانەوە کە نەزانن، بەڵکو بەوە ڕەددی دانەوە کە فەرموی (أللە اکبر) ئەوی کە گوتتان هەمان ڕێبازی کافرانی پێشووە سوێند بە خودا دەکەونە شوێن ڕێبازی کافرە کانی پێش خۆتان )

.بە دەربڕینی ئەم سێ وتەیە کارەکەی ئەوانی بەگوناهێکی گەورە دانا

8- ئەو کارە گەورەیە کە لێرەدا مەبەستە ئەوە بوو خەبەری ئەوەی پێدان کە داواکاریەکەیان، هەمان داواکاری نەوەکانی ئیسرائیلە کاتێ بە موسایان گوت : بتێکمان بۆ دابنێ بابیکەین بەخودای خۆمان و بیپەرستین .( واتە هەمان مەعنایان هەیە با ناوەکانیشیان جیا بێت .

9- ڕەدکردنەوەی ئەم داوا کارەیەی ئەوان بەشێکە لە واتای **لاإله إلاّالله** لە گەڵ ئەوەشدا ئەو مەعنایە لەلای ئەو ئەصحابانە ورد و شاراوە بوو.

10-پێغەمبەر ﷺ لەو فەتوایەدا سوێندی خوارد دیارە کە ئەویش سوێند ناخوات مەگەر لە شتێکدا کە مەصلەحەت بێت .

11- شیرك دووجۆری هەیە گەورەو بچوك . بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەوان بەوکارەیان موڕتەد نەبوونەوە .

الثانية عشرة: قولهم: (ونحن حدثاء عهد بكفر) فيه أن غيرهم لا يجهل ذلك.

الثالثة عشرة: التكبير عند التعجب، خلافاً لمن كرهه.

الرابعة عشرة: سد الذرائع. السادسة عشرة: الغضب عند التعليم.

الخامسة العشرة : النهيُ عن التشبُه بأهل الجاهلية

السابعة عشرة: القاعدة الكلية، لقوله (إنها السنن).

الثامنة عشرة: أن هذا عَلم من أعلام النبوة، لكونه وقع كما أخبر.

التاسعة عشرة: أن كل ما ذم الله به اليهود والنصارى في القرآن أنه لنا.

العشرون: أنه متقرر عندهم أن العبادات مبناها على الأمر، فصار فيه التنبيه على مسائل القبر. أما (من ربك)؟ فواضح، وأما (من نبيك)؟ فمن إخباره بأنباء الغيب، وأما (ما دينك)؟ فمن قولهم: (اجعل لنا إلهاً) إلخ.

الحادية والعشرون: أن سنة أهل الكتاب مذمومة كسنة المشركين.

الثانية والعشرون: أن المنتقل من الباطل الذي اعتاده قلبه لا يُؤمن أن يكون في قلبه بقية من تلك العادة لقولهم: ونحن حدثاء عهد بكفر.

---

12- گوتیان : (ئێمە لەو کاتەدا تازە وازمان لە کوفر هێنا بوو) مەعنای ئەوەی تێدایە کە ئەم مەسەلەیە لای ئەصحابەکانی تر کە زووتر ئیمانیان هێنا بوو شاراوە نەبووە و عوزری ئەوەیان نەبووە کە بڵێن نەمانزانیوە .

13- وتنی الله أكبر لەکاتی سەر سوڕمان و تەعەجوبدا سونەتە بەپێچەوانەی ئەوانەی کە باشی نازانن .

14- داخستن و نەهێڵانی دەروازەکانی خراپە (سدالذرائع)

15 –نەهی کردن و قەدەغە کردنی لاسایی کردنەوەی خەڵکانی جاهیلی و نەفامی.

16- تووڕە بوون لە کاتی فێرکردندا دروستە .

17–ئەو قاعیدە و بنەما گشتگیرە ( واتە ئەم ئوممەتە شوێن ئومەتەکانی پێشووتر دەکەون) بە بەڵگەی ئەوەی کە فەرمووی (ئەوە ڕێبازی کافرانی پێشووە)

18- ئەمە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی، چونکە چۆن خەبەری دا هەروا دەرچوو .

19 – لە هەر شتێکدا کە خودای گەورە زەم و لۆمەی جولەکە و گاورانی کردبێت لە قورئاندا. ئەوە مەبەستەکەی بۆ ئێمەیە و لەگەڵ ئێمەیەتی کە نابێت ئێمەش وەك ئەوان بکەین.

20- ئەو مەسەلەیە لای ئەصحاب چەسپاوە کە نابێت هیچ عیبادەتێك بکرێت مەگەر بە ئەمری خودا و پێغەمبەر ﷺ (ئەگەر وا نەبوو دەبێتە بیدعە) ئەمەش دەبێتە ئاگادار بوونەوە لە سوئالی قەبر دەپرسن کێ خودا وپەرستراوتە ؟ جوابەکەی ئاشکرایە پاشان کێ (النبي) تە واتە کێت هەبوو خەبەری غەیبی هێنا بێت بۆت، دیارە هەر محمدە (ﷺ) پاشان دین و بەرنامەت چیە ؟ جوابەکەی لەوەدایە کە وەك ئەصحاب بێ پرس و ئیزنی پێغەمبەر هیچ جۆرە دینداریەك نەکەین . هەروەك ئەصحابی موسا وئەصحابی پێغەمبەر پرسیان بە پێغەمبەری خۆیان کرد . ئەوان گوتیان : ئەی موسا پەرستراوێکمان بۆ دابنێ، ئەمانیش گوتیان : درەختێکمان بۆ دابنێ بۆ تەبەڕوك .

21- ڕێبازی ئەهلی کتاب، هەر وەك ڕێبازی موشریکان زەمی کراوە .

22- ئەو کەسەی کە لە دین وڕێبازیکی ناحەقەوە کە دڵی پێی ڕاهاتووە دێتە سەر دینی ئیسلام لەوە ئەمین نابیٚ کە پاشماوەی دینە کۆنەکەی تێدا ما بێت .ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی کە گوتی: ئێمەش تازە موسڵمان بووین . و تازەکی وازمان لە کوفر هێنابوو .

***ڕوونکردنەوە*** :لە بارەی بەرەکەت و تەبەڕووکەوە : بەرەکەت واتە :زۆر بوونی شتێك کە خێری زۆری تێدا بێت چەسپاوو وبەردەوام بێت (التبرك) واتە گەڕان بەدوای بەرەکەتدا . ئەو ئایەتانەش وەك ﴿**تبارك الذي**..﴾﴿**وجعلني مباركا**﴾ ئەوە تەنها خودا خۆیەتی بەرەکەت دەکاتە هەرشتێکەوە کەخۆی بیەویٚ .

- بەڵگەکاتی قورئان و سونەت لەسەرئەوەن کە ئەو شتانەی خودا بەرەکەتی تێکردوون یاشوێنن یا کاتەکانن یا ئادەمین ئەمانیش دەکرێن بە دوو بەشەوە .

بەشی یەکەم : خودای گەورە خۆی بەرەکەتی کردوەتە هەندیٚ شوێنەوە وەك مزگەوتی حەڕام و دەوری بیت المقدس وەك فەرمویەتی ﴿ٱلَّذِى بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ﴾ مەعنای ئەوەش کە ئەرزەکە موبارەکە واتە : خێر و پاداشتێکی زۆر لەو شوێنەدا چەسپاوە. ئەمەش هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کە خەڵکی بڕۆن دەست بهێنن بە ئەڕزەکەی دا یان بە دیوارەکەیدا چونکە بەرەکەتەکەی وا بە خۆیەوە و نەقڵ نابێت بۆ شتێکی دیکە . بەڵکو بەرەکەتەکەی تەنها لە لایەنی مەعناوەیە .

هەروەها مزگەوتی حەرامیش خودا کە بەرەکەتی تێکردووە واتە :هەر کەسێك بروات سەردانی بکات و بە دەوریدا بسوڕێتەوە لە لایدا عیبادەت بکات، ئەوا پاداشت وخێرێکی زۆری دەست دەکەوێت .هەروەها بەردە ڕەشەکەش موبارەکە بەڵام بەرەکەتەکەی لەوەدایە کە هەر کەسیٚ دەستی لێبدات یاماچی بکات پاداشت وخێرێکی زۆری دەست دەکەوێت ...

ئەوە بوو ئیمامی عومەر کاتیٚ بەردە ڕەشەکەی ماچ کرد گوتی:(دەزانم تۆ بەردێکیت، نەسود بە کەس دەگەیەنیت نەزیان ) بوخاری 1605 موسلیم1270ڕیوایەتیان کردووە. مەعنای وتەکەی وایە هەرکەس ماچی بکات، ئەو

بەردە نە سودی پێدەگەیەنێت نە زەرەر .ئەمەشی بۆ ئەوە کردووە کە خودا لە خۆی ڕازی بکات وشوێن سوننەتی پێغەمبەر بکەوێ ﷺ ئەمە لە ڕووی بەرەکەتی شوێنەکانەوە .

بەڵام ئەوەی کە کاتێ یا زەمانەیەك بەرەکەت بێت یا موبارەك بێت وەك مانگی ڕەمەزان و کاتە پیرۆزەکانی دیکە واتە: هەر کەس لەو کاتانەدا عیبادەت بکات پاداشتێکی زۆری دەست دەکەوێت کە بە بەراورد لە گەڵ کاتەکانی دیکەدا ئەو پاداشتەی دەست ناکەوێت .

***بەشی*** دووەم :بەرەکەتێ کە پەیوەست بێت بە نەوەی ئادەمەوە کە خودا خۆی لە هەندێ لە عەبدە صاڵحەکانیدا دروستی کردووە . ئەمەیان تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە. بەرەکەتی ئەوان لە خودی خۆیاندایە .واتە:جەستەی ئەوان موبارەکە . واتە :هەر کەس لە قەومەکانیان بۆ تەبەڕوك دەستی دابێت لە جەستەیانەوە یا عەرەق و مووی ئەوانی بە کار هێنابێت بۆ تەبەروك ئەمەیان دروستە . چونکە خودا وا دروستی کردوون کە بەرەکەتەکەیان نەقڵ ببێ بۆ غەیری خۆیان .بەڵام لە دوای ئەوان بەرەکەتەکەیان لە کار وکردەوەیاندایە نەك لەخۆیاندا.

( التمهيد شرح كتاب التوحيد)

## 9– باب ما جاء في الذبح لغير الله

وقول الله تعالى: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ ﴾ الآية الأنعام وقوله:. ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ﴿٢﴾ ﴾ الكوثر

25– عن علي رضي الله عنه قال: ((حَدَّثَنِيْ رَسُوْلُ اللهِ ﷺ بِأَرْبَعِ كَلِمَات: لَعَنَ الله مَن ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ. لَعَنَ اللهُ مَن لَعَنَ وَالِدَيْهِ. لَعَنَ اللهُ مَن آوَىْ مُحدثًا. لَعَنَ اللهُ مَنْ غَيَّرَ مَنَارَ الأَرْض)). [رواه مسلم].

---

بابی9

## باسی سەر بڕینی ئاژەڵ و قوربانی کردن بۆ غەیری خودا

خودا دەفەرمویٚ :﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ ﴾

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ بە تەئكید نوێژو سەربڕین و قوربانی كردن و كردەوەكانم لە ژیانمدا و ئەوەش كە لە سەری دەمرم، تەنها بۆ پەرستراوی بە حەقە كە پەروەردگاری جیهانەكانە .هیچ شەریكی نیە لە هیچ عیبادەتێكدا وە بەمە ئەمر دراوە بە سەرمدا كە تەوحید و ئیخلاصە ، منیش یەكەمینی موسڵمانەكانم لەم ئوممەتەدا ﴾

وه فەرمویەتی﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ ﴾ الكوثر

واتە :(جا كەواتە نوێژ بۆ پەروەردگارت بكە و قوربانی بۆ سەر ببڕە)

25- [25]عەلی كوڕی ئەبوتالب رضي الله عنه وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ چوار كەلیمەی پێم گوت : ( لەعنەتی خودا لەو كەسەی كە گیاندارێك سەر دەبڕێت یا بیكوژێت بۆ غەیری خودا (واتە : بۆ ئەوەی خۆی لێ نزیك بكاتەوە یا بە گەورە و مەزنی دابنێت) .

26- وعن طارق بن شهاب، أن رسول الله ﷺ قال
{ دَخَلَ رَجُلٌ الْجَنَّةَ فِي ذُبَابٍ وَدَخَلَ النَّارَ رَجُلٌ فِي ذُبَابٍ , قَالُوا : وَكَيْفَ ذَلِكَ يا رسول الله ؟ قَالَ مَرَّ رَجُلَانِ عَلَى قَوْمٍ لَهُمْ صَنَمٌ لَا يَجُوزُهُ أَحَدٌ حَتَّى يُقَرِّبَ لَهُ شَيْئًا , فَقَالُوا لِأَحَدِهِمَا : قَرِّبْ قَالَ : لَيْسَ عِنْدِي شَيْءٌ أقرب َقَالُوا لَهُ قَرِّبْ وَلَوْ ذُبَابًا , فَقَرَّبَ ذُبَابًا فَخَلَّوْا سَبِيلَهُ قَالَ : فَدَخَلَ النَّارَ , وَقَالُوا لِلْآخَرِ قَرِّبْ وَلَوْ ذُبَابًا فقَالَ مَا كُنْت لِأُقَرِّبَ لِأَحَدٍ شَيْئًا دُونَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ : فَضَرَبُوا عُنُقَهُ قَالَ فَدَخَلَ الْجَنَّةَ * [رواه أحمد].

---

25 مسلم (1978).

لەعنەتی خودا لەو كەسەی كە لەعنەت لە دایك و بابی خۆی دەكات.
لەعنەتی خودا لەو كەسەی كە تاوانبارێك پەنا دەدات .
لەعنەتی خودا لەو كەسەی كە سنور و نیشانەكانی زەوی دەگۆڕێت)
26- [26]تارق كوڕی شیهاب ﵁ گوتی:پێغەمبەر ﷺ فەرموی :
﴿بە هۆی مێشێكەوە پیاوێك چووە بەهەشت ، پیاوێكیش بە هۆی مێشێكەوە چووە ئاگری جەهەننەمەوە . گوتیان چۆن ئەی پێغەمبەری خودا ؟
فەرموی: دوو پیاو بەلای قەومێكدا گوزەریان كرد كە بتێكیان هەبوو. لێنەدەگەڕان هیچ كەس بە نزیكیدا تێپەڕێ. هەتا شتێكی نەكردایە بە قوربانی ئەو بتە.
گوتیان بە یەكێكان قوربانی بكە بۆ بتە كەمان .گوتی هیچم نییە بیكەم بە قوربانی .
گوتیان : (قرب ) واتە خۆت نزیك بكەرەوە لە بتەكە یانی قوربانیەك بكە با مێشێكیش بێت هەر تەواوە . ئەویش مێشەكەی كردە قوربانی. ئەوانیش ڕێگەیان بەردا و چووە ئاگری جەهەننەمەوە . بەوی دیكەشیان گوت : قوربانیەك بكە ، ئەویش وتی: هیچ قوربانیەك بۆ
هیچ كەس ناكەم جگە لە ﷲ. لەبەر ئەوە دایان لە گەردنی و كوشتیان وچووە بەهەشتەوە ) حەدیسەكە تەواو

<u>***ڕوونكردنەوە***</u> : ئەم سەربڕینە مەبەست سەربڕینی عیبادەتە: واتە ڕشتنی خوێنی حەیوانێك بۆ خۆ نزیك خستنەوە لە كەسێ یا بە گەورە زانینی ئەو كەسە .
یەكەم : ( التقرب ) مەبەست لە خۆنزیك خستنەوە ، ئەوەیە كە بە تەما بێت كە زیانێكی لێ لابدات ، یا سودێكی پێ بگەیەنێت ، واتە :سەربڕینەكە بۆ ئەوە دەكات كە سودێكی پێ بگەیەنێ یان زیانێكی لێ لابدات ، جا دونیایی بێت یا قیامەتی.
دووەم : (التعظیم ) بۆ بە گەورە زانین، واتە لە دڵەوە بە گەورەی بزانێت، ئەمەش هانی بدات لەبەر خاتری ئەو، ئەو سەربڕینە ئەنجام بدات .

<u>سەربڕین بۆ غەیری خودا</u> چەند شێوازێ دەگرێتەوە لەوانە :

---

26 ضعيف مرفوعا . صحيح موقوفا . رواه أحمد في الزهد موقوفا عن السلمان الفارسي بسند صحيح .

1.سەربڕین و قوربانی کردن بۆ جن بۆ ئەوەی خراپەت لە گەڵ نەکەن، یا لە کارێکدا کۆمەکیت بکەن، وەك بەتاڵکردنەوەی سیحر، بەمەش دەبیتە موشریکی شیرکی گەورە.

2. قوربانی کردن دوای تەواو کردنی خانوو یا بینایەك یا هەر پرۆژەیەك. بۆ سەلامەت بوون لە دەست جن یا چاوی پیس.

3. قوربانی کردن بۆ مردوو یا ئەولیاکان، لەبەر گەورەیی ئەوان یا بۆ ئەوەی سودێکی پێ بگەیەنن چ لە دونیادا بێت یا لە ئاخیرەتدا . بەڵام قوربانی کردن بۆ مردوو بۆ ئەوەی خێرەکەی بگات بە مردووەکە ئەمەیان تەواوە و شەرعیە .

4. سەربڕین و قوربانی کردن بۆ گەورەو کاربەدەستان، لەبەر ئەوەی کە گەورەن . یان بۆ ئەوە بێت خۆی لێیان نزیك بکاتەوە، بۆ ئەوەی شتێکت پێ بدەن وەك ماڵ و مەنصەب، ئەمە شیرکی گەورەیە.

شێوازەکەشی ئەوەیە ئاژەڵەکە دەهێنن و ڕایدەگرن، هەتا زەلامەکە پەیدا دەبێت، هەر کە گەیشتە ئەو شوێنە یا دەرگاکە یا هۆڵەکە ،یا لەگەڵ هاتن یا پەیدا بونیدا، سەری دەبڕن .

نیشانەی ئەم کارەش ئەوەیە، لەبەر چاویدا سەری دەبڕن، لە دوای ئەوە گرنگ نیە گۆشتەکەی چی بە سەر دێ ، گرنگ ئەوەیە کە بزانرێت بۆ ئەوانە . بەڵام ئەگەر لە شوێنێکی دیکەدا سەری ببڕن و، گۆشتەکەی بهێنن بۆ میوانداری، ئەمە لە ئەصڵدا جائیزە.

5. قوربانی کردن لەیادی مەلودا، وەك یادی لە دایك بوونی پێغەمبەر ﷺ ، و ئەولیاکان، ئەگەر لەبەر خاتری گەورەیی ئەوان قوربانیەکە بکرێت . ئەمە شیرکی گەورەیە .

6. سەربڕین، بە ناوی غەیری خوداوە، شیرکی گەورەیە .

فیه مسائل: الأولى: تفسير ﴿إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي﴾.

الثانية: تفسير ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾. الثالثة: البداءة بلعنة من ذبح لغير الله.

الرابعة: لعن من لعن والديه، ومنه أن تلعن والدي الرجل فيلعن والديك.

الخامسة: لعن من آوى محدثاً وهو الرجل يحدث شيئاً يجب فيه حق لله فيلتجيء إلى من يجيره من ذلك.

السادسة: لعن من غير منار الأرض، وهي المراسيم التي تفرق بين حقك في الأرض وحق جارك، فتغيرها بتقديم أو تأخير.
السابعة: الفرق بين لعن المعيّن، ولعن أهل المعاصي على سبيل العموم.
الثامنة: هذه القصة العظيمة، وهي قصة الذباب.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1-تەفسیری (إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي). 2- تەفسیری ﴿فصل لربك..﴾

3- لە چوار لەعنەتەکەدا. یەکەمجار لەعنەت لەو کەسە کراوە کە گیانلەبەرێ بۆ غەیری خودا سەر دەبڕێ یا دەیکات بە قوربانی .

4- لەعنەت کردن لەو کەسەی کە لەعنەت لەدایك وبابی خۆی دەکات ئەوەش دەگرێتەوە کە لەعنەت لە دایك وبابی یەکێ بکەیت ئەویش لەعنەت لە دایك و بابی خۆت بکاتەوە .

5- لەعنەت لەو کەسەی کە تاوەنبارێ پەنادەدات ، مەبەست ئەو تاوانبارەیە کە کارێکی خراپ ئەنجام دەدات وحەقی خودای دەکەوێتە سەر و پەنا دەباتە بەر کەسێك کە نەهێڵێت ئەو حەقەی لێ بکرێتەوە .

6- لەعنەت کردن لە هەر کەسێ کە سنوری زەوی دەگۆرێت ئەمەش ئەو نیشانانەیە کە حەقی نێوان خۆت و دراوسێکەت جودا دەکاتەوە.تۆش بڕۆیت بە پێش خستنی یا بە دواخستنی بیگۆڕیت .

7- فەرق هەیە لە نێوان لەعنەت کردنی تایبەت یابڵێین تاك بە تاك، لە گەڵ لەعنەت کردن لە خەڵکانی تاوانبار بە شێوەیەکی گشتی .

التاسعة: كونه دخل النار بسبب ذلك الذباب الذي لم يقصده، بل فعله تخلصاً من شرهم.
العاشرة: معرفة قدر الشرك في قلوب المؤمنين، كيف صبر ذلك على القتل، ولم يوافقهم على طلبتهم، مع كونهم لم يطلبوا منه إلا العمل الظاهر.
الحادية عشرة: أن الذي دخل النار مسلم، لأنه لو كان كافراً لم يقل: (دخل النار في ذباب).

الثانية عشرة: فيه شاهد للحديث الصحيح (الجنة أقرب إلى أحدكم من شراك نعله، والنار مثل ذلك).

الثالثة عشرة: معرفة أن عمل القلب هو المقصود الأعظم حتى عند عبدة الأوثان.

---

8- ئەم داستانە گەورەیە کە داستانی مێشەکەیە .

9- ئەو پیاوە به هۆی ئەو مێشەوە چوە ئاگرەوە کە مەبەستی ئەوە نەبووە بیکات بە قوربانی. بەڵکو بۆ ئەوەی کرد کە لە دەستیان نەجاتی بێت .

10- تێگەیشتن لە ترسناکی شیرك لە دڵی ئیمانداراندا . چۆن ئەو مەردە لە بەرامبەر کوشتندا ئارامی گرت و نەچوە سەر داواکەی ئەوان لە گەڵ ئەوەشدا تەنها داوای کارێکی ڕووکەشیان لێکردبوو !

11- ئەو کەسەی کە چووە ئاگرەوە موسڵمان بوو. چونکە ئەگەر موسڵمان نەبوایە نەیدەفەرموو بە هۆی مێشێکەوە چووە ئاگرەوە .

12- ئەم داستانە شاهیدە بۆ ئەو حەدیسە کە دەفەرمویٚ : (بەهەشت لە هەر کامتانەوە لە پە تی نەعلەکەی نزیکترە ،هەر وەها ئاگریش ).

13- شارەزا بوون لەوەی کە کردەوەی دڵ گەورەترین مەبەستە تەنانەت لای بت پەرستانیش هەر وایە .

## 10- باب لا يذبح لله بمكان يذبح فيه لغير الله

وقول الله تعالى: ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا .... ﴾ الآية ﴿التوبه : 108 ﴾

**27**– عن ثابت بن الضحاك رضي الله عنه، قال: نذر رجل أن ينحر إبلاً ببوانة، فسأله النبي ﷺ فقال: (هل كان فيها وثن من أوثان الجاهلية يعبد)؟ قالوا: لا. قال: (فهل كان فيها عيد من أعيادهم)؟ قالوا: لا. فقال رسول الله ﷺ: (أوف بنذرك، فإنه لا وفاء لنذر في معصية الله، ولا فيما لا يملك ابن آدم) [رواه أبو داود، وإسنادها على شرطهما].

---

## بابی10

# نابێت لە شوێنێکدا قوربانی و سەر بڕین بکرێت کە لەوێدا قوربانی و سەربڕینی تێدا بکرێت بۆ غەیری خودا

**دانەر دەیەوێت ئەوە ڕوون بکاتەوە کە شوێنەکانی گوناھ کردن و شوێنەکانی شیرك و کوفر نابێت هیچ جۆرە عیبادەتێکی تێدا بکرێت .**

﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًاۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ التوبة

**واتە :( ئەی پێغەمبەر هەرگیز لەومزگەوتەدا نوێژمەکە کە مونافیقەکان دروستیان کردووە، بە تەئکید مزگەوتێك کە لەسەر تەقوا و لەخودا ترسان لە ئەوەڵ ڕۆژەوە بنیاد نراوە ئەوە حەقترە نوێژی تێدا بکرێت، لەوێدا پیاوانێك هەن، حەزدەکەن خۆیان پاك بکەنەوە خوداش ئەوکەسانەی خۆش دەوێت کە خۆیان پاك ڕادەگرن )**

27 – ﷺ( **ثابت بن الضحاك** ) **گوتی:(پیاوێك نەزری کرد کە وشترێك لە بوانە سەربڕێ لەو بارەیەوە پرسی بە پێغەمبەر ﷺ کرد ئەویش﴾ سوئالی لە ئەصحابەکان کرد : ئایا لەو شوێنە بتێك لە لە بتەکانی جاهیلی لێ بووە کە پەرسترابێت؟**

فيه مسائل: الأولى: تفسير قوله: (لاَ تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا)

الثانية: أن المعصية قد تؤثر في الأرض، وكذلك الطاعة.

---

27 صحيح . أخرجه أبو داود (3313) والطبراني في الكبير (1341)

الثالثة: رد المسألة المشكلة إلى المسألة البيِّنة ليزول الإشكال.

الرابعة: استفصال المفتي إذا احتاج إلى ذلك.

الخامسة: أن تخصيص البقعة بالنذر لا بأس به إذا خلا من الموانع.

السادسة: المنع منه إذا كان فيه وثن من أوثان الجاهلية ولو بعد زواله.

السابعة: المنع منه إذا كان فيه عيد من أعيادهم ولو بعد زواله.

الثامنة: أنه لا يجوز الوفاء بما نذر في تلك البقعة، لأنه نذر معصية.

التاسعة: الحذر من مشابهة المشركين في أعيادهم ولو لم يقصده.

العاشرة: لا نذر في معصية.        الحادية عشرة: لا نذر لابن آدم فيما لا يملك.

---

**گوتیان : نەخێر . فەرموی : ئایا شوێنی كۆبونەوەی ( سالأنە یا مانگانە یا حەفتانەی) ئەوان نەبووە ؟**

**گوتیان : نەخێر . ئنجا فەرموی: دەی كەواتە، نەزرەكەت بەجێ بهێنە. چونكە نابێت نەزرێك بەجێ بهێنرێت كە بێفەرمانی خودای تێدا بێت . وە نابێت بە شتێ بكرێت كەماڵی خۆی نەبێت﴾**

## مەسەلەكانی ئەم باسە

**1- تەفسیری ئەو ئایەتە ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ﴾**

**2- گوناه و بێفەرمانی خودا كاریگەری لەسەر زەوی بەجێ دەهێڵێت، هەروەها چاكە و تاعەتیش .**

**3- ئەگەر مەسەلەیەكی ئاڵۆزو نادیارهەبوو دەبێ ببرێتەوە پاڵ مەسەلەیەكی ڕۆشن ، بۆئەوەی (إشكال ) ئاڵۆزیەكەی نەمێنێ .**

**4- دەبێت موفتی داوابكات لە سوئالكەر، سوئالەكەی درێژە پێبدات، ئەگەر پێویستی كرد .**

**5- تایبەت كردنی شوێنێك بۆ نەزركردن ، هیچ خراپەیەكی تێدا نیە ئەگەر ڕێگرێك لە پێش نەبوو .**

6- قەدەغەکردنی ئەوجۆرە نەزرە، ئەگەر بتێکی جاهیلەتی تێدا بوو بێت، ئەگەر چی ئەوبتەش لەوەوبەر لادرابێت .

7- قەدەغەکردنی ئەوجۆرە نەزرە، ئەگەر لەوشوێنەدا، کۆبونەوەی (سالانە یا مانگانە یا هەفتانە ) تێدا بووبێت با ئەو عادەتەش لەوشوێنەدا نەهێڵرابێت .

8- دروست نیە لەوشوێنەدا ئەو نەزرە بەجێ بهێنرێت، چونکە ئەو نەزرە دەبێتە نەزری بێفەرمانی و مەعصیەت .

9- ئاگاداربونەوە، لەوەی کەنابێت لاسایی موشریکان بکرێتەوە بە ڕووکەش لە بۆنە و موناسەبەتەکانیاندا، با لە دڵەوە نیەتی ئەوەشی نەبێت .

10- هیچ نەزرێك دروست نیە، کە بێفەرمانی خوداو پێغەمبەری تێدا بێت .

11- نابێت ئینسان نەزری شتێك بکات کە ئەوشتە هی خۆی نەبێت یا دەسەلاتی نەبێت .

**ڕوونکردنەوە**: لە( قرة العیون الموحدین) دا شارح دەڵێت : ( ئەم حەدیسە ئەگەر چی لە بارەی نەزرەوە هاتووە ، بەلام هەموو شتێ دەگرێتەوە کە عیبادەتی خودا بێت، نابێت لەو شوێنە پیسانەدا ئەنجام بدرێن کە کراون بە شوێنی هەر شتێ کە خودا لێی ناڕازی بێت، ئابەمەش حەدیسەکە دەبێتە شاهید بۆ ئەم باسە، دانەریش ڕەحمەتی خودای لێ بێت مەبەستی تەنها قوربانی کردن و سەربڕین نەبووە ، بەڵکو سەر برینی وەك نمونیەك هێناوەتەوە ). تەواو

گوتەی ابن جبرین لە ( السبك الفرید) (وهذه الآیة عامة لكل أماكن الكفر وأماكن النفاق وأماكن الشرك لایجوز أن یتعبد فیها الله فالمكان الذي یقصده المشركون ویذبحون فیه لهذه القبر وهذه البقعة لایقصده المسلم لیذبح فیه )......

واتە: ئەم ئایەتە هەموو شوێنەکانی کوفر و شوێناکانی نیفاق وشوێنەکانی شیرك دەگرێتەوە . کە جائیز نیە پەرستنی خودای تێدا بکرێ جا هەر شوێنێ کە موشریکەکان ڕووی تێدەکەن و بۆی دەچن وئاژەڵی تێدا سەر دەبڕن بۆ

غەیری خودا ، بۆ ئەو قەبرە با بۆ ئەو شوێنە . نابێت موسڵمان بڕوات بۆ ئەو شوێنە بۆ ئەوەی سەربڕین و قوربانی تێدا بکات ..

پاشان دەڵێ: قەدەغە کردنی نوێژ کردن لە مزگەوتی زیراڕدا باشترین نمونەیە بۆ هەموو ئەو شوێنانەی کە موشریك و مونافیقەکان بنیادیان ناوە و سەردانی دەکەن و غەیری خودای تێدا دەپەرستن یان بۆ غەیری خودا دروستی دەکەن . لەبەر ئەوە نابێت نوێژی تێدا بکرێت، وەن ابێت هیچ جۆرە عیبادەتێکی تێدا بکرێت .

**گوتەی عبد الرحمن السعدي**

﴿ ومنها: النهي عن الصلاة في أماكن المعصية، والبعد عنها، وعن قربها.﴾

واتە : ئەو ئایەتە مەعنای ئەوەیە کە نەهی کراوە لە شوێنی گوناه و مەعصیەتا نوێژ بکرێت . دەبێت لێی دوور بکەوینەوە ولە نزیکیشی نەکەوینەوە.

بۆ جوانتر حاڵی بوون لەم مەسەلەیە کتێبی ( إقتضاء صراط المستقيم ) بخوێنەوە.

## 11- باب من الشرك النذر لغير الله

وقول الله تعالى ﴿ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ٧ ﴾ [ الإنسان ]

﴿ وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوۡ نَذَرۡتُم مِّن نَّذۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُهُۥۗ ﴾ البقرة ٢٧٠

**28**- وفي (الصحيح) عن عائشة رضي الله عنها، أن رسول الله ﷺ قال:

(من نذر أن يطيع الله فليطعه، ومن نذر أن يعصي الله فلا يعصه).

فيه مسائل: الأولى: وجوب الوفاء بالنذر.

الثانية: إذا ثبت كونه عبادة لله فصرفه إلى غيره شرك. الثالثة: أن نذر المعصية لا يجوز الوفاء به.

---

## بابی 11 نەزرکردن بۆ غەیری خودا نۆعێکە لە شیرک

خودافەرمویەتی ﴿ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ٧ ﴾ [ الإنسان ]

واتە:( ئەو ئیماندارانە صیفەتیان وابوو وەفایان دەکرد بە هەمووئەو نەزرانە کە بۆ خودایان بڕیاردابووە ، لە گەڵ ئەوەشدا لەو ڕۆژە دەترسان کە بەدی و سەختیەکەی بلاْودەبێتەوە، ئەوپەڕی بلاْوبونەوە )

خودافەرمویەتی

﴿ وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوۡ نَذَرۡتُم مِّن نَّذۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُهُۥۗ ﴾ البقرة: ٢٧٠

واتە :﴿هەرچی جۆرە نەفەقەیەکتان کردووە، وە هەرچی نەزرێ کردوتانە ئەوا بە تەئکید خودا دەیزانێت وئاگادارە﴾

لەم دوو ئایەتە داخودا وەصفی ئەوانەی کردووە کە وەفا دەکەن بە نەزر ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نەزر کردن بۆ خودا عیبادەتە و نەزر کردن بۆ غەیری خودا شیرکە .

28-پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی :( هەرکەس نەزری کرد کە ئیتاعەی خودا بکات، با ئیتاعە ی بکات . وە هەرکەس نەزری کرد کە بێفەرمانی خودا بکات، بابێ فەرمانی نەکات )

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- واجبە نەزر بەجێبهێنرێت .

2- مادام سابت بوو کە نەزرکردن، خودا پەرستیە، کەواتە نەزر بۆ غەیری خودا شیرکە.

3- هەر نەزرێك کە بێ فەرمانی و بێ شەرعی بێت ، نابێت بەجێ بهێنرێت .

روونکردنەوە : زۆر کەس نەزر دەکات بۆ خودا . ئەگەر خودا فلان کاری بۆ بکات ئەمیش فلان کاری خێر دەکات ، ئەمەش هەڵەیە ئەوانە وا دەزانن کە پێویستییەکانیان بە نەزر نەبێت نایەتە دی ، ئەم جۆرە عەقیدەیە حەرامە ، چونکە وا گومان دەبات کە خودا . بەبێ موقابیل شت نابەخشێت . ئەمەش بەد گومانییە بەرانبەر خودا .

---

28 البخاري 6700

## 12- باب من الشرك الاستعاذة بغير الله

وقول الله تعالى: ﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقًا ﴿٦﴾ ﴾ الجن

29- وعن خولة بنت حكيم رضي الله عنها قالت: سمعت رسول الله ﷺ يقول: (من نزل منزلاً فقال: أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق، لم يضره شيء حتى يرحل من منزله ذلك) [رواه مسلم].

---

## بابی12

## پەناگرتن بە غەیری خودا نۆعێکە لە شیرك

خودا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقًا ﴿٦﴾ ﴾ الجن

واتە :﴿ وەبەڕاستی پیاوانێك لە نێو ئینسانەكاندا، پەنایان دەبردە بەر پیاوانێك لە جن، ئەوانیش وایان دەكرد لە ئینسانەكان كە ترس و خۆفیان زیاد بكات و زیرە بكەن ﴾

29-رضي الله عنها خەولەی كچی حەكیم گوتی: گوێبیستی پێغەمبەر ﷺ بووم دەیفەرموو: ( هەر كەسێك لە مەنزلێكدا دابەزی و پاشان( بە دڵ وبە زمان ) گوتی:

( أعوذ بكلمات الله التامات من شرّ ما خلق )

---

29 مسلم (2708) . والترمذي (3433)

واتە :( پەنا دەگرم بە كەلیمە تەواوەكانی خودا ، لە دەست زیان و بەدی هەر دروسكراوێك كە زیان و بەدی تێدا بێت، ئەوا هیچ شتێك زیانی پیٚ ناگەیەنێت ، هەتا ئەو مەنزڵەی بەجیٚ دەهێڵێت ).

رِوونكردنەوە : فەرموی: هیچ شتیٚ زیانی پیٚ ناگەیەنێت، نەیفەرمو توشی هیچ نابێت، واتە : ئەگەر توشی شتێكیش بوو زیانی پیٚ ناگەیەنێت . بشزانە پەنا بردن بە كەلیمە تەواوەكانی خودا شەرعیە چونكە مەخلوق نین بەڵكو صیفەتی خودان .

**فيه مسائل:** الأولى: تفسير آية الجن. الثانية: كونه من الشرك.

الثالثة: الاستدلال على ذلك بالحديث، لأن العلماء استدلوا به على أن كلمات الله غير مخلوقة، قالوا: لأن الاستعاذة بالمخلوق شرك.

الرابعة: فضيلة هذا الدعاء مع اختصاره.

الخامسة: أن كون الشيء يحصل به مصلحة دنيوية من كف شر أو جلب نفع – لا يدل على أنه ليس من شرك.

---

## مەسەلەكانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەكەی سورەتی (الجنّ )

2- پەناگرتن بە غەیری خودا جۆرێكە لە شیرك .

3- حەدیسەكە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی كە باسكرا، چونكە زانایان ئەو حەدیسەیان كردوە بە بەڵگە، كە كەلیمەكانی خودا دروست كراو نین : وتویانە چونكە پەناگرتن بە مەخلوق و دروستكراو شیركە .

4- فەزڵ و پایە بەرزی ئەم دوعایە، لەگەڵ ئەوەشدا كورت و پرِ مەعنایە .

5- هەر شتێك كە سودێكی دونیایی هەبێت، جا بەدی و نارِەحەتی لابدات، یا سود و قازانجێك بهێنێتە ئاراوە، ئەمە نابێتە بەڵگە لە سەر ئەوەی كە ئەو شتە شیرك نەبێت .

روونکردنەوە : پەنا گرتن یا هاوار بردن بۆ مەخلوقات ، لە هەر شتێکدا کە هەر خودا دەتوانێت ، ئەو کارە بکات ئەمە شیرکی گەورەیە . وەك پەناگرتن بە مردوان یا پەناگرتن بە پێغەمبەر بۆ ئەوەی پێویستییەکت بۆ بێنێتە دی یا ناڕەحەتیەکت لە سەر لا بدات . بەڵام پەنا گرتن بە خەڵکی زیندووی ئامادە لە شتێکدا کە لە توانایاندا هەبێت پەنات بدەن ئەمەیان تەواوە .

## 13- باب من الشرك أن يستغيث بغير الله أو يدعو غيره

وقوله تعالى: ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ﴾ يونس

وقوله: ﴿ فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ ﴿١٧﴾ ﴾ الآية العنكبوت

وقوله: ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ الآية

وقوله: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ ﴾ الآية النمل: ٦٢

---

## بابی 13

# هاوار بردن بۆغەیری خودا، یا داوا کردن لە غەیری خودا نۆعێکە لە شیرك

دانەر بۆ سەلماندنی ئەم مەسەلەیە چوار ئایەتی هێناوە .

یەکەم : ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ ﴾ يونس

واتــه : (داوا مەکــه لــه غــەیری خــودا، ئــەوه ســودت پــێ ناگەیــەنێت ئەگــەر بیپەرستی. وه زیانت پێ ناگەیەنێت ئەگەر نەیپەرستی . ئەگەر وات کرد ئەوه تۆ لـه زاڵمانیـت (واتـه: لـه موشـریکانیت )106 وه ئەگـەر خـودا زیانێك بهێنێت بەسەرتدا، وەك نەخۆشی و هەژاری، کەس ناتوانێت لێتی لابدات، جگە لـه خـودا خۆی، وه ئەگەر بیەوێت فەزڵ و چاکەیەکیت پێ بدات، کەس ناتوانێت لێتی لابـدات. کێــی بوێــت لــه مەخلوقاتــەکانی ئــەوا ڕەحمــەتێکی تایبــەتی پــێ دەبەخشێت، وه تەنها ئەو غەفور و ڕەحیمه بۆ هەرکەسێك کە تۆبە بکات) .

دووەم: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ لَكُمۡ رِزۡقٗا فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ العنكبوت

واته :﴿ئەوانەی کە دەیپەرستن وعیبادەتیان بۆ دەکەن جگە لە ألله ، ناتوانن هیچ جۆرە ڕزقێکتان پێ بدەن، مادام خۆشتان ئەمە دەزانن دەی تەنها لای خودا داوای هەموو جۆرە ڕیزقێ بکەن، تەنها ئەو بپەرستن و شەریکی بۆ دامەنێن ، تەنها شوکری خودا بکەن لە سەر نیعمەتەکانی، لە ڕۆژی قیامەت هەر بۆ لای ئەودەگەڕێنەوە﴾

سێیەم :﴿ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَهُمۡ عَن دُعَآئِهِمۡ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءٗ وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾ ﴾ الأحقاف

واته :﴿کێ لەوکەسە گومڕاترە، کە جگە لەخودا لە کەسێکی دیکە داوا دەکات یا دەیپەرستێت ، کە تا ڕۆژی قیامەت جوابی ناداتەوە پەرستراوەکانیش حاڵیان وایـه کـه لـه داواکـردن و پەرستنەکەی ئـەمان بێ ئاگـان، کاتێکیش کـه خـەڵقی حەشـر کـران، ئـەوان دەبـن بـەدوژمنی ئـەمان، بەرانبـەر عیبـادەت و پەرسـتنی ئەمانیش، بەری بوون ودووری خۆیان ڕادەگەیەنن﴾

چوارەم: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكۡشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجۡعَلُكُمۡ خُلَفَآءَ ٱلۡأَرۡضِۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ النمل

واتە :( یان پێم بڵێن کێ هەیە بێت بەهانای کەسێکەوە کە لە تەنگانە و ناڕەحەتیدا بێت، ناڕەحەتی و تەنگانەکەی لە سەر لابدات ، جگە لە ألله : کێ هەیە بەڵا و زەرەر و زیان لابدات ، و کێ هەیە ئێوەی کرد بێت بە جێگرەوەی قەومەکانی پێش خۆتان، و کەسانی دیکەش بکات بە جێگری ئێوە لە دوای نەمانی ئێوە ، جگە لە ألله. ئایا پەرستراوێکی دیکە هەیە کە بتوانێت ئەو کارانە بکات، هەتا ئێوە بڕۆن عیبادەتی بۆ بکەن و بیپەرستن ) .

**30**– وروي الطبراني بإسناده أنه كان في زمن النبي ﷺ منافق يؤذي المؤمنين، فقال بعضهم: قوموا بنا نستغيث برسول الله ﷺ من هذا المنافق. فقال النبي ﷺ: (إنه لا يستغاث بي، وإنما يستغاث بالله عز وجل).

فيه مسائل: الأولى: أن عطف الدعاء على الاستغاثة من عطف العام على الخاص.

الثانية: تفسير قوله: (ولا تدع من دون ا لله ما لا ينفعك ولا يضرك)

الثالثة: أن هذا هو الشرك الأكبر.

الرابعة: أن أصلح الناس لو يفعله إرضاء لغيره صار من الظالمين.

الخامسة : تفسير الآية التي بعدها. السادسة: كون ذلك لا ينفع في الدنيا مع كونه كفراً.

---

30– [30] تەبەڕانی دەگێڕێتەوە کە لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ مونافیقێك هەبوو ئازاری ئیماندارانی دەدا، هەندێکیان گوتیان : باهەستین هاوار بەرین بۆ پێغەمبەر ﷺ لە دەست ئەو مونافیقە، ئەویش لە جوابدا فەرموی : هاوار بۆ من ناهێنرێت، بەڵکو هاوار تەنها بۆ خودا دەبرێت ﴾

---

30 ضعيف الإسناد من أجل إبن لهيعة . رواه الطبراني في المجمع

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- (لە ناونیشانەکەدا) داواکردن لەدوای هاوار بردنەوە هاتووە، هێنانی گشتیە بەدوای تایبەتدا .( واتە : هاوار بۆ بردن جۆرێکە لە داواکردن)

2- تەفسیری ئەو ئایەتە :(ولا تدعوا من دون الله...)

3- تەفسیرەکەی ئەوەیە داوا کردن لە غەیری خودا، شیرکی گەورەیە.

4- باشترین کەس ( کە پەیامبەرە) ئەگەر ئەو کارەبکات، بۆ ئەوەی غەیری خودا ڕازی بکات دەچێتە ڕیزی زاڵمانەوە (واتە دەبێ بە موشریك) بە پێی ئایەتەکەی یەکەم .

6- تەفسیری ئایەتەکەی دوای ئەو واتە : دووم ئایەت .

السابعة: تفسير الآية الثالثة.
الثامنة: أن طلب الرزق لا ينبغي إلا من الله، كما أن الجنة لا تطلب إلا منه.
التاسعة: تفسير الآية الرابعة. العاشرة: أنه لا أضل ممن دعا غير الله.
الحادية عشرة: أنه غافل عن دعاء الداعي لا يدري عنه.
الثانية عشرة: أن تلك الدعوة سبب لبغض المدعو للداعي وعداوته له.
الثالثة عشرة: تسمية تلك الدعوة عبادة للمدعو.
الرابعة عشرة: كفر المدعو بتلك العبادة.
الخامسة عشرة: أن هذه الأمور سبب كونه أضل الناس.
السادسة عشرة: تفسير الآية الخامسة.

---

6- ئەو کارە واتە داواکردن لە غەیری خودا ، لە دونیادا هیچ سودێکی نیە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو کارە کوفرە .

7- تەفسیری ئایەتەکەی سێیەم .

8- ( تەفسیرەکەی بەم جۆرەیە ) نابێت داوای ڕزق و ڕۆزی لە هیچ کەس بکرێت جگە لە أللە، هەروەك چۆن داوای بەهەشت لە کەسێکی دیکە ناکرێت جگە لە الله

9- تەفسیری ئایەتەکەی چوارەم .

10- (تەفسیرە کە بەم جۆرەیە ) هیچ کەس لەو کەسە گومڕاتر نییە کە لە غەیری ﷲ داوادەکات یا غەیری خودا دەپەرستێت .

11- ئەو کەسە کە لێی دەپاڕێنەوە لەغەیری خودا، ئاگاداری ئەودوعاو پاڕانەوە نیە، هیچ یش نازانێت لەبارەی ئەمەوە.

12 – ئەو داوا و پاڕانەوەیە، دەبێتە هۆکارێك کە ئەو کەسەی هاواری بۆ دەبەن و لێی دەپاڕێنەوە، ڕقی لەوکەسە بێت کە لێی دەپاڕێتەوەو هاواری بۆ دەبات، بەڵکو دوژمنایەتیشی بکات.

13- ئەو داواکردن و هاواربردن و هانا بردنە، (لە ئایەتەکەدا) ناوبراوە بە پەرستنی داوا لێکراوەکە.

14- ئەوکەسەی هاوارو هانای بۆ براوە لێی پاڕاونەوە، (لەڕۆژی قیامەتدا ) بەری بوون و دووری خۆی بەرانبەر ئەو عیبادەت و پەرستنە ڕادەگەیەنێت .

15- لەبەر ئەوە، ئەو کەسە دەبێت بە گومڕاترین خەڵکی.

السابعة عشرة: الأمر العجيب وهو إقرار عبدة الأوثان أنه لا يجيب المضطر إلا الله، ولأجل هذا يدعونه في الشدائد مخلصين له الدين.

الثامنة عشرة: حماية المصطفى ﷺ حمى التوحيد والتأدب مع الله عز وجل.

---

16- تەفسیری ئایەتەکەی پێنجەم .

17- (تەفسیرەکەی بەم جۆرەیە ) ئەو کارەیان عەجیبە ئەوەش ئەوەیە کە ئەو بتپەرستانە دان بەوەدا دەنێن کە هیچ کەس ناتوانێت بێت بە هانای هیچ کەسێکەوە کە لە ناڕەحەتیدا بێت جگە لە الله .هەر لەبەر ئەمەشە لە کاتی تەنگانە و سەختیدا، هاوار تەنها بۆ خودا دەبەن و هەر لەو دەپاڕێنەوە هەر ئەو دەپەرستن بەتەنها .

18- پێغەمبەرﷺ سنورەکانی تەوحیدی پاراستوە و ئەصحابەکانی فێر کردووە چۆن ئەدەبێك بنوێنن لە گەڵ خودادا.

14- باب قول الله تعالى: (أَيُشْرِكُونَ مَا لاَ يَخْلُقُ شَيْئاً وَهُمْ يُخْلَقُونَ * وَلاَ يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا) [ الأعراف : 191- 192 ].

وقوله: (وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ) [ فاطر : 13-14 ]

31- وفي (الصحيح) عن أنس قال: شُجَّ النبي ﷺ يوم أحد وكسرت رباعيته، فقال: (كيف يفلح قوم شَجُّوا نبيهم)؟ فنزلت:

(لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ) [ آل عمران : 128 ]

32- وفيه عن ابن عمر رضي الله عنهما أنه سمع رسول الله ﷺ يقول إذا رفع رأسه من الركوع في الركعة الأخيرة من الفجر: (اللهم العن فلاناً وفلاناً) بعدما يقول: (سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد) فأنزل الله تعالى: (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ)

33- وفي رواية: يدعو على صفوان بن أمية، وسهيل بن عمرو والحارث بن هشام، فنزلت (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ)

---

## بابی 14

## ڕوونکردنەوەی بەڵگەکان لەسەر پوچی شەریك دانان بۆ خودا

ئەم باسە ئەوە ڕوون دەکاتەوە بە بەڵگەی عەقڵی کە پەرستنی غەیری خودا ناحەقە ، بە تایبەت پەرستنی پێغەمبەر ﷺ

خودا دەفەرمویێت ﴿ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ ﴾ الأعراف

واتە :﴿چۆن شەریك بۆ خودا دەدەنێن و چۆن کەسانێك دەپەرستن کە بێ توانان ، ئەوانە دوو نیشانەی بێ تواناییان تێدایە :

یەکەم : ئەو کەسانە ناتوانن هیچ شتێ دروست بکەن لەگەڵ ئەوەشدا خۆشیان دروست کراون دووەم : سەڕای ئەوەش ناشتوانن هیچ خراپە وزیانێك لە سەر ئەوانە لابدەن کە پەرستویانن . وە ناشتوانن هیچ خراپە و زیانێك لە خۆشیان لابدەن ﴾.

وە فەرمویەتی ﴿ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾ ﴾ فاطر

واتە :﴿ هەموو ئەوانەش کە ئێوە داوای لێ دەکەن و دەیپەرستن، جگە لە ٱللَّهُ خاوەنی توێکڵی ناوکە خورمایەکیش نین چ جای زیادتر . جا ئەگەر داوایان لێ بکەن گوێیان لە داوا ودوعاکانتان نابێت . ئەگەر گوێشیان لێ بێت، ئەوا جەوابتان نادەنەوە ( واتە ناتوانن هیچتان بۆ بکەن)، لە ڕۆژی قیامەتیشدا، بەرانبەر ئەو شیرك وهاوبەش دانانەی ئێوە خۆیان بەری دەکەن و دوژمنایەتیان بەرانبەر ئێوە را دەگەیەنن، هیچ کەسیش نیە وەك خودا کە خەبیرە خەبەری عاقیبەت و مەصیری کارەکانت پێ ڕابگەیەنێت ﴾

31- [31] ئەنەس رضي الله عنه گوتی( لە ڕۆژی ئوحودا سەر و ڕوخساری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زامدار بوو، دانە چوارینەکانی شکێنرا . ئەویش فەرموی : چۆن قەومێك سەرفراز دەبن کە ڕوخساری پێغەمبەرەکەیان زامدار کردووە ؟ پاشان بەو هۆیەوە ئەو ئایەتە دابەزی { لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ }

واتە:( کاری خودا هیچی بە دەست تۆ نیە )

32- [32] ابن عمر رضي الله عنه گوتی کاتێ پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم سەری لە ڕکوع بەرز دەکردەوە، لە ڕکاتی ئەخیری نوێژی بەیانیدا گوێم لێی دەیفەرموو خودایە لەعنەت بکە لە فلاّن و فلاّن . ئەمەش لە دوای ئەوە بوو کە دەیفەرموو :( سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد) لەبەر ئەوە خودا ئەو ئایەتەی دابەزاند { لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ }

**34**- وفيه عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قام رسول الله صلى الله عليه وسلم حين أنزل عليه:(وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) قال:[ يَا مَعْشَرَ قُرَيْش اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ الله شَيْئاً ، يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ المُطَّلِبِ لاَ أُغْنِي عَنْكَ مِنَ الله شَيْئاً ، يَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ الله لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ الله شَيْئاً ، يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي مِنْ مَالِي مَا شِئْتِ لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ الله شَيْئاً ]

فيه مسائل: الأولى: تفسير الآيتين. الثانية: قصة أحد.

---

33- [33] لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ دوعای دەکردلە ( **صفوان بن أمية**)و( **سهل بن عمرو**) (**الحارث بن هشام**) پاشان بەو هۆیەوە ئەو ئایەتە دابەزی { **لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ** })

---

31 البخاري في كتاب المغازي معلقا ومسلم موصولا (1791)

32 البخاري (4069) الترمذي (3005)

33 البخاري (4070) مرسلا . والترمذي (3004) وأحمد

34–أبوهريره دەڵێت : (کاتێ ئەو ئایەتە دابەزی لە سورەتی شوعەرا کە دەفەرمویٚ ئینزاری قەومە نزیکەکانت بکە ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی دایە بانگەواز و ئینزار کردنی فەرموی :

﴿ئەی کۆمەڵی قورەیش خۆتان بکڕنەوە بە ( ئیمان هێنان ). من ناتوانم هیچ سودێکتان پێ بگەیەنم بەرانبەر خودا ئەی عباس بن عبد المطلب من ناتوانم هیچ سودێکت پێ بگەیەنم بەرانبەر خودا . ئەی صەفیەی پوری پێغەمبەری خودا ، ناتوانم هیچ سودێکت پێ بگەینم بەرانبەر خودا . ئەی فاتیمەی کچی محمد چیت دەوێ لە ماڵ وسامانم لێم داوا بکە ، من ناتوانم هیچ سودێکت پێ بگەیەنم بەرانبەر خودا﴾

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1– تەفسیری هەردوو ئایەتەکە. 2– داستانی ئوحود.

الثالثة: قنوت سيد المرسلين وخلفه سادات الأولياء يؤمنون في الصلاة. الرابعة: أن المدعو عليهم كفار.

الخامسة: أنهم فعلوا أشياء ما فعلها غالب الكفار. منها: شجهم نبيهم وحرصهم على قتله، ومنها: التمثيل بالقتلى مع أنهم بنو عمهم.

السادسة: أنزل الله عليه في ذلك (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ).

السابعة: قوله: (أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ) فتاب عليهم فآمنوا.

الثامنة: القنوت في النوازل.

التاسعة: تسمية المدعو عليهم في الصلاة بأسمائهم وأسماء آبائهم. العاشرة: لعنه المعين في القنوت.

الحادية عشرة: قصته ﷺ لما أنزل عليه: (وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ).

---

34 البخاري (2753) ومسلم (206)

الثانية عشرة: جدّه ﷺ في هذا الأمر، بحيث فعل ما نسب بسببه إلى الجنون، وكذلك لو يفعله مسلم الآن.

---

3- دۆعای قنوتی گەورەی پێغەمبەران ﷺ لە دوای ئەویشەوە ساداتی ئەولیا (کە ئەصحاب بوون ) لە نوێژەکەیاندا ئامینیان دەکرد (واتە نەیانتوانی خۆیان دەرباز بکەن ، ئەی چۆن دەتوانن غەیری خۆیان دەرباز بکەن)

4-ئەوانەی دۆعایان لێکرا کافران بوون.

5- ئەوان کارێکیان کرد بوو کە زۆربەی کافرەکان نەیانکرد بوو: لەوانەش زامدار کردنی پێغەمبەرەکەیان وسور بونیان لە سەر ئەوەی کە بیکوژن لەوانەش شێواندنی لاشەی کوژراوەکانی موسوڵمانان . لە گەڵ ئەوەشدا کە کوڕەمامی خۆیان بوون.

6- لەو بارەیەوە خودا ئەو ئایەتەی دابەزاند.

7- وتەی خودای بڵند :(یان تۆبە یان لێوەردەگرێت، یاسزایان دەدات ) پاشان خودا تۆبەی لێوەرگرتن و ئیمانیشیان هێنا.

8- خوێندنی قنوت لەکاتی نەوازلدا. (واتە لەکاتی هاتنی بەڵایەك لەلایەن کافرانەوە )

9- ناوهێنانی دوعا لێکراوەکان لەنوێژدا بە ناوی خۆیان و باوکیانەوە .

الثالثة عشرة: قوله للأبعد والأقرب: (لا أغني عنك من الله شيئاً) حتى قال: (يا فاطمة بنت محمد لا أغني عنك من الله شيئاً) فإذا صرح ﷺ وهو سيد المرسلين بأنه لا يغني شيئاً عن سيدة نساء العالمين، وآمن الإنسان أنه ﷺ لا يقول إلا الحق، ثم نظر فيما وقع في قلوب خواص الناس الآن. تبين له التوحيد وغربة الدين

---

10- لەعنەت کردن لە کەسانی دیاری کراو لە قنوتدا . شەرعیە (واتە کەسانی کافر)

11- چیرۆکی پێغەمبەر ﷺ کاتێك ئەوئایەتەی بۆ دابەزی کە دەیفەرموو (ئینزاری خزمە نزیکەکانت بکە)

12- جدیـەتی پێغەمبـەر ﷺ لـە دینەكەیـدا، بـە جۆرێـك بـەهۆی ئـەوەی كـە بـە ئەمری خودا هەستا، شێتیان دایە پاڵ.

13- پێغەمبەر ﷺ بە دورترین و نزیكترین كەسی دەگوت:( لەبەرانبەر خودادا هیچ سودێكت پێناگەیەنم ) هەتا فەرموی:(ئەی فاتیمەی كچی محمد لە بەرانبەر خودا دا هیچ سودت پیٚ ناگەیەنم ) جا ئەگەر ئەو كە گەورەی هەموو پێغەمبەرانە ڕایبگەیەنێت : كە ناتوانێت هیچ سودیٚ بگەیەنێت بە گەورەی ئافرەتانی جیهان كە فاتیمەیە. ئینسانیش ئیمانی بەوە هەبێت كە ئەو پێغەمبەرە جگە لە حەق هیچی دیكە ناڵێت . پاشان سەرنج بدات چی لە دڵی كەسانی خەواص و سەردەستەی ئەم خەڵكەدایە .ئەو كاتە بۆی ڕوون دەبێتەوە كە تەوحید چیە و ئەم دینەش چەندە غەریبە .

15- باب قول الله تعالى: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ﴾ سبأ

**35**-وفي (الصحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ إِذَا قَضَى اللَّهُ الْأَمْرَ فِي السَّمَاءِ ضَرَبَتْ الْمَلَائِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ ، كأنه سلسلة على صفوان ينفذهم ذلك. حتى إذا فُزِّع عن قلوبهم قالوا: ماذا قال ربكم؟ قَالَوا {الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ} فَيَسْمَعُهَا مُسْتَرِق السَّمْعِ وَمُسْتَرِق السَّمْعِ هَكَذَا بعضه فوق بعض. وصفه سفيان بكفه فحرفها وبدد بين أصابعه. فيسمع الكلمة فيلقيها إلى من تحته، ثم يلقيها الآخر إلى من تحته، حتى يلقيها عن لسان الساحر أو الكاهن فربما أدركه الشهاب قبل أن يلقيها، وربما

ألقاها قبل أن يدركه، فَيَكْذِبُ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ . فَيُقَالُ : أَلَيْسَ قَدْ قَالَ لَنَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا , كَذَا وَكَذَا ؟ فَيُصَدَّقُ بِتِلْكَ الْكَلِمَةِ . الَّتِي سُمِعَتْ مِنْ السَّمَاءِ )

---

## بابی15 \ ڕوونکردنەوەی بەڵگەکان لە سەر پوچی شەریك دانان بۆ خودا و پەرستنی غەیری ﷲ به تایبەت پەرستنی مەلائیکەت

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ﴾ سبأ

واتە :﴿کاتێ ترسەکە لە دڵی مەلائیکەتەکاندا لادرا ئەو کاتە بە یەکدی دەڵێن پەروەردگارتان چی فەرموو. واتە چ ئەمرێکی داوەو چ قەدەرێکی بڕیار داوە و چ کارێکی تەدبیر کردوە . هەر مەلائیکەتەکان لە بەینی خۆیاندا گوتیان : پەروەردگارمان حەقی وتووە وە ئەو پەڕی بەرزەو و ئەوپەڕی مەزنە هەم خۆی وهەم زات و هەم صیفاتەکانی﴾

35– [35] ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی : (کاتێ خودای گەورە ئەمرێکی فەرموو لە ئاسمان مەلائیکەتەکان باڵەکانیان دەدەن بەیەکدا بۆ دەربڕینی ملکەچییان بۆ وتەکەی خودا . ترسەکەیان لە دەنگی فەرمایشتەکەی خودا وەك ترسی کەسێکە لە زنجیرێك کە بەسەر تاشە بەردێکی صافدا کێش بکرێت . ئەو دەنگە کار دەکاتە سەر دڵی مەلائیکەتەکان و لە ترسا لە هۆش خۆیان دەچن . هەتا ئەو ترس و خەوفە لەسەریان لا دەبرێت ئەو کاتە لە ناو خۆیاندا لە یەکدی دەپرسن : پەروەردگارتان چی فەرموو؟

هەرخۆیان دەڵێن : حەقی فەرموو وە ئەو بەرزو بڵند و مەزنە. ئەو جا فڕێنەری وتە بیسراوەکە گوێبیستی وتەی مەلائیکەتەکان دەبێت . فڕێنەری وتە بیسراوەکە ئاوایە، سوفیان بەلەپی دەستی وەصفی کرد کە چۆن دەچنە سەر یەکدی، پەنجەکانی بلاّو دەکردەوە ودەستەکانی لە سەر یەکدی دادەنا. ئەوەی

---

35 البخاري (4701) و أبو داود 4738

**سەرەوە كە گوێی لە كەلیمەكە دەبێت ، دەیدات بەگوێی ئەوەی ژێر خۆیدا ئنجا ئەویش دەیدات بە ئەوی ژێر خۆی هەتا دەیخەنە سەر زمانی ساحیرێ یا فاڵگرەوەیەك.جا لەوانەیە پێش ئەوەی بیگەیەنێت نەیزەكێ لێی بدات وەیان ئەگەری ئەوەی هەیە بیگەیەنێتە جێ پێش ئەوەی لێی بدات.**

**ئەوەی سەر زەویش صەد درۆی پێوە دەكات.**

**پاشان خەڵكی دەڵێن: ئەرێ فلاْن ڕۆژ ساحیرەكە ئاواو ئاوای نەگوت ( ڕێك واش دەرچوو ) جا بە هۆی ئەو كەلیمەوە كە لە ئاسمان لە دەمی مەلائیكەتەكانەوە بیستراوە , كەسانێك باوەر بە ساحیر وكاهینەكە دەكەن درۆكانیشی بەڕاست دەزانن )**

**36**– وعن النواس بن سمعان رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: "إذا أرادَ الله تعالى أن يُوحِيَ بالأمرِ تَكَلَّمَ بالوَحْي أَخَذَتِ السموات منه رَجْفَةٌ أو قال: رِعْدَةٌ شديدةٌ خوفًا من الله عز وجل؛ فإذا سَمِعَ ذلك أهل السموات صُعِقُوا وخَرُّوا لله سُجَّدًا؛ فيكون أولُ مَنْ يرفع رأسَهُ جبريلُ فيُكلِّمُه اللهُ مِنْ وَحْيِهِ بما أراد، ثم يَمُرُّ جبريل على الملائكة كلما مَرَّ بسماءٍ قال ملائكتُها: ماذا قال ربُّنا يا جبريل ؟ فيقول جبريل: قال الحقَّ وهو العَلِيُّ الكبير؛ فيقولون كلُّهم مِثْلَ ما قال جبريل. فَيَنْتَهِي جبريل بالوحيِ إلى حيثُ أمرَهُ الله عز وجل"

36- [36] نەواس کوڕی سیمعان ﷺ گوتی : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی : (کاتێ خودا ویستی وەحی بنێرێت بە هەر فەرمانێك ئەوا قصە دەکات بە وەحی. ئاسمانەکان لە ترسی خودای گەورە دەکەونە لەرزینێکی توند جا کاتێ خەڵکی ئاسمانەکان گوێیان لە وتەی خودای گەورە دەبێت ، لە هۆش خۆیان دەچن . پاش ئەوەی کە بە ئاگا دێنەوە دەڕۆنە سوجدەوە سەر بەرز ناکەنەوە. هەتا یەکەمیان کە سەری بەرز دەکاتەوە لە سوجدە جبریل دەبێت .ئەو جا خودا قصەی لە گەڵ دەکات بەوەحی ،بە هەرچییەك کە خۆی بیەوێت پاشان جبریل بەلای مەلائیکەتەکاندا تێپەڕ دەبێت هەرجارێ کە تێپەڕ دەبێ بە ئاسمانێکدا مەلائیکەتەکانی ئەو ئاسمانە سوئالی لێ دەکەن ئەی جبریل پەروەردگارمان چی وت و چ ئەمرێکی داوە ؟

جبریلیش وتەکەی خودایان بۆ دەگێڕێتەوە دەڵێت پەروەردگارمان حەقی گوت و ئەو پەڕی بەرز و بڵندە، ئەو پەڕی گەورەو مەزنە. ئەو جا مەلائیکەتەکان هەمویان وەك جبریل چی گوت ئەوانیش دەیڵێنەوە . ئنجا جبریل وەحیەکە دەگەیەنێتە ئەو شوێنەی کە خودای گەورە ئەمری پێداوە ) تەواو.

فيه مسائل: الأولى: تفسير الآية.

الثانية: ما فيها من الحجة على إبطال الشرك، خصوصاً من تعلق على الصالحين، وهي الآية التي قيل: إنها تقطع عروق شجرة الشرك من القلب.

الثالثة: تفسير قوله: ﴿رَبُّكُمْ قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾.

الرابعة: سبب سؤالهم عن ذلك.

---

36 ضعيف . أخرجه ابن أبي حاتم في التفسير وابن الجرير في التفسير والآجري في الشريعة . ضعّفه الألباني في تخريج السنة

الخامسة: أن جبريل هو الذي يجيبهم بعد ذلك بقوله: (قال كذا وكذا).

السادسة: ذكر أن أول من يرفع رأسه جبريل.

السابعة: أن يقول لأهل السماوات كلهم، لأنهم يسألونه.

الثامنة: أن الغشي يعم أهل السماوات كلهم. التاسعة: ارتجاف السماوات لكلام الله. العاشرة: أن جبريل هو الذي ينتهي بالوحي إلى حيث أمره الله.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکە .

2- ئەو ئایەتە ( واتە هەر دوو ئایەتی 22و23 ی سورەتی سبأ ) بەڵگەی تەواوی ئەوەی تێدایە کە گشت جۆرەکانی شەریك دانان بۆ خودا پوچ و بەتاڵە. بە تایبەت ئەو کەسانەی لە شیرکا خۆیان بەستوە بە پیاوچاکانەوە . ئەوەش ئەو ئایەتەیە کە لە بارەیەوە گوتراوە کە ڕەگی داری گشت جۆرەکنی شیرك لە دڵدا دەپچڕێنێت .

3- تەفسیری قەولی خوداوەند{ قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ }

4- هۆی سوئال کردنیان لەو بارەیەوە (ئەوە بوو کە ترساون خودا ئەمری دابێت بەوەی کە عەزابی ئەمان بدات.)

5- دوای ئەوە جوبرەئیل بەوە جوابیان دەداتەوە کە وتی (پەروەردگار ئاوا وئاوای فەرموو)

6- باسی ئەوە کە جبریل یەکەم مەلائیکەتە کە سەری بەرز دەکاتەوە.

7- جبریل، جوابی ئەهلی هەموو ئاسمانەکان دەداتەوە، چونکە سوئالی لێدەکەن .

8- لە هۆش خۆچون، هەموو ئەهلی ئاسمانەکان دەگرێتەوە .

9- لەرزین و ڕاچەنینی ئاسمانەکان بە توندی بە کەلامی خودا.

10- جوبەئیل وەحیەکە دەگەیەنێتە ئەو شوێنەی کە خودا ئەمری پێداوە .

الحادية عشرة: ذكر استراق الشياطين.

الثانية عشرة: صفة ركوب بعضهم بعضاً. الثالثة عشرة: إرسال الشهب.

الرابعة عشرة: أنه تارة يدركه الشهاب قبل أن يلقيها، وتارة يلقيها في أذن وليه من الإنس قبل أن يدركه.

الخامسة عشرة: كون الكاهن يصدق بعض الأحيان.

السادسة عشرة: كونه يكذب معها مائة كذبة.

السابعة عشرة: أنه لم يصدق كذبه إلا بتلك الكلمة التي سمعت من السماء.

الثامنة عشرة: قبول النفوس للباطل، كيف يتعلقون بواحدة ولا يعتبرون بمائة؟!.

التاسعة عشرة: كونهم يلقي بعضهم إلى بعض تلك الكلمة ويحفظونها ويستدلون بها.

العشرون: إثبات الصفات خلافاً للأشعرية المعطلة.

الحادية والعشرون: التصريح بأن تلك الرجفة والغشي كانا خوفاً من الله عز وجل.

الثانية والعشرون: أنهم يخرون لله سجداً.

---

11- باسی گوێ گرتنی شەیتانەکان بۆ دزینی مەعلومات .

12- چۆنیەتی کەڵەکە بونیان لەسەر یەکدی .   13- بەردانەوەی نەیزەك.

14- ئەو شەیتانە نەیزەکەکە لێی دەدات بەر لەوەی بیگەیەنێت. هەندێك جاریش دەیچرپێنێ بە گوێی دۆستە ئینسانەکەیدا بەر لەوەی لێی بدات .

15- هەندێك جار کاهن و فاڵچی قصەکەیان دێتەدی .

16- لە گەڵ ئەو خەبەرە راستەدا صەد درۆی بۆ زیاد دەکات .

17- بە هۆی ئەو خەبەرە ڕاستەوە کە لە ئاسمان بیسراوە خەڵقی باوەڕ بە قصە درۆکانیشی دەکەن .

18- نەفس حەز لە شتی پوچ و درۆ دەکات سەیری چۆن دڵیان دەبەستنەوە بە یەك قصەی ڕاست و لە صەد درۆ پەند وەرناگرن .

19- بەوەدا دەزانیت کە خەڵکی ئەو کەلیمە ڕاستە دەم بە دەم بڵاو دەکەنەوە لە بەری دەکەن و دەیکەنە بەڵگەی دەستیان .

20- چەسپاندنی صیفاتەکانی خودا ، ئەمەش پێچەوانەی عەقیدەی ئەشعەرییەکانە کە صیفاتەکانی خودا  لە کار دەخەن .

21- بە ڕوونی باسی ئەوە کراوە کە ئەو لەرزین و لەهۆش چونە لە ترسی خودایە (عزّوجلّ)

22- ئەوانە یەکسەر دەڕۆنە سوجدەوە بۆ خودا .

روونکردنەوە : گویٚ گرتنی شەیتانەکان بۆدزینی مەعلومات سیٚ حاڵەتی هەیە:

یەکەم :پیٚش هاتنی پیٚغەمبەر ﷺ ، زۆر بوو .

دووەم : لە ماوەی ڕەوانە کردنی پیٚغەمبەر دا ﷺ ، ئەوشتە نەما

سیٚیەم : لە دوای پیٚغەمبەر ﷺ ، بە کەمی ڕوو دەدات .

## 16- باب الشفاعة

وقول الله تعالى ﴿ وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ٥١ ﴾الأنعام

وقوله: (قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا) وقوله: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾﴿البقرة:255﴾

وقوله: (وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاء وَيَرْضَى) [ النجم : 26 ]

وقوله:﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ [ سبأ : 22 – 23 ].

---

## بابی16 باسی شەفاعەت

لەم باسەدا دانەر دەیەوێت ئەوە ڕوون بکاتەوە کە داواکردنی شەفاعەت لە غەیری خودا شیرکی گەورەیە . بۆ ئەمەش پێنج ئایەتی هێناوە یەکەم :

﴿ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّهِمْ ۙ ﴿٥١﴾ ﴾ الأنعام تا دوایی

واتە: (وە بەم قورئانە ئینزاری ئەوانە بکە کە دەترسن حەشر بکرێن و کۆ بکرێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان (کە لەو ڕۆژەدا هیچ کەس نیە دۆست وتکاکاریان بێت مەگەر بە ئیزنی الله، ئەو ئینزارەش بۆ ئەوەیە لەم دونیایەدا کاریٚ بکەن کە لە عەزابی خودا ڕزگاریان بکات)

دووەم : فەرمویەتی﴿ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا ﴾﴿الزمر :44﴾

واتە : (ئەی پێغەمبەرﷺ بڵیٚ: شەفاعەت کردن هەر هەمووی موڵکی خودایە و حەقی خۆیەتی بەتەنها ) کەواتە : داوای شەفاعەت لە پیاوچاکان و ئەولیاکان مەکەن بەڵکو تەنها لە خودای داوا بکەن .

تکا وشەفاعەتیش بە دوو شەرت لای خودا وەردەگیرێت :

سێیەم ئایەت باسی شەرتی یەکەم دەکات کە ئیزندانە لە لایەن خوداوە و دەفەرمویٚ:

﴿ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾﴿البقرة:255﴾

واتە: (کیٚ هەیە لای خودا شەفاعەت بکات، (واتە: هیچ کەس نیە ) مەگەر کەسێك خودا خۆی ئیزنی پیٚ بدات ).

چوارەم ئایەت باسی شەرتی دووەم دەکات کە رازی بوونی خودایە لە هەردوو لا واتە : لە شەفاعەتکار و شەفاعەت بۆ کراو . دەفەرموێ :

﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ﴾ النجم واتە :( زۆرێك لە مەلائیكەتەكان لە ئاسمانەكان هەن شفاعەتەكەیان هیچ سودی نیە و هەرگیز سودی نابێت ئیلا دوای ئەوەی كە خودا خۆی ئیزن دەدات و ڕازی دەبێت لە هەردوو لا. واتە : لە تكاكار و تكا بۆكراو )

پێنجەم ئەو دوو ئایەتەیە كە گوتمان تەواوی ڕەگەكانی شیرك لە دڵدا دەپچڕێنێت كە فەرمویەتی:

﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥ ﴾ ﴿السبأ﴾

واتە: بلێ بەو موشریكانە : ئادەی بپاڕێنەوە وداوا بكەن لەوانەی كە ئێوە دیعایە دەكەن كە گوایە سود و زیانیان بە دەست بێت جگە لە الله . دەی بزانن :

یەكەم: خۆ ئەوان خاوەنی هیچ نین تەنانەت خاوەنی یەك مسقاڵە زەرەیەك نین ، نە لە ئاسمانەكان و نە لە زەویدا .

دووەم: لە موڵك و سامانی خوداشدا بە هیچ جۆرێ شەریك نین

سێیەم : بە هیچ جۆرێ هاوكارو یاریدەدەری خودا نین

چوارەم : هیچ شەفاعەت و تكایەك لای خودا هیچ سودێكی نییە مەگەر بۆ كەسێ كە خودا خۆی ئیزن بدات كە شەفاعەتی بۆ بكرێت ) مەعنای ئایەتەكە تەواو.

قال أبو العباس: نَفَى عَمَّا سِوَاهُ كُلَّ مَا يَتَعَلَّقُ بِهِ الْمُشْرِكُونَ فَنَفَى أَنْ يَكُونَ لِغَيْرِهِ مُلْكٌ أَوْ قِسْطٌ مِنه أَوْ يَكُونَ عَوْنًا لِلَّهِ وَلَمْ يَبْقَ إلَّا الشَّفَاعَةُ ؛ فَبَيَّنَ أَنَّهَا لَا تَنْفَعُ إلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّبُّ كَمَا قَالَ تَعَالَى {

وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى } فَهَذِهِ " الشَّفَاعَةُ " الَّتِي يَظُنُّهَا الْمُشْرِكُونَ ؛ هِيَ مُنْتَفِيَةٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَمَا نَفَاهَا الْقُرْآنُ .

---

**لەبارەی ئەو ئایەتەوە ابن تیمیة دەڵێت :**

**( هەر چیەك كە موشریكەكان بە تەمای بن وئومێدیان پێی بێت لای خودا، ئەوا خودا ڕەدی داوەتەوە . سەرنج بدە رەدی ئەوەی داوەتەوە كە غەیری خۆی خاوەنی هیچ شتێك بێت. یا بەشێكی هەبێت یان هاوكاری خودا بێت . پاشان هیچ نەما بە دەست ئەو موشریكانەوە تەنها شەفاعەت نەبێت . ئەو جا ڕوونی كردەوە كە شەفاعەتكردن هیچ سودی نیە مەگەر بۆ كەسیٚ كە خودا خۆی ئیزن بدات شەفاعەتی بۆ بكرێت هەر وەك فەرموی** ﴿ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ ﴾ الأنبياء **واتە (شەفەعەت ناكەن مەگەر بۆ كەسێك كە خودا ڕازی بێت لە شەفاعەتكار و شەفاعەت بۆ كراو)**

**جا ئەو جۆرە تكا و شەفاعەتەی كە موشریكان گومان دەبەن سودێكی هەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا بوونی هەر نییە هەر وەك قورئان نەفی كردووە**

**وە پێغەمبەریش ﷺ خەبەری داوە( كە خۆی دێت سوجدە دەبات بۆ پەروەردگاری، سوپاس وستایشی دەكات ) ئەوەتە یەكەم جار دەست ناكات بە شەفاعەت كردن . پاشان پێی دەگوترێت :**

**37**– وأخبر النبي ﷺ أَنَّهُ يَأْتِي فَيَسْجُدُ لِرَبِّهِ وَيَحْمَدُهُ لَا يَبْدَأُ بِالشَّفَاعَةِ أَوَّلًا ، ثم يُقَالُ لَهُ : ارْفَعْ رَأْسَك وَقُلْ تُسْمَعْ وَسَلْ تُعْطَ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ .

**38**– وَقَالَ لَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ : مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِك يا رسول الله ؟ قَالَ : مَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ . فَتِلْكَ " الشَّفَاعَةُ " لِأَهْلِ الْإِخْلَاصِ بِإِذْنِ اللَّهِ لَيْسَتْ لِمَنْ أَشْرَكَ بِاَللَّهِ وَحَقِيقَتُهُ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الَّذِي يَتَفَضَّلُ عَلَى أَهْلِ الْإِخْلَاصِ فيغفر لهم بواسطة دعاء من أذن له أن يشفع، ليكرمه وينال المقام المحمود. فالشفاعة التي نفاها القرآن ما كان فيها شرك، ولهذا أثبت الشفاعة بإذنه في مواضع، وقد بيَّن النبي ﷺ أَنَّهَا لَا تَكُونُ إِلَّا لِأَهْلِ التَّوْحِيدِ وَالْإِخْلَاصِ. انتهى كلامه.

---

37–[37](ئەی محمد سەرت بڵند بکە و قصە بکە دەبیستریێت، داوا بکە پێت دەدریێت، شەفاعەت بکە واتە : تکابکە تکات لێ وەردەگیریێت ).

38–[38](ئەبوهورەیرە سوئالی لە پێغەمبەری خودا کرد ﷺ : کامەرانترین کەس کە بەر شەفاعەتی تۆ دەکەویێت کێیە ؟ فەرموی: هەرکەس لە ناخی دڵەوە بڵێت لاإله إلاّالله وە بە ئیخلاصەوە بیڵێت )

کەواتە ئەو شەفاعەتە بۆ ئەهلی ئیخلاصە (واتە ئەهلی تەوحید ) بە ئیزنی خودا . ئەوە بۆ یەکێ نیە کە شەریکی بۆ خودا دانابێت . حەقیقەت و چۆنیەتیەکەشی ئەوەیە : کە خودا خۆی فەزڵ و چاکەی خۆی دەدات بە سەر ئەهلی ئیخلاصدا بەو جۆرە کە بە هۆی دۆعای کەسێکەوە کە خۆی ئیزنی داوە هەم لە گوناهبارەکە خۆش دەبێت هەم ڕێز لە شەفاعەتکار و تکاکارەکە دەنێت ومەقامی مەحمودی پێ دەبەخشێت .)

فيه مسائل: الأولى: تفسير الآيات. الثانية: صفة الشفاعة المنفية.

---

37 البخاري (4476) ومسلم (193) وأحمد
38 البخاري ( 99) وأحمد

الثالثة: صفة الشفاعة المثبتة.		الرابعة: ذكر الشفاعة الكبرى، وهي المقام المحمود.

الخامسة: صفة ما يفعله ﷺ ، وأنه لا يبدأ بالشفاعة أولاً، بل يسجد، فإذا أذن الله له شفع.

السادسة: من أسعد الناس بها؟.

السابعة: أنها لا تكون لمن أشرك بالله.		الثامنة: بيان حقيقتها.

---

ئەو شەفاعەتەش کە قورئان نەفی کردووە و بەرپەرچی داوەتەوە ئەوەیە کە شیرکی تێدا بێت . هەر لەبەر ئەوەشە کە لە چەندین شوێندا شەفاعەتی چەسپاندووە بە ئیزنی خودا خۆی، ئەڵبەتە پێغەمبەریش ﷺ ڕوونی کردوەتەوە کە ئەو شەفاعەتە بۆ هیچ کەس نیە جگە لە ئەهلی تەوحید و ئیخلاص ) وتەکەی ابن تیمیە تەواو بوو مجموع الفتاوى 7 / 77

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکان.

2-چۆنیەتی ئەو شەفاعەتەی کە بەر پەرچ دراوەتەوە واتە ( نەفی کراوە لە قورئاندا )

3- چۆنیەتی ئەو شەفاعەتەی کە سەلمێنراوە واتە : سابت کراوە. ( تەنها ئەو جۆرەیانە کە دەبیٚ تەنها لە خودا داوا بکرێت )

4- باسی شەفاعەتی گەورە کە مەقامی مەحمودە.

5-چۆنیەتی شەفاعەت کردنی پێغەمبەر ﷺ کە یەکسەر دەست ناکات بە شەفاعەت کردن بەڵکو دەڕواتە سوجدەوە جا کاتیٚ خودا ئیزنی دا شەفاعەت بکات ، ئەو کاتە شەفاعەت دەکات .

6- کامەرانترین کەس بەهۆی شەفاعەتی پێغەمبەرەوەﷺ (تەنها ئەهلی ئیخلاص و تەوحیدە)

7- ئەو شەفاعەتە بۆ کەسێك نیە کە شەریکی بۆ خودا دانابێت

8- ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی و حەقیقەتی ئەو شەفاعەتە .

17- باب قول الله تعالى: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِى مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴾

**39**– وفي (الصحيح) عن ابن المسيب عن أبيه قال: (لما حضرت أبا طالب الوفاة جاءه رسول الله ﷺ وعنده عبد الله بن أبي أمية وأبو جهل، فقال له:

(يا عم، قل: لا إله إلا الله، كلمة أحاج لك بها عند الله) فقالا له: أترغب عن ملة عبد المطلب؟ فأعاد عليه النبي ﷺ ، فأعادا فكان آخر ما قال: هو على ملة عبد المطلب وأبى أن يقول: لا إله إلا الله. فقال النبي ﷺ (لأستغفرن لك ما لم أنه عنك) فأنزل الله عز وجل

(مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ). وأنزل الله في أبي طالب:

(إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاء) [ التوبة : **113** ] .

---

## بابی 17 تەفسیری ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِى مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴾ ﴿القصص :56﴾

**مەبەستی دانەر ئەوەیە کە ڕوونی بکاتەوە کە ئەولیاو پیاو چاکان لە کاری خودادا هیچیان بە دەست نییە . ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِى مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴾ واتە :( تۆ هیدایەتی کەسێ نادەیت کە پێت خۆشە هیدایەت بدرێت ، بەڵکو خودا هەر خۆی هیدایەتی هەر کەسێك دەدات کە خۆی بیەوێت، وە هەر ئەو خۆی زاناترە و دەزانێت کێ شایستەی هیدایەتە ))**

**39 –[39] سەعیدی کوڕی موسەییەب ﵁ دەگێڕێتەوە کە باوکی گوتی: کاتێ مەرگی ئەبو تالب نزیك بوویەوە وە نیشانەکانی مەرگی لێ بەدیار کەوت، پێغەمبەری خودا ﷺ هات بۆ لای لەو کاتەدا عبداللە بن أمیة و ئەبوجەهل لە لای بوون . پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : ئەی مامە بڵێ لاإلـە إلاّالله ، ئەو کەلیمەیە بڵێ منیش لە ڕۆژی قیامەتدا لای خودا دەیکەمە بەڵگەیەك کە سودت پێ بگەیەنێت. ئەبوتالیبیش خەریك بوو بیڵێت . ئەو دوو کەسە زانیان بە گوتنی ئەو کەلیمەیە دەبێت پشت بکات لە دینی باب وباپیرانیان لەبەر ئەوە یەکسەر گوتیان ئایا واز دەهێنیت لە دینی ( عبد المطلب ) ؟**

---

39 البخاري (4772) . مسلم وأحمد

پێغەمبەریش هەمان وتەی خۆی دوبارە کردەوە ئەوانیش هەمان وتەی خۆیان دوبارە کردەوە لەبەر ئەوە ئاخر وتەی ئەبو تاڵب ئەوە بوو کە وتی : خۆم لە سەر دینی (عبد المطلب) م و ملی نەدا کە بێژێت لاإلـه إلاّالله . پێغەمبەریش ﷺ فەرموی :( وەڵاهی هەر داوای لێخۆش بوونت بۆ دەکەم مادام ئەو کارە قەدەغە نەکرێت لێم ) پاشان بەو هۆیەوە خودا ئەو ئایەتەی دابەزاند:

﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ التوبة: ١١٣.

واتاکەی :(شایستە نیەو نابێت پێغەمبەر و ئەوانەش کە ئیمانیان هێناوە داوای لێخۆشبوون بکەن بۆ موشریکان . جا با کەسانی نزیکی خۆشیان بن)

ئەو ئایەتەشی دابەزاند لە بارەی ئەبوتالبەوە کە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴾

فيه مسائل:

الأولى: تفسير قوله: : (إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاء).

الثانية: تفسير قوله: (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ)

الثالثة: وهي المسألة الكبرى تفسير قولهﷺ: (قل: لا إله إلا الله) بخلاف ما عليه من يدعي العلم.

الرابعة: أن أبا جهل ومن معه يعرفون مراد النبي ﷺ إذ قال للرجل: (قل لا إله إلا الله). فقبح الله من أبو جهل أعلم منه بأصل الإسلام.

الخامسة: جدّه ﷺ ومبالغته في إسلام عمه.

السادسة: الرد على من زعم إسلام عبد المطلب وأسلافه.

السابعة: كونه ﷺ استغفر له فلم يغفر له، بل نهي عن ذلك.

الثامنة: مضرة أصحاب السوء على الإنسان. التاسعة: مضرة تعظيم الأسلاف والأكابر.

العاشرة: الشبهة للمبطلين في ذلك، لاستدلال أبي جهل بذلك.

الحادية عشرة: الشاهد لكون الأعمال بالخواتيم، لأنه لو قالها لنفعته.

الثانية عشرة: التأمل في كبر هذه الشبهة في قلوب الضالين، لأن في القصة أنهم لم يجادلوه إلا بها، مع مبالغته ﷺ وتكريره، فلأجل عظمتها ووضوحها عندهم، اقتصروا عليها.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- **تەفسیری** ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِى مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴾

2- **تەفسیری** ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ ﴾

**3- ئەو مەسەلە گەورەیە کە تەفسیری فەرمودەکەیەتی کە بە مامی گوت بڵێ : (لاإله إلاّالله ) ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە کەسانێك لێی حاڵی بوون و خۆشیان بە خاوەنی عیلم دەزانن .**

**4- تەفسیرەکەشی هەر بەو جۆرەیە کە ئەبو جەهل وهاوڕێکانی لێی تێگەیشتن کە مەبەستی پێغەمبەر کە وتی بڵێ (لا إله إلا الله ) واتە : واز هێنان لە دینی باب و باپیران . جا قوڕ بەسەر ئەو کەسەی کە ئەبو جەهل لەو زاناتر بێت لە بارەی ئەصڵی ئیسلامەوە.**

5- جدیەت و سور بونی پێغەمبەر ﷺ لە سەر ئیسلام بوونی مامی .
6- ئەم چیرۆکە ڕەدی ئەو کەسانەیە کە ئیدیعای ئەوە دەکەن کە ( عبد المطلب ) و پێشینە کانی موسڵمان بوو بوون .
7- پێغەمبەر داوای لێخۆشبونی بۆ مامی کرد خودا هەر لێی خۆش نەبوو . سەرەرای ئەوەش قەدەغەی کرد کە ئەو جۆرە دۆعایەی بۆ بکات .
8- زەرەر و زیانی هاوەڵی بەدکار .
9- زەرەرو زیانی بە گەورە دانانی باب وباپیران
10- جاهیلیەت و نەفامی ئەو مەسەلەی ( باب و باپیرانە ) دەکەنە بەڵگەی دەستیان. هەروەك ئەبو جەهل وای کرد .
11- ئەم چیرۆکە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە کاروکردەوە ئەخیرەکەی حسابە بەوەی ئەگەر ئەو کەلیمەی بگوتایە ئەوا سودی پیَ دەگەیاند
12- ووردبونەوە لە گەورەیی ئەو شوبهەیە لە دڵی گومڕاکاندا چونکە لەو چیرۆکەدا بە هیچ شتێ موجادەلەیان لەگەڵ ئەبوتاڵبدا نەکرد تەنها بەوە نەبێت کە (مەسەلەی باب و باپیرانە) .

سەڕای ئەوەش کە پێغەمبەر ﷺ داواکەی چەند بارە کردەوە .جا لەبەر ئەوەی ئەو کەلیمەی **لاإله إلاّالله** یە لای ئەوان زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو تەنها ئەو جوابە مەلعونەیان بە دەستەوە مابوو کە شوێنکەوتنی باب وباپیرانە .

**18**- باب ما جاء أن سبب كفر بني آدم وتركهم دينهم هو الغلو في الصالحين

وقول الله عز وجل: (يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لاَ تَغْلُواْ فِي دِينِكُمْ) [ النساء : 171 ]

**40**–وفي (الصحيح) عن ابن عباس رضي الله عنهما في قول الله تعالى:

(وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا) نوح: 23

قال: (هذه أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نُوحٍ فَلَمَّا هَلَكُوا أَوْحَى الشَّيْطَانُ إِلَى قَوْمِهِمْ أَنْ انْصِبُوا إِلَى مَجَالِسِهِمْ الَّتِي كَانُوا يَجْلِسُونَ فيها أَنْصَابًا وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ فَفَعَلُوا ولَمْ تُعْبَدْ حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولَئِكَ ونسي العلم، عبدت).

---

بابی 18

## هۆی کافر بوونی نەوەی ئادەم و دوور کەوتنەوەیان لە دینەکەیان زیادەڕۆیی کردنە لە مەدح و بەرز کردنەوەی پیاو چاك وصاڵحاندا

﴿يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾ [النساء: 171] :

**واتە :(ئەی ئەهلی کتاب بە هیچ جۆرێ زیادە ڕۆیی مەکەن لە دینەکەتاندا (واتە لە وتە و کردەوەتاندا ) وە جگە لە حەق هیچی دیکە مەڵێن بە ناوی خوداوە ) مەبەستی دانەر لە هێنانەوەی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە نابێت زیادەڕەوی بکرێت لە بارەی پیاو چاکانەوە هەر وەك جولەکەو ونەصرانیکان کردیان**

40- ﷺ **لە صەحیحی بوخاریدا لە بارەی ئەو ئایەتەوە لەسوڕەتی نوحدا** 23 **واتاکەی ( لە گەڵ ئەوەشدا ، گوتیان واز نەهێنن لە پەرستراوەکانتان واز نەهێنن نە لە وود وە نە سواع وە نە یەغوس و یەعوق و نەسریش )**

**لەو بارەوە ابن عباس** رضي الله عنه( **دەڵێت : ئەمانە ناوی پیاوچاکانێ بوون لە ناو قەومی نوحدا** (**دوو چین لە پێش نوحەوە بوون نوحیش لە چینی سێهەمدا ڕەوانە کرا**

---

**40 موقوف أخرجه البخاري** (4920)

)، کاتێ ئەو پیاو چاکانە مردن شەیتان (وەسوەسەی بۆ کردن و) بە قەومەکەیانی گوت : لە شوێنی دانیشتن و کۆبونەوەی ئەو پیاو چاکانە پەیکەریان بۆ دروست بکەن

وقال ابن القيم: قال غير واحد من السلف: لما ماتوا عكفوا على قبورهم ثم صوروا تماثيلهم، ثم طال عليهم الأمد فعبدوهم.

**41**–وعن عمر أن رسول الله ﷺ قال: (لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم، إنما أنا عبد، فقولوا: عبد الله ورسوله) **[أخرجاه]**.

**42**– وقال: قال رسول الله ﷺ: (إياكم والغلو، فإنما أهلك من كان قبلكم الغلو).

**43**– ولمسلم عن ابن مسعود أن رسول الله ﷺ قال: (هلك المتنطعون) قالها ثلاثاً.

---

و پەیکەرەکانیش بە ناوی ئەوانەوە ناو بنێن . ئەوانیش بەو جۆرەیان کرد و نەیان دەپەرستن ، هەتا ئەو چینەی دووەم یا ئەو نەوەیە لە ناو چوون و عیلمەکەش کە عیلمی تەوحیدە لە بیر برایەوە واتە کەس نەما ئاگاداریان کاتەوە کە پەیکەر حەرامە و مانەوە لای پەیکەر حەرامە . سەرەنجام بتەکان پەرستران ) تەواو.

ابن القیم دەڵێت : زۆرێک لە سەلەف وتویانە : کاتێ مردن خەڵکەکە دەچوون لە سەر قەبرەکانیان دەمانەوە پاشان وێنەی بتەکانیان کێشا پاشان زەمانە درێژەی کێشا ، ئەوجا دەستیان دایە پەرستنی پەیکەرەکان )

41– ﷺ عومەری کوڕی خەتاب گوتی: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی:( لە مەدحی مندا زیادە ڕەوی مەکەن، ئەگەرنا وەك نەصرانیەکانتان بە سەر دێ کە لە بارەی عیسای کوڕی مەریەمەوە، زیادە ڕەویان کرد .من تەنها عەبدێکم پێم بڵێن عەبدی خودا و پێغەمبەری خودا ) واتە لەوە زیاتر مەڵێن :

---

**41** البخاري (3445) (6830) مختصرا ومطولا . ومسلم (1691)

42- [شەم] پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : دوور بکەونەوە لە زیادە ڕەوی و ئاگاتان لە خۆتان بێت نەکەونە زیادەڕەویەوە چونکە ( ئوممەتەکانی )پێش ئێوە تەنها بە زیادەڕەوی لەناو چوون ). (ئەمە لە ڕووی عیبادەتەوە)

43- [سێشە] إبن مسعود دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ( لەناو چوون ئەوانەی کە وتە و کردەوەکانیان زۆر قوڵ دەکەنەوە ) سێ جار ئەمەی وتەوە .

فيه مسائل : الأولى: أن من فهم هذا الباب وبابين بعده، تبين له غربة الإسلام، ورأى من قدرة الله وتقليبه للقلوب العجبَ.

الثانية: معرفة أول شرك حدث على وجه الأرض أنه بشبهة الصالحين.

الثالثة: أول شيء غيّر به دين الأنبياء، وما سبب ذلك مع معرفة أن الله أرسلهم.

الرابعة: قبول البدع مع كون الشرائع والفطر تردها.

الخامسة: أن سبب ذلك كله مزج الحق بالباطل، فالأول: محبة الصالحين، والثاني: فعل أناس من أهل العلم والدين شيئاً أرادوا به خيراً، فظن من بعدهم أنهم أرادوا به غيره.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- هەرکەس لەم باسەو دوو باسی دواتر تێبگات، بۆی ڕوون دەبێتەوە کە ئەم ئیسلامە چەندە غەریبە، گەلێ شت دەبینی لە توانای خودا و هەڵگێڕانەوەی دڵان لە لایەن خوداوە، کە مایەی سەرسوڕمانە.

2- ناسینی یەکەم شیرك کە لەسەر زەمیندا پەیدابوە، ئەویش بەهۆی شوبهەی پیاوچاکانەوە پەیدابوە.

3- ئەویش یەکەم شتە کە دینی پێغەمبەرانی پێ گۆڕاوە . وە هۆکاری ئەو گۆڕانکارییە چیە . لە گەڵ ئەوەشدا دەزانین کە خودا ئەو پێغەمبەرانەی رەوانە کردووە

4- قبوڵ کردنی بیدعە (هۆکاری گۆڕانکاریەکەیە ) لە گەڵ ئەوەشدا کە شەریعەتەکان و تەبیعەتی پاکی خەڵکی ڕەدی دەکەنەوە .

---

42 جيد . أخرجه أحمد(1851) وابن ماجة . والنسائي والطبراني في الكبير

43 مسلم (2670) وأبو داود ( 4608)

5- هۆکاری هەموو ئەوانەش (واتە گۆڕینی دینی پێغەمبەران وپەیدا بوونی شیرك ) تێکەڵ کردنی حەقە لە گەڵ ناحەقدا.

یەکەمیان : کە حەقە خۆشویستنی پیاو چاکانە. دووەمیان کە ناحەقە : کەسانێ لە ئەهلی عیلم ، کار و کردەوەیەکیان ئەنجام داوە کە نیاز ونیەتیان چاکە بووە بەڵام ئەوانی دوای خۆیان وا گومانیان بردووە کە نیەتێکی دیکەیان بووبێت .

6- تەفسیری ئایەتەکەی سوڕەتی نوح .

السادسة: تفسير الآية التي في سورة نوح.

السابعة: جبلة الآدمي في كون الحق ينقص في قلبه، والباطل يزيد.

الثامنة: فيه شاهد لما نقل عن السلف أن البدعة سبب الكفر.

التاسعة: معرفة الشيطان بما تؤول إليه البدعة ولو حسن قصد الفاعل.

العاشرة: معرفة القاعدة الكلية، وهي النهي عن الغلو، ومعرفة ما يؤول إليه.

الحادية عشرة: مضرة العكوف على القبر لأجل عمل صالح.

الثانية عشرة: معرفة: النهي عن التماثيل، والحكمة في إزالتها.

الثالثة عشرة: معرفة عظم شأن هذه القصة، وشدة الحاجة إليها مع الغفلة عنها.

الرابعة عشرة: وهي أعجب وأعجب: قراءتهم إياها في كتب التفسير والحديث، ومعرفتهم بمعنى الكلام، وكون الله حال بينهم وبين قلوبهم حتى اعتقدوا أن فعل قوم نوح هو أفضل العبادات، واعتقدوا أن ما نهى الله ورسوله عنه، فهو الكفر المبيح للدم والمال.

---

7- تەبیعەتی ئادەمی لەوەدا کە حەق لە دڵیدا وردە وردە بەرەو کزی دەڕوات وناحەقیش وردە وردە زیاد دەکات .

8- لێرەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە لە سەلەفەوە هاتووە : بیدعە سەبەبی کافر بوونە .

9- شەیتان دەزانێت کە بیدعە سەرەنجامەکەی بەرەو کوێ دەچێت با بکەرەکەیشی نیەتی باش بێت .

10- تێگەیشتن لەو قاعیدە گشتیە کە نەهی کردنە لە زیادە ڕەوی کردن، زانینی سەرەنجامەکەشی کە بەرەو کوێ دەچێت .

11- زەرەری مانەوە لەسەر قەبران بە نیازی کردەوەی چاکە و عیبادەت .

12–زانینی قەدەغەکردنی پەیکەر و حیکمەتی نەهێڵانی.
13–زانینی قەدر و ڕێزی ئەم چیرۆکە . سەرە ڕای ئەوەی کە ئەم چیرۆکە زۆر پێویستە بەڵام زۆربەی خەڵکی لێی بیٚ ئاگان .
14– ئەو چیرۆکە زۆر عەجیبە، لەوە عەجیبتر ئەو موشریکانە ئەو بەسەرهاتە دەخوێننەوە لە کتێبەکانی تەفسیر و حەدیسدا، مەعنای وتەکانیش تێدەگەن . خوداش کارێکی وای بەسەر هێناون دڵیان ناڕوات بە لای ئەوەدا کە بەرژەوەندی

الخامسة عشرة: التصريح أنهم لم يريدوا إلا الشفاعة.

السادسة عشرة: ظنهم أن العلماء الذين صوروا الصور أرادوا ذلك.

السابعة عشرة: البيان العظيم في قوله ﷺ: (لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم) فصلوات الله وسلامه على من بلغ البلاغ المبين.

الثامنة عشرة: نصيحته إيانا بهلاك المتنطعين.

التاسعة عشرة: التصريح بأنها لم تعبد حتى نسي العلم، ففيها بيان معرفة قدر وجوده ومضرة فقده.

العشرون : أن سبب فقد العلم موت العلماء.

---

خوٚیانە، هەتا گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە کاری قەومی نوح باشترین عیبادەتە، پاشان گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە ئەوەی خودا و پێغەمبەرەکەی قەدە غەیان کردوە، ئەوە کوفرێکە ( هەرکەسێك کاری پێبکات یان ڕای بگەیەنێت وەك پێغەمبەر ) ئەوە کافردەبێت و خوێن و ماڵی پیٚ حەڵاڵ دەبێت .
15– ئاشکرا کردنی ئەوەی کە ئەو موشریکانە، تەنها بۆئەوە غەیری خودایان پەرستوە کە شەفاعەتیان بۆ بکەن .
16– گومانیان وابو، کەزاناکانیان ئەو وێنانەیان هەرلەبەر ئەوە دروست کردوە.
17– ئەو ڕوونکردنەوە گەورەیە لە فەرمودەکەدا :
( زیادە ڕەوی مەکەن لە مەدح و ستایشی مندا ، ئەگەرناوەك نەصرانیەکانتان بە سەردا دێت کە زیادە ڕەویان کرد لە مەدح و ستایشی عیسای کوڕی مەریەمدا )

صەلات و سەلام لەسەر ئەو کەسەی کە دینەکەی ڕاگەیاند، ڕاگەیاندنێکی تەواو ڕوون و ئاشکرا.

18- ئامۆژگاری ئێمەی بەوە کردووە کە زیادەڕۆیان بەهیلاکا دەچن .

19- ئاشکرا کردنی ئەوەی کە ئەو پەیکەرانە نەپەرستران هەتا عیلمەکە لە بیر کرا .هەر لەو چیرۆکەدا ڕوون دەبێتەوە کە بوونی عیلمی شەرعی چ ڕێزو قەدرێکی هەیە .بە نەمانیشی چ زیانێکی لێ دەکەوێتەوە .

20- هۆی نەمانی ئەوعیلمە شەرعییە مردنی زانایان بوو .

19- باب ما جاء من التغليظ فيمن عَبَدَ الله عند قبر رجل صالح فكيف إذا عبده

**44** - في (الصحيح) عن عائشة رضي الله عنها أن أم سلمة ذكرت لرسول الله ﷺ كنيسة رأتها في أرض الحبشة وما فيها من الصور. فقال:

(أولئك إذا مات فيهم الرجل الصالح أو العبد الصالح بنوا على قبره مسجداً، وصوروا فيه تلك الصور أولئك شرار الخلق عند الله) فهؤلاء جمعوا بين الفتنتين، فتنة القبور، وفتنة التماثيل.

---

## بابی 19

## بەڵگەی توند وسەخت لە بارەی ئەو کەسەوە کە عیبادەتی خودا بکات لای قەبری پیاو چاکێکدا جا ئەگەر پیاو چاکەکە بپەرستێت دەبێت چۆن بێت ؟

44-[شەش] لە صحیح دا هاتووە ( ئوم سەلەمە ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد کە لە وڵاتی حەبەشە کەنیسیەکی بینیوە، باسی ئەو رەسم و پەیکەرانەشی کرد کە لە کەنیسەکەدا دانرا بوون پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی ئەوانەی کە باست کردن، ئەگەر پیاو چاکێك، یا عەبدێکی صالحیان لێ بمردایە ، لەسەر قەبرەکەی پەرستگایەکیان

---

**44** البخاري (434) ومسلم (528)

دروست دەکرد و ئەو ڕەسم و بتانەشیان بۆ دروست دەکردن ، ئەوانەی (ئەوجۆرە کارانە دەکەن ) خراپترین و بەدترینی مەخلوقاتن لای خودا ) حەدیسەکە تەواو

ئیبنو تەیمییە دەڵێت :(ئەوانە هەردوو فیتنەکەیان بەیەکەوە ئەنجام داوە، فیتنەی قەبران، وە فیتنەی پەیکەرەکان )

45 – عائیشە ﷺ گوتی:( کاتێ پێغەمبەر ﷺ کاتی سەرەمەرگی هات دەستی دایە قوماشێکی خەتخەت و دەیدا بەسەر ڕوخساری خۆیدا، جا کاتێك تەنگە نەفەس دەبوو لایدەدا، بەو حاڵەتەوە دەیفەرموو: (لەعنەتی خودا لە تەواوی جولەکەو نەصرانیەکان (چونکە ) قەبری پێغەمبەرەکانیان دەکردە شوێنی پەرسگاو دوعاکردن) حەدیسەکە تەواو..

**45**– ولهما عنها قالت: (لما نُزل برسول الله ﷺ طفق يطرح خميصة له على وجهه، فإذا اغتم بها كشفها، فقال . وهو كذلك . : ((لعنة الله على اليهود والنصارى، اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد)) يحذر ما صنعوا، ولولا ذلك أبرز قبره، غير أنه خشي أن يتخذ مسجداً، **[أخرجاه]**.

**46**– ولمسلم عن جندب بن عبد الله قال: سمعت النبي ﷺ قبل أن يموت بخمس وهو يقول:

"إِنّي أَبْرَأُ إِلَى اللهِ أَنْ يَكُونَ لِي مِنْكُمْ خَلِيلٌ, فَإِنّ اللهَ قَدِ اتّخَذَنِي خَلِيلاً, كَمَا اتّخَذَ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً, وَلَوْ كُنْتُ مُتّخِذاً مِنْ أُمّتِي خَلِيلاً لاَتّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً. أَلاَ وَإِنّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتّخِذُونَ قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ, أَلاَ فَلاَ تَتّخِذُوا الْقُبُورَ مَسَاجِدَ. إِنّي أَنْهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ"

---

عائیشە دەڵێت :( موسوڵمانانی ئاگادار دەکردەوە نەکەن وەك ئەوان بکەن ئەگەر لە ترسی ئەوەش نەبایە، لە دەشت و لە بەر چاوی خەڵکیدا دفن دەکرا بەڵام لە بەر ئەوەی (پێغەمبەر و هاوەڵانی) ترسان کە قەبرەکەی بکرێتە شوێنی پەرستگا و نوێژ کردن لەبەر ئەوە لەو شوێنەدا دفن کرا )

ڕوونکردنەوە :دانەر ئەم حەدیسەی کردووە بە شاهید کە هەرکەس وەك ئەوان کات ، هەر وەك ئەوان بەر لەعنەت دەکەوێت.

---

**45** البخاري ( 435) ومسلم (531) وقول عائشة (لولا ذلك .....) أخرجه البخاري (1330) ومسلم (529).

46- جوندوب کوڕی عبدالله گوتی ﷺ : گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو ﷺ پێنج شەو یا پێنج ساڵ پێش ئەوەی وەفات بکات دەیفەرموو:

(من خۆم لەوە بەدوور دەگرم کە یەکێك لە ئێوە بکەم بە خەلیلی خۆم , چونکە خودا منی کردووە بە خەلیلی خۆی ، هەر وەك ئیبراهیمی کردووە بە خەلیلی خۆی, وە ئەگەر لەناو ئومەتەکەمدا کەسێکم بکردایە بە خەلیلی خۆم ئەوا ئەبوبەکرم دەکرد بە خەلیلی خۆم . ئاگادار بن ئەوانی بەر لە ئێوە دەهاتن قەبری پێغەمبەرکانیان دەکرد بە پەرستگاو شوێنی نوێژو عیبادەت جا بە تەئکید من ئەوەتان لێ قەدەغە دەکەم) تەواو

فقد نهى عنه في آخر حياته، ثم إنه لعن –وهو في السياق– من فعله ، والصلاة عندها من ذلك، وإن لم يُبْنَ مسجد، وهو معنى قولها: خشي أن يتخذ مسجداً، فإن الصحابة لم يكونوا ليبنوا حول قبره مسجداً، وكل موضع قصدت الصلاة فيه فقد اتخذ مسجداً، بل كل موضع يصلى فيه يسمى مسجداً،

**47**– كما قال ﷺ: جُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِداً وَطَهُوراً

**48**– ولأحمد بسند جيد عن ابن مسعود رضي الله عنه مرفوعاً:

إنَّ مِنْ شِرَارِ الْخَلْقِ مَنْ تُدْرِكُهُمْ السَّاعَةُ وَهُمْ أَحْيَاءٌ، وَالَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْقُبُورَ مَسَاجِدَ

[رواه أبو حاتم في صحيحه].

---

(ابن تیمیه) دەڵێت :(ئەڵبەتە لە ئاخری ژیانیدا نەهی لەو کارە کردووە پاشان لەو حەدیسەدا لەعنەتی لەو کەسانە کردووە کە ئەو کارە دەکەن وە نوێژ کردنیش لە پاڵ گۆڕستاندا هەمان شتە. وە ئەگەر چی بینای مزگەوتیشی لەکن بنیاد نەکرا بێت ئەوەش مەعنای وتەکەی عائیشەیە کە فەرموی : (دەترسا کە بکرێتە سوجدەگا یا پەرستگا) پاشان ئەصحابیش هەرگیز کاری وایان نەدەکرد کە لەدەوری قەبرەکەی مزگەوتێ دروست بکەن (چونکەماڵەکەی لەلای مزگەوتەوە بوو). هەرشوێنێکیش نوێژی لێ بکرێت, ناو دەبرێت بە مزگەوت, هەروەك:

---

46 مسلم باب النهي عن بناء المساجد على القبور (534) / كتاب المساجد.

47–[47] پێغەمبەر ﷺ فەرموی :(زەوی هەموی بۆ من کراوە بە مزگەوت وبە پاککەرەوەش ) وتەکەی ئینو تەیمییە تەواو .

48–[48]( ابن مسعود ) دەگێرێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (جۆرێ لە بەدترینی خەڵکی ئەو کەسانەن کە قیامەتیان بە سەردا دێت ، لە کاتێکدا زیندوون . وە ئەوانەش کە قەبران دەکەنە مزگەوت یان شوێنی عیبادەت )

فيه مسائل:

الأولى: ما ذكر الرسول ﷺ فيمن بنى مسجداً يعبد الله فيه عند قبر رجل صالح، ولو صحت نية الفاعل. الثانية: النهي عن التماثيل، وغلظ الأمر في ذلك.

الثالثة: العبرة في مبالغته ﷺ في ذلك. كيف بيّن لهم هذا أولاً، ثم قبل موته بخمس قال ما قال، ثم لما كان في السياق لم يكتف بما تقدم.

الرابعة: نهيه عن فعله عند قبره قبل أن يوجد القبر.

الخامسة: أنه من سنن اليهود والنصارى في قبور أنبيائهم. السادسة: لعنه إياهم على ذلك. السابعة: أن مراده ﷺ تحذيره إيانا عن قبره.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1– ئەوەی کە پێغەمبەر باسی کرد لە بارەی هەر کەسێکەوەیە . کە مزگەوتێ بینا بکات لە پاڵ قەبری پیاو چاکێکدا وعیبادەتی خودای تێدا بکات ( ئەوە بەر لەعنەتی خودا دەکەوێت) . با ئەو کەسەش نیەتی باش بێت .(چونکە نیەتی باش تەنها لە کارە باشەکاندا دەوری هەیە نەك لە کاری خراپدا)

2– قەدەغە کردنی پەیکەرو توند کردنەوەی ئەمرەکە لەو بارەیەوە .

---

47 البخاري (335) مسلم ( 521) .

48 حسن أخرجه أحمد و الطبراني في الكبير .

3- پەند وەر گرتن لەوەی کە پێغەمبەرﷺ لەو بارەیەوە ئەو پەڕی هەوڵی داوە و تێکۆشاوە . سەیری چۆن ئەوەڵ جار ئەوەی بۆیان ڕوونکردەوە . پاشان پێنج ڕۆژ پێش ئەوەی وەفات بکات ئەوەی فەرموو کە باس کرا ئنجا کە سەرەی مەرگی هات هەر بە فەرموودەکەی پێشتری وازی نەهێنا .

4- نەهی کردن لەو کارە، لەلای قەبرەکەی بەرلەوەی کە قەبریشی هەبێت .

5- ئەو کارە دین و ڕێبازی جولەکە و نەصرانیەکانن، بەرانبەر قەبری پێغەمبەرەکانیان .

6- پێغەمبەر ﷺ ، لەسەر ئەوکارەیان لەعنەتی کردوە لێیان

7- مەبەستی پێغەمبەر ئەوە بوە کە ئێمە ئاگادار بکاتەوە، نەبادا ئێمەش هەمان کار لای قەبرەکەی ئەو ئەنجام بدەین .

الثامنة: العلة في عدم إبراز قبره. التاسعة: في معنى اتخاذها مسجداً.

العاشرة: أنه قرن بين من اتخذها مسجداً وبين من تقوم عليهم الساعة، فذكر الذريعة إلى الشرك قبل وقوعه مع خاتمته.

الحادية عشرة: ذكره في خطبته قبل موته بخمس: الرد على الطائفتين اللتين هما شر أهل البدع، بل أخرجهم بعض السلف من الثنتين والسبعين فرقة، وهم الرافضة والجهمية. وبسبب الرافضة حدث الشرك وعبادة القبور، وهم أول من بنى عليها المساجد.

الثانية عشرة: ما بلي به ﷺ من شدة النزع.

الثالثة عشرة: ما أكرم به من الخلّة. الرابعة عشرة: التصريح بأنها أعلى من المحبة.

الخامسة عشرة: التصريح بأن الصديق أفضل الصحابة. السادسة عشرة: الإشارة إلى خلافته.

---

8- سەبەبی دەرنەخستن و شاردنەوەی قەبرەکەی .

9- لەو مەعنایە وەرگێراوە کە نەکرێت بە شوێنی نوێژ یا مزگەوت یا پەرستگا.

10- ئەو دووشتی بەیەکەوە باسکردوە، یەکەمیان کردنی قەبرە بە پەرستگا ،دوەمیان ئەوانەی قیامەتیان بەسەردا دێت، سەرنج بدە کە پاڵدەرو هاندەری

شیرکی باسکردوە پێش ئەوەی ڕووبدات، لەگەڵ سەرەنجامەکەی کە هاتنی قیامەتە.

11- پێنج ڕۆژ یا پێنج ساڵ بەر لە مردنی لە وتارەکەیدا کە باسی ئەوەی کردوە : ئەوە ڕەدی ئەو دوو کۆمەڵە دەداتەوە کە بەدترینی ئەهلی بیدعەن، بەڵکو هەندێك لە ئەهلی عیلم بە یەکێك لە حەفتا و دوو کۆمەڵکەشیان حساب ناکەن ، ئەوانیش ڕافزە (واتە شیعەو جەهمین)، بە هۆی ڕافزەوە شیرك و قەبر پەرستی سەری هەڵدا هەر ئەوانیش بوون یەکەم جار پەرستگایان لە سەر قەبران دروست کرد.

12- چ بەڵایەکی سەخت بە سەریدا هات، کە سەختی گیان کێشانە .

13- چ ڕێزێکی گەورە نراوە لێی، کە پلەی خەلیلی یە . واتە ئەو پەڕی خۆشەویست.

14- ڕاگەیاندنی ئەوە کە ئەو پلە یە بەرزترە لە پلەی خۆشەویستی .

15- ڕاگەیاندنی ئەوە : کە ئەبوبەکری صدیق لە ناو ئەصحابدا لە هەمویان باشترە

16- ئەوەش ئاماژە دانە بەوەی کە لەدوای خۆی ئەبو بەکر بکرێت بەخەلیفە .

<u>***ڕوونکردنەوە***</u> : بەپێی فیقهی ئەم باسە نابێت هیچ جۆرە عیبادەتێ لە کن هیچ قەبر وقەبرستانێکدا بکرێت جا چ نوێژ بێت یاقورئان خوێندن بێت یا قوربانی کردن . کردنی ئەو کارەش شیرکی بچوکە . ئەمەش چەند وێنەیەکی هەیە :

<u>***یەکەم***</u>: نوێژکردن لای قەبر یا قەبرستان ، ئەو نوێژە دروست نیە واتە : صحیح نییە، لە هەر لایەکی قەبرەکەوە بێت چ لای ڕاستی بێت یالای چەپی یا لە پێشی یا لە دوای،

بەو شەرتەی ئەگەر گوترا (لای قەبرەکە نوێژی کرد). کە گوترا نوێژەکەی دروست نیە واتە: دەبێت نوێژەکەی دوبارە بکاتەوە .

<u>***دووەم:***</u> نوێژکردن لە مزگەوتێکدا بەسەر قەبرەوە یا قەبرستانەوە ، دروست کرابێت. لێرەدا قەبرەکە کۆنە و مزگەوتەکە هاتووە بەسەریدا، نوێژکردن لەم مزگەوتەدا دروست نیە (واتە: بەتاڵە)، بە بەڵگەی ئەو فەرمودانەی کە باس کران، لێرەدا دەبێت مزگەوتەکە تێك بدرێت ( لە لایەن کاربە دەستانەوە )، ئەو

مزگەوتەش لە مزگەوتی زیراڕ دەچێت ، مادام مردووەکان زووتر هاتوونە ئەو شوێنە , دەبێت شوێنەکە بۆ ئەوان بێت . ئیبو تەیمیە دەڵێ: (كَذَلِكَ قَالَ الْعُلَمَاءُ : يَحْرُمُ بِنَاءُ الْمَسَاجِدِ عَلَى الْقُبُورِ وَيَجِبُ هَدْمُ كُلِّ مَسْجِدٍ بُنِيَ عَلَى قَبْرٍ) الفتاوى 17:436

**سێیەم:** نوێژکردن لە مزگەوتێکدا کە قەبری تێدا بێت . مزگەوتەکە لە پێشدا کرابێتەوە، دواتر مردووەکەی تێدا نێژرا بێت . ئەمەیان جێی خیلافە و لەو بارەیەوە دوو قەول هەیە .

یەکەمیان : دەڵێت نوێژەکەی دروست نیە، بە پێی ئەو فەرمودانەی کە باس کران.

دووەمیان: دەڵێت نوێژەکەی صەحیحە واتە : دروستە، لە گەڵ ئەوەشدا گوناهبارەو نوێژەکەی نوقصانە . دیارە کە بەڵگەکانی قەولی یەکەم بە هێزترە، لە مەشدا فەرقی نییە، کە قەبرەکە لای چەپ یا لای ڕاست یا لە پێش یا لە دوای نوێژخوێنەوە بێت، ئەو مردووە دەبێت بگوێزرێتەوە بۆ قەبرستانی موسڵمانان .

20- باب ما جاء أن الغلو في قبور الصالحين يصيرها أوثاناً تعبد من دون الله

49- روى مالك في (الموطأ): أن رسول الله ﷺ قال

{اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلْ قَبْرِي وَثَنًا يُعْبَدُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُ اللَّهِ عَلَى قَوْمٍ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ}

50- ولابن جرير بسنده عن سفيان عن منصور عن مجاهد: (أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى ) ،[ النجم 19] قال: كان يلت لهم السويق فمات فعكفوا على قبره

51- وكذلك قال أبو الجوزاء عن ابن عباس: كان يلت السويق للحاج.

---

## بابی20

## باسی زیادە ڕەوی کردن لەبارەی قەبری پیاوچاکانەوە سەرەنجام دەیانکات بە بت کە جگە لە ﷲ عیبادەتیان بۆبکرێت

دانەر دەیەوێت ڕوونی بکاتەوە : ئەگەر ئێمە زیادە ڕەوی بکەین لە بارەی قەبرانەوە لەو سنورەی دەر بکەین کە شەرع دایناوە ، ئەوا وردە وردە قەبرەکان دەبنە بت و عیبادەتیان بۆ دەکرێت .

**49–رحمه الله ئیمام مالیك ڕیوایەتی كردووە كە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی : (خودایە قەبرەكەم نەكەیت بە بتێك بپەرسترێت... غەزەبی خودا توندە بەسەر قەومێكەوە كە قەبری پێغەمبەرەكانیان كردە، پەرستگا ) .**

**50– رحمه الله(ابن جرير) دەگێڕێتەوە لە بارەی ئەو ئایەتەوە**

**﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ ﴾ موجاهد گوتی :(لات پیاو چاكێك بووە، خورماو ڕۆنی دروست دەكرد و دەیدا بەحاجیانی ماڵی خودا، پاشان كە مرد، دەچوون لەسەر قەبرەكەی دەمانەوە )**

**51– رحمه الله هەروەها (أبوجوزاء ) دەڵێت عبداللە كوڕی عەباس لە بارەی تەفسیری ئەو ئایەتەوە وتویەتی: ( لات پیاوێك بووە خورما و ڕۆنی بە ئاردی جۆوە بۆ حاجیان دروست دەكرد).**

52- وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: لعن رسول الله ﷺ زائرات القبور، والمتخذين عليها المساجد والسرج. [رواه أهل السنن].

فيه مسائل: الأولى: تفسير الأوثان. الثانية: تفسير العبادة.

الثالثة: أنه ﷺ لم يستعذ إلا مما يخاف وقوعه.

الرابعة: قرنه بهذا اتخاذ قبور الأنبياء مساجد. الخامسة: ذكر شدة الغضب من الله. السادسة: وهي من أهمها معرفة صفة عبادة اللات التي هي من أكبر الأوثان.

السابعة: معرفة أنه قبر رجل صالح. الثامنة: أنه اسم صاحب القبر، وذكر معنى التسمية.

التاسعة: لعنه زَوَّارَات القبور. العاشرة: لعنه من أسرجها.

---

**52– رحمه الله ابن عباس رضي الله عنه دەڵێت :( پێغەمبەری خودا ﷺ لەعنەتی كردووە لەو ژنانەی كە سەردانی قەبران دەكەن، ئەوانەش كە پەرستگا و مزگەوتی لەسەر دەكەن، ئەوانەش كە چرا و ڕوناكی لەسەر دادەگیرسێنن ) .**

## مەسەلەكانی ئەم باسە

---

49 جيد .أخرجه المالك في الموطأ (261) وأحمد , صححه أحمد شاكر والألباني .

50 صحيح ، أخرجه ابن جرير في التفسير (3235)

51 البخاري (4859) في التفسير

52 صحيح لغيره دون ذكر السرج قاله أحمد شاكر

1- تەفسیری ( **الأوثــان** ) كە بت و بتپەرستی، قەبر پەرستی و هەرشتێكی دیكەش دەگیرێتەوە  كە بپەرسترێت جگە لە خودا .

2- تەفسیری  پەرستن و عیبادەت .بە پێی ئەوەی كە فەرموی قەبرەكەم مەكەن بە بتێك كە بپەرسترێت

3- پێغەمبەر ﷺ پەنای گرتبێت بە خودا لە دەست هەر شتێك، ئیلا ترساوە كە ئەو شتە بێتە دی .

4- ( لەیەك حەدیسدا ) داوای كردووە كە قەبرەكەی نەكرێتە بتێ بپەرسترێ، لە گەڵ ئەوەشدا باسی ئەوەی كردووە كە قەبری پێغەمبەران كراوە بە پەرستگا.

5- باسی توندی  توڕەیی وغەزەبی خودا .

6- لە هەمووی گرنگتر : تێگەیشتنە لە چۆنیەتی پەرستنی لات كە گەورەترین بت بووە .

7- تێگەیشتن لەوەی كە ئەوە قەبری پیاو چاكێك بووە

8- لات : ناوی خاوەنی قەبرەكە بووە و باسی مەعنای ناوەكەشی كراوە .

9- پێغەمبەرﷺ لەعنەتی كردووە لەو ژنانەی كە زیارەت وسەردانی قەبران دەكەن

10- پێغەمبەرﷺ لەعنەتی كردووە لەو كەسانەی، كە چرا و ڕوناكی لە سەر قەبران دادەگیرسێنن

***__ڕوونكردنەوە__*** (صدیق بن حسن القنوجی) لە كتابی حسن الأسوة دەڵێت ڕاجح ئەوەیە كە سەردانی قەبران لە لایەن ژنانەوە نەهی لێ كراوە . كۆمەڵی ئەهلی حەدیسیش هەروایان گوتووە .

(ابن الفوزان) دەڵێت :( فالقول الصحیح الراجح هو: منع النساء من زیارة القبور،)

واتە :( وتەی ڕاست وڕاجیح ئەوەیە كە ڕێگە نەدراوە بە ئافرەتان سەردانی قەبران بكەن ) ئەمەش ئیختیاری ابن تیمیە وابن قیّم یشە

**21- باب ما جاء في حماية المصطفى ﷺ جناب التوحيد وسده كل طريق يوصل إلى الشرك**

**وقول الله تعالى:** ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾ التوبة

53-عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: **قال رسول الله ﷺ لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا وَلَا تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيدًا وَصَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُ كُنْتُمْ )**

رواه أبو داود بإسناد حسن، ورواته ثقات.

---

## بابی 21 پێغەمبەر ﷺ خودی تەوحیدی پاراستوە هەر ڕێگایەکیش بەرەو شیرك بڕوات دایخستوە

**خودای بڵند فەرمویەتی:**

﴿ لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ ﴾ **التوبة** :128

**واتـه :(سـوێند بـه خـودا، پێغەمبـەرێكتان بۆ هـاتووه كـه لـه خۆتانـه، بەلایـەوه سەختە هەرشتیٚ كه ئێوه بخاتـه ناڕەحەتیـەوه . سوره لەسـەر هیدایـەتی ئێوه و قازانجی ئێوه لـه دونیاو ئاخیرەتدا . تـەنها بەرانبـەر ئیمانداران بـه بەزەیی و بـه ڕەحمه . جا ئەگەر پشتیان لەم شـەریعەته كرد تۆش بڵـیٚ بەسمه خودا پشت و پـەنام بێـت . هـیچ پەرسـتراوێك نیـه بـه حـەق جگـه لـه ئـەو. تـەنها پشـتم بەئـەو بەستوه وه هەر ئەو خاوەنی عەرشی مەزنه )تەواو**

**53–[53]ئـەبو هـوڕەیره دەڵێـت :پێغەمبـەری خـودا ﷺ فـەرموی :(ماڵـەكانتان مەكەن به قەبرسـتان . قەبرەكەشـم مەكـەن بـه شـوێنی كۆبونـەوه و یادەوەری، لـه هەر شوێنێك بوون صەلاواتم له سەر بدەن چونكه صـەلأوات دانـی ئێوه لـه سـەر من لـه هەر كویٚ بن پێم دەگات )**

**54**– وعن علي بن الحسين: أنه رأى رجلاً يجيء إلى فرجة كانت عند قبر النبي ﷺ ، فيدخل فيها فيدعو، فنهاه، وقال: ألا أحدثكم حديثاً سمعته من أبي عن جدي عن رسول الله ﷺ قال: (لا تتخذوا قبري عيداً، ولا بيوتكم قبوراً، وصلوا عليّ فإن تسليمكم يبلغني أين كنتم). [رواه في المختارة].

فيه مسائل: الأولى: تفسير آية براءة.

الثانية: إبعاده أمته عن هذا الحمى غاية البعد. الثالثة: ذكر حرصه علينا ورأفته ورحمته.

---

**54–[54]علی كوڕی حسین ناسراو بـه (زیـن العابدین ) پیاوێكی دەبینـی كـه زوو زوو دەهـات سـەری دەكـرد بـه پـەنجەرەیەكـدا لای قەبرەكـەی پێغەمبـەر ﷺ و دۆعای دەكرد (واتـه : لـه خـودا دەپاڕایـەوه). زیـن العابـدین یـش نـەهی لیٚ كرد و گوتی : ئایا حەدیسێكت بۆ بگێڕمەوه كه باوكم بۆ منـی گێڕاوەتـەوه وه ئـەویش**

---

53 جيد أخرجه أبو داود وأحمد

54 حسن بشواهده أخرجه أبو يعلى في المسند(469) والضياء المقديسي في المختارة (428)

لە باپیرەم عەلی بیستوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: قەبرەکەم مەکەن بە شوێنی کۆبونەوە و یادەوەری، ماڵەکانیشتان مەکەن بە گۆڕستان چونکە ئێوە لە هەر کویێ بن سەلامەکەتان پێم دەگات) تەواو

ڕوونکردنەوە : ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان واتە : بێ بەشی مەکەن لە نوێژە سوننەتەکان و مردووشی تێدا مەنێژن .

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی سوڕەتی بەڕائەت

2- دوورخستنەوەی ئومەتەکەی لەو سنورە، ئەوپەڕی دورخستنەوە .

3- باسی سوربونی ئەو لەسەر قازانجی ئێمە و ڕەحم و بەزەیی ئەو .

الرابعة: نهيه عن زيارة قبره على وجه مخصوص، مع أن زيارته من أفضل الأعمال.

الخامسة: نهيه عن الإكثار من الزيارة. السادسة: حثه على النافلة في البيت.

السابعة: أنه متقرر عندهم أنه لا يصلى في المقبرة.

الثامنة: تعليله ذلك بأن صلاة الرجل وسلامه عليه يبلغه وإن بعد، فلا حاجة إلى ما يتوهمه من أراد القرب.

التاسعة: كونه ﷺ في البرزخ تعرض أعمال أمته في الصلاة والسلام عليه.

---

4- قەدەغەکردنی لەوەی کە بە تایبەتی زیارەتی قەبرەکەی بکرێت لەگەڵ ئەوەشدا زیارەت کردنی (قەبرەکەی) یەکێکە لە کردەوە هەرە باشەکان .

5- قەدەغەکردنی، زۆر زیارەت کردنی قەبرەکەی . (ئەوەش بەوەی کە فەرموی : قەبرەکەم مەکەن بەشوێنی کۆبونەوەو یادەوەری )

6- هاندانی ئومەتەکەی کە نوێژە سونەتەکان لە ماڵەکانیاندا بکەن .

7- ئەوە لای ئەصحابەکان چەسپاو بووە کە نابێت لە گۆڕستاندا نوێژ بکرێت . ( ئەمەش لەوەدا دەر دەکەوێت کە فەرمووی ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان ) .
8- هۆکاری ئەوەی کە فەرمووی زیارەتی قەبرەکەم مەکەن : ئەوەیە کە فەرمووی (لەهەر کوێ بن سەلات و سەلامی ئێوەم پێدەگات ) . کەواتە پێویست بە گومانی کەسانێك ناکات کە دەیانەوێت بڕۆنە نزیکی (بۆ سەلام کردن ) چونکە مەلائیکەت سەلامەکەی دەگەیەنن
9- بوونی پێغەمبەر ﷺ لە بەرزەخدا ( واتە لە بەینی دونیاو قیامەت ) کردەوەی ئومەتەکەی تەنها لەوەدا نیشان دەدرێت، کە سەلات و سەلامی ئەوانی پێدەگات .

**22- باب ما جاء أنّ بعض هذه الأمة يعبدُ الأوثان**

وقول الله تعالى:﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ ﴾[ النساء : 51 ] وقوله تعالى:﴿ قُلۡ هَلۡ أُنَبِّئُكُم بِشَرّٖ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيۡهِ وَجَعَلَ مِنۡهُمُ ٱلۡقِرَدَةَ وَٱلۡخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾

---

## بابی 22

# بەڵگەی قورئان و سوننەت لەسەر ئەوەی کە هەندێك لەم ئومەتە غەیری خودا دەپەرستن

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم باسە دانەر سێ ئایەتی هێناوە :

**یەکەم :** ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ ﴾ **النساء**

**واتە :(تۆ سەیری ئەوانە ناکەیت، کە بەشێك لە کتابیان پێدراوە واتە ( جولەکە و نەصرانیەکان)، ئیمانیان بە جبت (واتە پەرستنی غەیری خودا ) و ئیمانیان بە تاغوت هێناوە، وە لە بارەی کافرانەوە دەڵێن : ڕێبازو دینی ئەوان ڕاسترە و باشترە ، لە ئەوانەی کە ئیمانیان بە ئیسلام هێناوە )**

**دووەم فەرمویەتی:** ﴿ قُلۡ هَلۡ أُنَبِّئُكُم بِشَرّٖ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيۡهِ وَجَعَلَ مِنۡهُمُ ٱلۡقِرَدَةَ وَٱلۡخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾ {**المائدة :60**}

**واتە: ئەی پێغەمبەر بڵێ :( ئایە خەبەرتان پێ بدەم بەوەی کەپاداشتی خراپترە لەوەی کە گومان دەبەن بەسەر ئێمەدا بێت، ئەوانەن کە خودا نەعلەتی لێکردوون وغەزەبی لێگرتون و هەرگیز لێیان ڕازی نابێت، وە خودا هەندێکی لەوان کردە مەیمون و بەراز، و ئەوانەش کە دەستیان دایە تاغوت پەرستی )**

**ئەم ئایەتە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە مادام ئەوان دەستیان دایە تاغوت پەرستی کەواتە هەمان صیفەت لەم ئوممەتەشدا دێتەدی .**

وقوله تعالى: ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا ﴿٢١﴾ ﴾ {**الكهف** }

**55**–عن أبي سعيد رضي الله عنه، أن رسول الله ﷺ قال:

(لتتبعن سنن من كان قبلكم حذو القذّة بالقذّة، حتى لو دخلوا جحر ضب لدخلتموه) قالوا: يا رسول الله، اليهود والنصارى؟ قال: (فمن)؟ أخرجاه،

**56**– ولمسلم عن ثوبان رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: إِنَّ اللَّهَ زَوَى لِي الْأَرْضَ فَرَأَيْتُ مَشَارِقَهَا وَمَغَارِبَهَا، وَإِنَّ أُمَّتِي سَيَبْلُغُ مُلْكُهَا مَا زُوِيَ لِي مِنْهَا، وَأُعْطِيتُ الْكَنْزَيْنِ الْأَحْمَرَ وَالْأَبْيَضَ، وَإِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي لِأُمَّتِي أَنْ لَا يُهْلِكَهَا بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لَا يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ، فَيَسْتَبِيحَ بَيْضَتَهُمْ، وَإِنَّ رَبِّي قَالَ :يَا مُحَمَّدُ إِنِّي إِذَا قَضَيْتُ قَضَاءً، فَإِنَّهُ لَا يُرَدُّ، وَإِنِّي أَعْطَيْتُكَ لِأُمَّتِكَ أَنْ لَا أُهْلِكَهُمْ بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لَا أُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ، يَسْتَبِيحُ بَيْضَتَهُمْ، وَلَوْ اجْتَمَعَ عَلَيْهِمْ مَنْ بِأَقْطَارِهَا حَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يُهْلِكُ بَعْضًا، وَيَسْبِي بَعْضُهُمْ بَعْضًا »

سـێیەم فەرمویـەتی :﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدًا ﴿٢١﴾ ﴾ {الکهـف }
واتـە : (ئەوانـەی کـە سەرپەرشـتی گـۆڕی هاوەڵـانی ئەشـکەوتەکەیان کەوتـە دەسـت (واتە: کاربەدەست و زانا خراپەکان) ، گوتیان : لەسەر گۆڕەکانیان پەرستگا دروست دەکەین ).

کەواتە ئەم ئوممەتەش هەمان کاری ئەوان دووبارە دەکەنەوە .

55 – [55]ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی :( واللە شوێن ڕێگەی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، هەروەك چۆن پەڕی تیرێك لە پەڕەکەی تری دەچێت ( واتە ڕێك وەك ئەوان دەکەن ) ، هەتا ئەگەر ئەوان خۆیان بکەن بە کونی بزنمژەدا، ئەوا ئێوەش خۆتانی پێدا دەکەن، ئەصحاب گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ یەهود و نەصڕانیەکان دەفەرمووی ؟ فەرمووی : ئەی جا کێ ؟

ڕوونکردنەوە : مادام بە بەڵگەی ئایەتەکانی پێشوو زانیمان کە جولەکە و نەصرانیکان دەستیادایە تاغوت پەرستی و بتپەرستی و دروستکردنی پەرستگا لە سەر قەبر ، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە ئەم ئوممەتەش هەمان کاری ئەوان دەکەن . لە هەر ئایەتێکدا کە زەمی ئوممەتەکانی پێشووتر کرابێت ، ئەو کارە خراپانەش هەر هەمووی لەم ئوومەتەدا دێتەدی .

56– [56]سـەوبان ﷺ دەڵێـت : پێغەمبـەری خـودا ﷺ فـەرموی :(خـودا زەوی کۆکردەوە بۆم، منیش شوێنەکانی خۆرهەڵاتـەکانی و خۆرئاوابونـەکانیم بینـی، ئومەتەکەشم موڵك و دەسەڵاتی دەگاتە ئەو شوێنانەی زەوی کە نیشانم دران، وە هەردوو خەزێنە سورو سپیەکەش درا پێم ( کە دەکاتە خەزێنەکانی کیسرا و قەیسەر ئەوە بوو کەوتنە دەست ئوممەتەکەی ) .

داواشم کرد لە پەروەردگارم بۆ ئومەتەکەم ( ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە ) ، کـە بـە سـاڵانی گشـتگیر و ئاسمـانی ( واتـە بـە قاتو قڕی ) لـە ناویـان نـەبات،

---

55 البخاري ( 3456) و مسلم (2669)

56 مسلم (2889)

هـیچ دوژمنێکـیش جگـە لـە خۆیـان (واتـە کـافران ) زاڵ نـەکات بەسـەریاندا و دەست نەگرن بەسەر وڵاتەکانیاندا .

پەروەردگاریش فەرموی:

(ئـەی موحەمـەد کـە فـەرمانی قـەدەرێکم دا، ئـەوا ڕەد کردنـەوەی نییـە، منـیش ئەوەم بەخشی پێت بۆ ئومەتەکەت کە بە ساڵانی گشگیر و ئاسمانی و قاتوقڕی لە ناویان نەبەم، ئەوەشم داپێت کە هیچ دوژمنێکی جگە لەخۆیان زاڵ نەکەم بە سەریاندا و دەست نەگرن بەسەر وڵاتەکانیاندا، ئەگەر چی هەرچی هێزە هەیانە لەسەر زەوی، کۆی بکەنەوە . .

ئەمـەش بـەردەوام دەبێـت بـە شـەرتێ کـۆك بـن . هـەتا ئەوکاتـەی کـە ( لـە شـوێنکەوتنی پێغەمبـەر ﷺ لا دەدەن و هەنـدێکیان هەنـدێکی دیکـەیان لـەناو دەبەن، وە هەندێکیان هەندێکی دیکەیان دەکەنە عەبد و کەنیزەك ) واتـە : ئەو کاتە خودا دوژمن زاڵ دەکات بەسەریاندا)

57- ورواه البرقاني في صحيحه، وزاد: (وإنما أخاف على أمتي الأئمة المضلين، وإذا وقع عليهم السيف لم يرفع إلى يوم القيامة، ولا تقوم الساعة حتى يلحق حي من أمتي بالمشركين، وحتى تعبد فئة من أمتي الأوثان، وإنه سيكون في أمتي كذَّابون ثلاثون، كلهم يزعم أنه نبي، وأنا خاتم النبيين، لا نبي بعدي. ولا تزال طائفة من أمتي على الحق منصورة لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله تبارك وتعالى).

---

57- بورقـانی ئـەم حەدیسـەی ڕیوایـەت کـردوە ، ئـەم زیادەیەشـی لـە گەڵـدا هێناوە:

---

57 صحيح . هذه الزيادة أخرجها أحمد وأبو داود (4252) وابن ماجة (3952)

(وه من تـەنها لـه پێشـەوا و ئیمامـه گومڕاكـەرەكان دەترسـم كـه زیـان لـه ئومەتەكەم بدەن . كاتێكیش جەنگ كەوتە نێوانیانەوە. ئەو جەنگە بەردەوام دەبێت و ڕاناوەستێ هەتا ڕۆژی قیامەت . قیامەتیش نایەت هەتا چەندین قەبیلە و كۆمەڵ (ئەوانەی ئیمانیان هێناوە ) دەڕۆنە ڕیزی موشریكەكانەوە (واتـە: یان خاكی ئیسلام بە جێ دەهێڵن دەڕۆنە خاكی كوفرەوە یان بە كاروكردەوە شەریك بـۆ خـودا دادەنـێن ودەڕۆنـە ڕیـزی ئەوانـەوە ) ، وه هـەتا ژمارەیـەكی زۆر لـه ئومەتەكـەم بت دەپەرستن (واتـه غـەیری خـودا دەپەرستن ). بـه تەئكید لـه ناو ئومەتەكەمدا سی درۆزن پەیدا دەبن. ( واته : ئەوانەی كه دەبن بە خـاوەنی هێـز ودەسـەڵات) هـەموویان ئیـددعای پێغەمبەرایـەتی دەكـەن ، منـیش كۆتـایی پێغەمبەرانم . له دوای منیش هیچ پێغەمبـەرێك نیـه . بەردەوامیش كۆمـەڵێك لـه ئومەتەكەم لەسەر حەق دەمێننەوە، خودا ئەوانە سەركەوتوو دەكات . ئەوانـەش كـه پشـتیان بـەر دەدەن زیانیـان پـێ ناگەیـەنن ( واتـه لـه ڕووی دینـەوە وه ناشتوانن بنبڕیان بكەن ) ئەوانە هەر دەمێننەوە هەتا فەرمانی خودا دێت بۆ ڕۆح كێشانی هەرچی ئیماندارە لە سەر زەویدا ) تەواو

ڕوونكردنـەوە : ئیمامـه گومڕاكـەرەكان واتـە: زانایـانی دیـن و سـەركردە كـان و خوداپەرستەكان ئەوانەی خۆیان گومڕان و خەڵكیش گومڕا دەكەن .

فيه مسائل: الأولى: تفسير آية النساء.

الثانية: تفسير آية المائدة. الثالثة: تفسير آية الكهف.

الرابعة: وهي أهمها: ما معنى الإيمان بالجبت والطاغوت في هذا الموضع؟: هل هو اعتقاد قلب، أو هو موافقة أصحابها مع بغضها ومعرفة بطلانها؟.

الخامسة: قولهم إن الكفار الذين يعرفون كفرهم أهدى سبيلاً من المؤمنين.

السادسة: وهي المقصود بالترجمة – أن هذا لا بد أن يوجد في هذه الأمة، كما تقرر في حديث أبي سعيد.

السابعة: التصريح بوقوعها، أعني عبادة الأوثان في هذه الأمة في جموع كثيرة.

الثامنة : العجب العجاب خروج من يدّعي النبوة، مثل المختار، مع تكلمه بالشهادتين وتصريحه بأنه من هذه الأمة، وأن الرسول حق، وأن القرآن حق وفيه أن محمداً خاتم النبيين، ومع هذا يصدق في هذا كله مع التضاد الواضح. وقد خرج المختار في آخر عصر الصحابة، وتبعه فئام كثيرة.

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی سوڕەتی: النساء

2- تەفسیری ئایەتەکەی سوڕەتی: المائدة

3- تەفسیری ئایەتەکەی سوڕەتی : الكهف

4- لە هەمووی گرنگتر مەعنای ئیمان هێنان بە جبت وتاغوت چیە لەم شوێنەدا ؟ ئایە عەقیدەیە لە دڵدا ؟ یان ئەوەیە کە هاوڕا بێت لە گەڵ جبت و تاغوتا لەگەڵ ئەوەشدا ڕقی لە جبت و تاغوت بێت و بشزانێت کە ناحەقن ؟

5- ئیمان هێنان بە جبت و بە تاغوت ئەوەیە کە وتیان : ئەو کافرانەی کە ئەمان زانیویانە کافرن، ئەوانە زیاتر لە سەر حەقن لە ئیماندارەکان .

6- مەبەستی ناونیشانەکەیە ئەمەیە کە ئەو شتە لەم ئومەتەشدا دێتە دی واتە لە ناو موسڵماناندا هەر وەك لە حەدیسەکەی ئەبو سەعیدا باس کراوە .

7- پێغەمبەر بە ئاشکرا ڕایگەیاندووە کە ئەو کارە . واتە : پەرستنی غەیری خودا لەم ئومەتەدا لە ناو کۆمەڵانێکی زۆردا دێتە دی .

8- ئەم عەجبایەتیە کە زۆر عەجیبە و مایەی سەر سوڕمانە : پەیدا بوونی کەسانێکە کە ئیدعای پێغەمبەرایەتی دەکەن وەك موختاری سەقەفی . لەگەڵ ئەوەشدا شایەتومان بڵێت وڕایبگەیەنێت کە خۆی یەکێکە لەم ئومەتە وە پێغەمبەرمان محمد ﷺ حەقە و قورئانیش حەقە .

التاسعة: البشارة بأن الحق لا يزول بالكلية كما زال فيما مضى، بل لا تزال عليه طائفة.

العاشرة: الآية العظمى أنهم مع قلتهم لا يضرهم من خذلهم ولا من خالفهم.

الحادية عشرة: أن ذلك الشرط إلى قيام الساعة.

الثانية عشرة: ما فيه من الآيات العظيمة، منها: إخباره بأن الله زوى له المشارق والمغارب، وأخبر بمعنى ذلك فوقع كما أخبر، بخلاف الجنوب والشمال، وإخباره بأنه أعطي الكنزين، وإخباره بإجابة دعوته لأمته في الاثنتين، وإخباره بأنه منع الثالثة، وإخباره بوقوع السيف، وأنه لا يرفع إذا وقع، وإخباره بإهلاك بعضهم بعضاً وسبي بعضهم بعضاً، وخوفه على أمته من الأئمة المضلين، وإخباره بظهور المتنبئين في هذه الأمة، وإخباره ببقاء الطائفة المنصورة. وكل هذا وقع كما أخبر، مع أن كل واحدة منها أبعد ما يكون من العقول.

الثالثة عشرة: حصر الخوف على أمته من الأئمة المضلين.

الرابعة عشرة: التنبيه على معنى عبادة الأوثان.

---

لە قورئانیشدا ئەوە هەیە کە محمد کۆتایی پێغەمبەرانە لە گەڵ ئەمانەدا خەڵکی بڕۆن باوەڕی پێ بکەن . لە گەڵ ئەوەدا کە ئەو قسانەی دژ بە یەکن. ئەوە بوو ( **المختار الثقفی** ) لە کۆتایی زەمانی ئەصحابەکاندا پەیدا بوو، کۆمەڵانێکی زۆریش شوێنی کەوتن.

9- ئەم مژدەیە کە ئەم حەقە بە تەواوی لە ناو ناچێت وەك لە پێشوو تردا ( لە پێش ئیسلامدا) نەمابوو. بەڵکو بەردەوام کۆمەڵێك لە سەر حەق هەر دەمێنن

10- ئەو نیشانە گەورەیە : ئەوانە لەگەڵ ئەوەدا کەمینەن، نە ئەوانەی پشتیان بەردەن نە ئەوانەش کە دژایەتیان دەکەن زیانیان پێ ناگەیەنن.

11- ئەو نیشانەیە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت .

12- چەندین نیشانە و ئایەتی مەزن ( لە حەدیسەکەدا )باس کراوە

- لەوانە خەبەری ئەوەی داوە کە خودا خۆرهەلاّ تەکان و خۆرئاواکانی کۆکردوەتەوە بۆی ئەوەشی ڕاگەیاندوە پێمان کە چ مە عنایەکی تێدایە، پاشان ڕێك چۆنی فەرموی هەروا هاتەدی، بە پێچەوانەی جنوب و شیمال
- ڕاشیگەیاند کە هەردوو خەزێنەکەی پێدراوە .
- ڕاشیگەیاند، دوو دوّعای بۆ ئومەتەکەی لێ قبوڵ کراوە .
- ڕاشیگەیاند کە دوعای سێیەمی لێ قبوڵ نەکراوە .
- ڕاشیگەیاند کە جەنگ دەکەوێتە بەینی ئەم ئومەتەوە، هەرکاتێك ئەوە ڕوویدا، ئەوجەنگە هەر بەردەوام دەبێت .
- ڕاشیگەیاند کە ئەم ئومەتە (دەکەونە گیانی یەکتر) هەندێکیان، هەندێکی دیکەیان لەناو دەبەن، وهەندێکیان هەندێکی دیکەیان دەکەن بە کەنیزك و کۆیلە، لەوەش ترساوە کە پێشەوا گومڕاکەرەکان زیان بەم ئومەتە بگەیەنن.
- ڕاشیگەیاند کە کەسانێك سەرهەڵدەدەن، ئیدعای پێغەمبەرایەتی خۆیان دەکەن .

– ڕاشـیگەیاند کـە بـەردەوام کۆمـەڵێك لەسـەر حـەق دەمێننـەوە و هەمیشـە سەرکەوتوو دەبن .

هـەر هـەموو ئەوانـە، بـەدی هـاتن هـەروەك چۆن خەبـەری دابـوو، سـەرەڕای ئـەوە هەریەك لەوانەش زۆر لە ئەقڵەوە دوور بووە کە ڕوو بدەن .

13– تـەنها شـتێك کـە لێـی ترسابێـت ، کـە زیـان بەئومەتەکـەی بگەیـەنێت ئـەو پێشەوایانەن کە خەڵکی گومڕا دەکەن .

14– ئاگادار بونەوە لە مەعنای پەرستنی (**الاوثان** )

ڕوونکردنەوەی ابن الفوزان :

(الذي يمدح الكفر والكفار ولو بلسانه، ويفضّل الكفر والكفار على المؤمنين؛ يُعتبر مؤمناً بالجبت والطاغوت، ولو كان قلبه لا يوافق على هذا؛ ما لم يكن مُكرهاً، ففيه رد على مرجئة هذا العصر الذين يقولون: إن من تكلم بكلام الكفر لا يكفر حتى يعتقد بقلبه صحة ما يقول.وهذه دقيقة عظيمة ذكرها الشَّيخ في المسائل، وهي عظيمة جداً.) إعانة المستفيد

واتە: هەرکەسێ مەدحی کوفر وکافران بکات با بە تەنها سەرزارەکیش بێت . کوفر وکافران بە باشتر دابنێت لە ئیمانداران، ئەوە دادەنرێت بەوەی کە ئیمانی هێناوە بە جبت وبە تاغوت با لە دڵیشەوە لە سەر ئەو ڕایە نەبێت ، مادام زۆری لێ نەکرابێت ، لەمەشـدا ڕەدی موڕجیئـەکانی ئـەم سـەردەمەی تێدایـە کـە دەڵێن : هەر کەسێ وتەیەکی کوفر بڵێت کافر نابێت هەتا بەدڵ باوەڕی بەو وتەیە دەبێت کـە بـە دەم گوتویـەتی . ئەمـەش سـەرنجێکی گەورەیـە کـە شـێخ محمـد لـە مەسەلەکاندا باسی کردوە و ئەو مسەلەیەش زۆر گەورەیە .

## 23– باب ما جاء في السحر

**وقول الله تعالى**:﴿ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖ ﴾

وقوله: (يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ)

**58**– قال عمر: (الجبت): السحر، (والطاغوت): الشيطان.

**59**– وقال جابر: الطواغيت: كهان كان ينزل عليهم الشيطان في كل حي واحد.

60- وعن أبي هريرة (، أن رسول الله ( قَالَ: "اجْتَنِبُوا السّبْعَ الْمُوبِقَاتِ" قالوا: يَا رَسُولَ اللّهِ وَمَا هُنّ؟ قَالَ: "الشّرْكُ بِاللّه. وَالسّحْرُ, وَقَتْلُ النّفْسِ الّتِي حَرّمَ اللّه إِلاّ بِالْحَقّ, وَأَكْلُ الرّبَا, وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ, وَالتّوَلّي يَوْمَ الزّحْفِ, وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ".

---

## بابی23 باسی سیحرو كەهانە

وە تەفسیری ﴿ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ﴾ البقرة: ١٠٢

واتە : (وەڵلاهی بە تأكید، زانیان كە هەركەس سیحر بكڕێت و بیگۆڕێتەوە بەرانبەر دینەكەی (واتە فێری ببێت)، ئەوا لە قیامەتدا هیچ بەشێكی نیە ) .

خودا دەفەرموێ :﴿يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّـٰغُوتِ ﴾ {النساء: 51}

واتە :( ئەوان ئیمانیان بە جبت و تاغوت هێناوە ).

58-[58]عومەری كوڕی خەتاب لە بارەی ئەو ئایەتەوە ﵁ دەڵێت :( جبت : واتە سیحر، تاغوتیش واتە: شەیتانەكان) .

59-[59]جابر ﵁ دەڵێت : ( تاغوتەكان فاڵگرەوەكانن، شەیتانەكانی خۆیان دادەبەزنە سەریان ، لە هەموو خێڵێكدا دانەیەك هەیە).

60- [60]ئەبوهورەیرە گوتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموی :(خۆتان لە حەوت لەناو بەرەكان بە دوور بگرن . گوتیان: ئەی پێغەمبەر ﷺ ) ئەوانە چین ؟ فەرموی

**61**- وعن جندب مرفوعاً: (حد الساحر ضربه بالسيف) رواه الترمذي، وقال: الصحيح أنه موقوف.

**62**- وفي (صحيح البخاري) عن بجالة بن عبدة قال: كتب عمر بن الخطاب: أن اقتلوا كل ساحر وساحرة، قال: فقتلنا ثلاث سواحر.

---

58 حسن لغيره . أخرجه الطبري (9771) وابن أبي حاتم والبغوي وعلقه البخاري بصيغة الجزم

59 صحيح . أخرجه الطبري وابن أبي حاتم و علقه البخاري

60 البخاري ( 2766) مسلم (89) متفق عليه

**63**- وصح عن حفصة رضي الله عنها: أنها أمرت بقتل جارية لها سحرتها، فقتلت، وكذلك صح عن جندب. قال أحمد: عن ثلاثة من أصحاب النبي ﷺ

---

: شەریك دانان بۆ خودا، و سیحر و كوشتنی هەر نەفسێك كە خودا حەرامی كردوە ، مەگەر بە حەق (واتە وەك لە شەرعدا باس كراوە ) وە خواردن و وەرگرتنی سوو، وە خواردنی ماڵی منالی بێ باوك ، وە هەڵهاتن لە جەنگی كافراندا و هەڵبەستنی تاوانی زینا بۆ ئافرەتانی داوێن پاك و بێئاگا و ئیماندار ) تەواو

61- [61] لە جونەیدەوە ڕیوایەت كراوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموی :(سزای ساحیر ئەوەیە كە بە شمشێر لێی بدرێت ) ئەم حەدیسە **الترمذي** ڕیوایەتی كردووە و دەڵێت : صەحیح ئەوەیە كە جندوب خۆی وای گوتوە .

62- [62] بەجالە كوڕی عەبدە ، كە والی عومەر بووە گوتی عومەری كوڕی خەتاب رضي الله عنه نامەیەكی نوسی كە هەرچی ساحیرە بكوژن چ پیاو و چ ژن، بەجالە گوتی : (بە فەرمانی عومەر ) سێ ساحیرمان كوشت .

63- [63] لە حەدیسی صحیح دا هاتووە ( كە حەفصە ئەمری كردوە بە كوشتنی كەنیزەكێكی خۆی كە سیحری لە حەفصە كردبوو، هەر لە بەر ئەوەش كوژرا ) هەروەها لە **حديث صحيح** دا هاتووە كە جوندوب ساحیری كوشتووە .

فيه مسائل:

الأولى: تفسير آية البقرة. الثانية: تفسير آية النساء.

---

61 صحيح موقوفا . ضعيف مرفوعا. أخرجه الترمذي (1460) والطبراني في الكبير

62 البخاري(3151) وأبو داود وأحمد

63 صحيح . أخرجه المالك في الموطأ .

الثالثة: تفسير الجبت والطاغوت، والفرق بينهما.

الرابعة: أن الطاغوت قد يكون من الجن، وقد يكون من الإنس.

الخامسة: معرفة السبع الموبقات المخصوصات بالنهي.

السادسة: أن الساحر يكفر. السابعة: أنه يقتل ولا يستتاب.

الثامنة: وجود هذا في المسلمين على عهد عمر، فكيف بعده؟

---

**أحمد بن حنبل دەڵێت (کوشتنی ساحیر لە لایەن سیٚ ئەصحابەی پێغەمبەرەوە ﷺ بە صەحیحی هاتووە ) واتە: عومەر وحەفصە وجوندوب . (مەبەستی ئەوەیە کە ئیجماعی ئەصحابی لە سەرە )**

## مەسەلەکانی ئەم باسە

**1- تەفسیری ئایەتەکەی البقرة** 102

**2- تەفسیری ئایەتەکەی النساء** 51

**3- تەفسیری جبت و تاغوت وە جیاوازی لە نیٚوانیاندا . بە پیٚی تەفسیری عومەر رضي الله عنه**

**4- تاغوت هەندیٚ جار جنۆکەیە و هەندیٚ جاریش ئینسانە .**

**5- زانینی ئەو حەوت لە ناو بەرە کە بە تایبەتی قەدەغە کراون ونەهیان لێکراوە.**

**6- ساحیر بە کافر دادەنرێت .**

**7- ساحیر دەکوژرێت و داوای تۆبە وپەشیمانی لیٚ ناکرێت .**

**( بەپێی ئیجماعی ئەصحاب )**

**8- ئەو سیحر وجادوە لە ناو موسڵمانان‌دا ولە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا ڕووی داوە ،جا لە دوای ئەوان دەبێت چۆن بێت .**

## 24- باب بيان شيء من أنواع السحر

64- قال أحمد: حدثنا محمد بن جعفر، حدثنا عوف عن حيان بن العلاء، حدثنا قطن بن قبيصة عن أبيه أنه سمع النبي ﷺ قال: (إن العيافة والطرق والطيرة من الجبت).

قال عوف: العيافة: زجر الطير، والطرق: الخط يخط بالأرض والجبت، قال: الحسن: رنة الشيطان. إسناده جيد ولأبي داود والنسائي وابن حبان في صحيحه، المسند منه.

65- وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسول الله ﷺ (من اقتبس شعبة من النجوم، فقد اقتبس شعبة من السحر، زاد ما زاد) [رواه أبو داود] وإسناده صحيح.

66- وللنسائي من حديث أبي هريرة رضي الله عنه: (من عقد عقدة ثم نفث فيها فقد سحر، ومن سحر فقد أشرك، ومن تعلق شيئاً وكل إليه).

---

## بابی 24 ڕوونکردنەوەی بەشێك لە ئەنواعی سیحر

64-[64] ئیمامی ئەحمەد دەگێڕێتەوە کە قەبیصە گوێبیستی پێغەمبەری خودا بوو ﷺ فەرمویەتی :(بە تەئکید هەڵدان یا هەڵفڕاندنی باڵندە وە لێدانی خەتی بەخت و شومی ونەگبەتی، نۆعێکن لە سیحر )

عەوف کە زانایەکی زمانناسی عەرەبیە، دەڵێت ( العیافە ) هەڵفڕاندنی باڵندەیە ( **الطرق** ) ئەوەیە کە لە سەر لم خەتیان دەکێشا بۆ بەخت گرتنەوە .

حەسەن کوڕی عەلی دەڵێت : جبت دەنگی شەیتانە یا شەیتان خۆیەتی .

65- [65] ابن عباس دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی:هەر کەسێ بەشێ لە عیلمی ئەستێرە ناسی فێر ببێت یا وەری بگرێت ئەوە بەشێ لە سیحر فێر بووە یا وەری گرتووە چەندە لەو ئەستێرەناسیە زیاتر فێر بێت ئەوەندە زیاتر لە سیحر فێر بووە ) أبوداود

---

64 حسن .أخرجه أبو داود (3907) وعبد الرزاق (19503) وأحمد وإبن حبان .

65 جيد . أخرجه أبو داود . وأحمد والطبراني في الكبير صححه أحمد شاكر والألباني في السلسلة

**67**- وعن ابن مسعود رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: (ألا هل أنبئكم ما الغضة؟ هي النميمة، القالة بين الناس) [رواه مسلم].

**68**- ولهما عن ابن عمر رضي الله عنهما، ان رسول الله ﷺ قال: (إن من البيان لسحراً).

---

66- [66] **النسائي له حەدیسی ئەبو هوڕەیڕەدا ڕیوایەتی کردووە کە (هەر کەس گرێیەك ببەستێ و پاشان فوی پێدا بکات بە تفەوە . ئەوا سیحری کردووە، هەر کەسێکیش سیحر بکات ئەوا شەریکی بۆ خودا داناوە . وە هەر کەسێ شتێ هەڵبواسێ یا دڵی پابەند بێت بە هەرشتێکەوە بۆئەوەی بەڵایەکی لێ لابدات یا سودی پێبگەیەنێت، ئەوا خودا کاری ڕاست ناهێنێت و دەیداتە دەست ئەو شتەی کە هیچی بەدەست نیە )**

67-[67] **(ابن مسعود) ﷺ دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی :( ئایا پێتان ڕابگەیەنم کە سیحر چیە ؟ سیحر قسە هێنان و قسە بردنە لە نێوان خەڵکیدا )**

68-[68]**بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (بەتەئکید هەندێك لە بەلاغەت و فەصاحەت سیحرە )**

**واتە : کاریگەری خراپ دەکاتە سەر دڵان**

---

**66** ضعيف . أخرجه النسائي (490) والطبراني في الأوسط

**67** مسلم (2606)

**68** البخاري (5146) ومسلم (869)

فيه مسائل:

الأولى: أن العيافة والطرق والطيرة من الجبت. الثانية: تفسير العيافة والطرق.

الثالثة: أن علم النجوم نوع من السحر. الرابعة: أن العقد مع النفث من ذلك.

الخامسة: أن النميمة من ذلك.          السادسة: أن من ذلك بعض الفصاحة

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- هەڵفڕاندنی باڵندە وفاڵ گرتنەوە و بەخت گرتنەوە، وە شومی یا ڕەشبینی نۆعێکە لەسیحر .

2- تەفسیری عیافە و ڕەمل لێدان .

3- ئەستێرەناسی جۆرێکی سیحرە .

4- گرێدان لەگەڵ فووکردندا سیحرە .

5- قسە هێنان و بردن، وتێکدانی بەینی خەڵکی، هەمان شتە.

6- هەندێك فەصاحەت و بەلاغەت سیحرە.

<u>ڕوونکردنەوە</u> (**الطرق**) : نەوعێکە لە فاڵ گرتنەوە، **الطرق** : واتە ڕەمل لێدان، ئەوەبو کە چەندین خەتیان لەناو لمدا بە خێرای لێدەدا پاشان دوو دوو دەیان سڕیەوە هەتا دووخەت یان یەك خەت دەمایەوە، پاشان دەیگوت بڕۆ کارەکەت بکە، یا دەیگوت ئەوکارە نەکەیت، پاشان (**الطرق**) بە کوردی واتە بەخت گرتنەوە، کە ئەمانەش دەگرێتەوە، کتابی بەخت یا ئەستێرەکانی بەخت، و بورجەکان، و قاوە گرتنەوە ...

نۆعەکانی سیحر:

<u>یەکەم</u> : هەیانە سیحری حەقیقیە ، هەر وەك لە پێشتردا لە بارەی فوو کردن بە گرێدا و فێربوونی ئەستێرەناسی باس کرا بە گومانی ئەوەی کە ئەستێرەکان کاریگەریان هەبێت لە سەر ژیانی سەرزەمین

<u>دووەم</u> : هەنێ نەوعی سیحریش تەنها بەناو پێی دەگوترێت سیحر، نەك حوکمی سیحری هەبێت ( وەك ڕەوانبێژی) . واللّەأعلم . السبك الفريد، ابن الجبرين، نفس الباب.

## 25- باب ما جاء في الكهان ونحوهم

69- روى مسلم في صحيحه، عن بعض أزواج النبي ﷺ عن النبي ﷺ قال: "من أتى عرَّافاً فسأله عن شيء فصدقه، لم تقبل له صلاة أربعين يوماً".

70- وعن أبي هريرة رضي الله عنه، عن النبي ﷺ قال: "من أتى كاهناً فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد ﷺ " رواه أبو داود.

71- وللأربعة، والحاكم وقال: صحيح على شرطهما، عن (أبي هريرة من أتى عرافاً أو كاهناً فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد ﷺ ". ولأبي يعلى بسند جيد عن ابن مسعود موقوفاً.

---

## بابی 25

# باسی کاهینەکان و هاوشێوەکانیان

69- [69] موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە یەکێ لە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ کە پێغەمبەر فەرمویەتی : (هەر کەسێ بڕوات بۆلای فاڵگرەوەیەك و سوئالی لێبکات لە بارەی هەر شتێکەوە، وە باوەڕ بە جوابەکەی بکات ، ئەوا هیچ نوێژێکی لێ وەرناگیرێت تا چل ڕۆژ )

70- [70] أبوهريرة دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی :( هەرکەسێ بڕوات بۆلای فاڵگرەوەیەك ( واتە بڕوات بۆ لای هەر کەسێك کە دیعایە بکات کە خۆی عیلمی غەیب دەزانێت ) ئەمیش باوەڕ بکات بە هەر چیەك کە دەیڵێت ، ئەوا کافر بووە بەوەی کە دابەزیوە بۆ محمد ﷺ.

---

69 مسلم (2230) وقوله فصدقه بما يقول ليس عند مسلم وإنما هي عند أحمد (16693)

70 صحيح أخرجه أبو داود (3904) والترمذي ، وابن ماجة وأحمد .

71- ﷺهەركەسێ بڕوات بۆ لای عەرافێك یا فاڵچییەك و (سوئالی لێ بكات ) ئەویش هەر چی گوت لە جوابدا . ئەمیش باوەڕی پێ بكات ، ئەوا كافر بووە بەوەی كە دابەزیوە بۆ محمد ﷺ .

72- وعن عمران بن حصين رضي الله عنه مرفوعاً: "ليس منا من تَطير أو تُطير له أو تَكهن أو تُكهن له أو سَحر أو سُحر له، ومن أتى كاهناً فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد ﷺ) رواه البراز بإسناد جيد،

73- ورواه الطبراني في الأوسط بإسناد حسن من حديث ابن عباس دون قوله: "ومن أتى.." الخ.

قال البغوي: العراف: الذي يدعي معرفة الأمور بمقدمات يستدل بها على المسروق ومكان الضالة ونحو ذلك وقيل: هو الكاهن والكاهن هو الذي يخبر عن المغيبات في المستقبل وقيل: الذي يخبر عما في الضمير.

وقال أبو العباس ابن تيمية: العراف: اسم للكاهن والمنجم والرمال ونحوهم ممن يتكلم في معرفة الأمور بهذه الطرق.

---

72- ﷺعیمرانی كوڕی حوصەین دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی :(ئەو كەسە لە ئێمە نیە كە شومی دەكات لە باڵندە یا هەر شتێكی دیكە . (واتە بە مایەی نەگبەتی یا بە نیشانەی نەگبەتیان بزانێت ) یان باڵندە هەڵبفڕێنێ بۆ ئەوەی بزانێت فلاُن كار خێری پێوەیە یان نا . جا خۆی هەڵی بفڕێنێت یا كەسێكی دیكە ڕاسپێرێت بۆی هەڵبدات . وە ئەو كەسەش كە فالْ بگرێتەوە یا فالْی بۆ بگرنەوە یا سیحر بكات یا سیحری بۆ بكەن . وە هەر كەسێ بڕوات بۆلای فاڵگرەوەیك (سوئالی لێ بكات لە بارەی شتی نهێنیەوە چ ڕابردوو یا داهاتوو ) هەر چی جوابێكی دایەوە باوەڕی پێ بكات ، ئەوا كافر بووە بەوەی كە دابەزیوە بۆ محمد ﷺ.

---

71 جيد أخرجه أحمد . والحاكم والبيهقي.

72 جيد أخرجه البزار (3044) والهيثمي في المجمع

73شبی تەبەڕانیش هەمان فەرمودەی گێڕاوەتەوە ، بەڵام ئەمەی لە گەڵدا نیە (هەر کەس بڕوات بۆلای کاهینیٚ....) تا دوایی.

**البغوي** دەڵێت : عەراف ( ئەو کەسەیە کە ئیدعا دەکات لە شتە غەیبیە کان دەزانێت بە پێی چەند پێشەکیەك ( وەك بەرد هەڵدان یا خەت لێدان ) دەزانێت شتی دزراو کیٚ دزیویەتی ئێستا لە کوێیە و شوێنەکەی ئاشکرا دەکات یا هەر

**74**– وقال ابن عباس في قوم يكتبون (أبا جاد) وينظرون في النجوم : ما أرى من فعل ذلك له عند الله من خلاق.

فيه مسائل: الأولى: أنه لا يجتمع تصديق الكاهن مع الإيمان بالقرآن.

الثانية: التصريح بأنه كفر. الثالثة: ذكر من تُكهن له.

الرابعة: ذكر من تُطير له. الخامسة: ذكر من سحر له.

السادسة: ذكر من تعلم أبا جاد. السابعة: ذكر الفرق بين الكاهن والعراف.

---

شتێکی لەو بابەتە . یان گوتراوە عەڕاف هەر فاڵگرەوەیە . فاڵگرەوەش : ئەو کەسەیە کە هەواڵی شتی غەیبی دەدات کە لە داهاتوودا ڕوو دەدات، یان گوتراوە : فاڵگرەوە ئەوەیە کە پێت دەڵێت چی لە دڵتدایە )

ئیبنو تەیمییە دەڵێت : العراف : ناوێکە فاڵچی و ئەستێرەناس و ڕەمل لێدەر و هاوشێوەکانیان دەگرێتەوە ئەوانەی لە بارەی کاروباری غەیبی و نهێنی بە پێی ئەو ڕێگا و دەستورانەی خۆیان قصە دەکەن .

74–شبی لە بارەی ئەو کەسانەوە کە ئەبجەد دەنوسنەوە لە هەمان کاتدا سەیری ئەستێرەکان دەکەن ( واتە بۆ بەخت گرتنەوە ) ابن عباس دەڵێت :( وا دەبینم کە هەر کەسیٚ ئەم جۆرە کارانە بکات لای خودا بیٚ بەشە ) لە ئیمان.

## مەسەلەکانی ئەم باسە

---

73 حسن لشاهده المتقدم أخرجه البزار والطبراني في الأوسط .

74 صحيح موقوفا .أخرجه عبد الرزاق (19805) والبيهقي(16514).

1- باوەر كردن بە فاڵگرەوە وئیمان هێنان بە قورئان بە یەكەوە كۆ نابنەوە .
2- ڕاگەیاندنی ئەوەی كە ئەو كارە كوفرە .
3- باسی ئەو كەسەی، فاڵی بۆ دەگیرێتەوە .
4- باسی ئەو كەسەی كە باڵندەی بۆ هەڵدەدرێت. ( یا بەختی بۆ دەگیرێتەوە )
5- باسی ئەو كەسەی كە سیحری بۆ دەكرێت .
6- باسی ئەو كەسەی كە فێری ئەبجەد دەبێت ( واتە : كتێب گرتنەوە )
7- باسی جیاوازی لە نێوان فاڵچی و عەڕافدا . (كاهن یا فاڵچی لە بارەی داهاتوو قصە دەكات ، عەرافیش لەبارەی شوێنی شتی ون بوو)

ڕوونكردنەوە :

1. بەراورد كردنی لە نێوان پێناسەی كاهین و پێناسەی هاوشێوەكانی، زۆركەس هەن هاوشێوەی كاهین هەواڵی شتی غەیبی و نادیار دەدەن ، بەڵام لە ئامێر و وەسیلەی دەستیاندا جیاوازیان هەیە.

یەكەم : هەر كەسێ خەبەری غەبەری غەیبی بدات لە ڕێگەی جنەوە ، ئەمەیان كاهینە

دووەم : هەركەسێ لە بارەی شتی دزراو و گوم بوو خەبەر بدات ، شتی نادیار بەكار بهێنێت ئەمەیان عەڕافە.

سێیەم : هەر كەسێ لەبارەی شتی دزراوەوە خەبەر بدات، لە ڕێگەی خەت كێشانەوە لە سەر زەوی ، ئەمەیان ڕەمماڵە.

چوارەم : هەر كەسێ لەبارەی غەیبەوە خەبەر بدات ، لە ڕێگەی سەیر كردنی ئەستێرەكانەوە، ئەمەیان پێی دەگوترێت ئەستێرەناس.

2. لەو هۆكارانەش كە لەم سەردەمەدا بەكاردێت و لەم سەردەمەدا بڵاوە : ئەستێرەكانی بەخت ، بورجەكانن . كە لە جەریدە و موجەلەكاندا بڵاو دەكرێتەوە .

3. بە ڕاست زانینی كاهین و فاڵگرەوەكان بە سێ جۆر ئەنجام دەدرێت :

یەكەم : بە زمان وتەیەك دەر ببڕێت كە مەعنای بە ڕاست زانین بدات

دووەم : بە دڵ بە قسەكەی دڵی ئاو بخواتەوە و دڵی ئارام بگرێت .

سێیەم : بە كردەوە ، پابەند بێت بە هەر خەبەرێكەوە كە فاڵچیەكە دەیدات

هەر کەسێ یەکێ لەم سێ شتە بکات ئەوا بەر ئەوە دەکەوێت کە فاڵچی و کاهینەکانی بە ڕاست زانیوە .

## 26- باب ما جاء في النُّشرة

**75**- عن جابر رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ سئل عن النشرة فقال: "هي من عمل الشيطان" رواه أحمد بسند جيد. وأبو داود، وقال: سئل أحمد عنها فقال: ابن مسعود يكره هذا كله.

**76**- وفي "البخاري" عنقَتَادَة : قُلْتُ لِابْنِ الْمُسَيَّبِ : رَجُلٌ بِهِ طِبٌّ – أَوْ يُؤَخَّذُ عَنِ امْرَأَتِهِ – أَيُحَلُّ عَنْهُ أَوْ يُنَشَّرُ ؟ قَالَ : لا بَأْسَ بِهِ ، إِنَّمَا يُرِيدُونَ بِهِ الإِصْلاحَ ، فَأَمَّا مَا يَنْفَعُ فَلَمْ يُنْهَ. أ.هـ.

---

## بابی 26

## باسی بەتاڵ کردنەوەی سیحر وچارەسەی نەخۆشی جن

75- ﷺجابر دەڵێت : سوئال کرا لە پێغەمبەری خودا ﷺ لەبارەی بەتاڵ کردنەوەی سیحر (کە لەو کاتەدا باو بووە ) ئەویش فەرموی :(ئەوە جۆرە کارێکی شەیتانەکانە ).

ئەحمەد و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە وئەبوداود دەڵێت : لەوبارەیەوە سوئال لە ئیمامی ئەحمەد کرا ؟ ئەویش لە جوابدا گوتی:(ابن مسعود، ئەم جۆرە کارانەی شەیتانی هەمووی بە مەکروە داناوە ) . لای سەلەف مەکروە واتە : حەرام .

76- ﷺ بوخاری دەگێڕێتەوە کە قەتادە گوتی بە (سعید ابن المسیب ) پیاوێك سیحری لێکراوە، یان لە خێزانەکەی بەستراوە، ئایە دروستە سیحرەکەی بۆ

---

75 حسن أخرجه أحمد وأبو داود (3868)

بەتاڵ بکرێتەوە ؟( ابن مسعود) گوتی : هیچی تێدا نیە ئەوان ئەوکارە بۆ چاكسازی دەكەن، ئەوەی سودی هەبێت نەهی لێنەكراوە .

77–رحمه الله حەسنی بەصری دەڵێت : یەكێك سیحر بەتاڵ دەكاتەوە كە خۆی ساحیر بێت.

**ابن القیم** دەڵێت : بەتاڵ كردنەوەی سیحر دوونەوعە:

**77**– وروى عن الحسن أنه قال: لا يحل السحر إلا ساحر.

قال ابن القيم: النشرة: حل السحر عن المسحور، وهي نوعان:

إحداهما: حل بسحر مثله، وهو الذي من عمل الشيطان، وعليه يحمل قول الحسن، فيتقرب الناشر والمنتشر إلى الشيطان بما يحب، ويبطل عمله عن المسحور.

والثاني: النشرة بالرقية والتعوذات والأدوية والدعوات المباحة، فهذا جائز....

فيه مسألتان: الأولى:النهي عن النشرة.

الثانية:الفرق بين المنهي عنه والمرخص فيه مما يزيل الأشكال.

---

یەكەمیان : بەتاڵ كردنەوەی سیحر بە سیحرێكی دی، ئەمەیان ئەوەیە كە جۆرێكە لە كاری شەیتان، وتەكەی حەسەنی بەصری ئەمەیان دەگێرێتەوە .

چونكە ئەوكەسەی كە سیحرەكە بەتاڵ دەكاتەوە ، لەگەڵ ئەوكەسەش كە سیحرەكەی بۆ بەتاڵ دەكرێتەوە، بەوجۆرەی كەشەیتان ئارەزوی لێبێت خۆیان لەشەیتان نزیك دەكەنەوە. جا لەبەرئەوە شەیتان كاریگەری سیحرەكە لەسەر سیحر لێكراوەكە بە تاڵ دەكاتەوە .

دووەمیان : بەتاڵ كردنەوەی سیحر بە (ڕوقیە) واتە خوێندنی قورئان و موعەویزاتی قورئانی و سونەت ، و بەكار هێنانی دەوا و دۆعای حەڵاڵ ، ئەمەیان جائیز و دروستە .

---

76 البخاري

77 صحيح أخرجه الطبري في التذهيب

## لەم باسەدا دوومەسەلە هەیە

1- نەهی كردن و قەدەغە كردن لە بەتاڵ كردنەوەی سیحر .

2- جیا كردنەوە لە نێوان دوو جۆرەكەی بەتاڵ كردنەوەی سیحر: كە یەكیان قەدەغە كراوە و ئەوی دیكەیان ڕوخصەتی پێدراوە . ئەم جیا كردنەوەش ئیشكال واتە : ئاڵۆزی ناهێڵێت لە بەینی حەدیسەكاندا.

## 27- باب ما جاء في التطير

وقول الله تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ١٣١﴾ **الأعراف**

وقوله: (قَالُوا طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ)

**78**- عن أبي هريرة ﷺ ، أن الرَسُولَ ﷺ قال لَا عَدْوَى وَلَا طِيَرَةَ وَلَا هَامَةَ وَلَا صَفَرَ) أخرجاه.

زاد مسلم: (ولا نوء، ولا غول).

**79**- ولهما عن أنس ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ : لَا عَدْوَى وَلَا طِيَرَةَ وَيُعْجِبُنِي الْفَأْلُ قَالُوا وَمَا الْفَأْلُ قَالَ كَلِمَةٌ طَيِّبَةٌ)

---

## بابی 27 باسی شومی وڕەشبینی كە چ هەڕەشەیەكی لەسەرە

**خودای بڵند دەفەرموێت :**

﴿أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ١٣١﴾ **الأعراف**

**واتە :( بابزانن و ئاگاداربن ئەو شومی و نەگبەتیەی ئەوان كە بە سەریاندا هاتووە ، بە هۆی كردەوەكانی خۆیانەوە ڕووی داوە )**

**ڕوونکردنەوە :( مەعنای ئایەتەکە ئەوەیە کە هەرچی خۆشی و ناخۆشییە هەمووی لە لایەن خوداوە و بە قەدەری ئەو ڕوو دەدات ) ئەم دوو ئایەتەش دەری دەخات کە شومی و ڕەشبینی کردن کاری جاهیلیەت و موشریکانە .**

**خودای گەورە فەرمویەتی:**

﴿ قَالُوا۟ طَـٰٓئِرُكُم مَّعَكُمْ ۚ أَئِن ذُكِّرْتُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ ﴿**یس** ﴾

**واتە :﴿ پێغەمبەرەکان وتیان : شومی و نەگبەتیەکەتان لە گەڵ خۆتاندایە واتە بە هۆی کردەوەکانی خۆتانەوەیە ، ئەو بەڵایەش کە بەسەرتاندا هاتووە ، بەهۆی کوفرو گوناهەکانی خۆتانەوەیە . جا لەبەر ئەوەی کە ئێمە ئامۆژگاریتان دەکەین و ئەمرتان پێ دەدەین بە تەوحید ، ئێوەش ئەم کارەی ئێمە بە مایەی شوم و نەگبەتی دەزانن ، بەڵام ئێوە قەومێکن لە سنور دەرچوون ﴾ تەواو**

**80**- ولأبي داود بسند صحيح عن عُرْوَةَ بْنِ عَامِرٍ رضي الله عنه قَالَ ذُكِرَتِ الطِّيَرَةُ عِنْدَ رسول الله ﷺ فَقَالَ « أَحْسَنُهَا الْفَأْلُ وَلاَ تَرُدُّ مُسْلِمًا فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُلِ : اللَّهُمَّ لاَ يَأْتِى بِالْحَسَنَاتِ إِلاَّ أَنْتَ وَلاَ يَدْفَعُ السَّيِّئَاتِ إِلاَّ أَنْتَ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِكَ ».

**81**- وعن ابن مسعود رضي الله عنه مرفوعاً: « الطِّيَرَةُ شِرْكٌ الطِّيَرَةُ شِرْكٌ . وَمَا مِنَّا إِلاَّ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُذْهِبُهُ بِالتَّوَكُّلِ ».

" رواه أبو داود، والترمذي وصححه، وجعل آخره من قول ابن مسعود.

---

78- [78]**أبوهريرة رضي الله عنه دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ ( فەرموی تەنینەوەی نەخۆشی نیە ( واتە هەر لە خۆیەوە بلاو نابێتەوە بەڵکو بە قەدەری خودایە ) شومی و ڕەشبینی نیە ( واتە بوونی نییە و حەقیقەتی نییە و کاریگەری نییە ) ، بایەقوش کاریگەری نیە مانگی سەفەر شوم نیە ) بوخاری ومسلیم ڕیوایەتیان کردووە لای موسلیم ئەمەشی لە گەڵدایە : ( ئەستێرە کاریگەر نیە (لەسەر ژیانی سەرزەمین چ بەچاکە و چ بە خراپە ) و (الغول واتە: دێو زەرەر و زیانی نیە)**

---

**78** **البخاري** (5757) **وسلم** (2220)

79–ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموی :(تەنینەوەی نەخۆشی نیە، شومی و ڕەشبینیی نیە، وە گەشبینیم پێخۆشە ، گوتیان : گەشبینی چیە ؟ فەرموی :( الكلمة الطيبة) واتە : وشەیەکی جوان یا ناوێکی جوان جوانە )

80– عروة بن عامر ﷺ دەڵێت : (لای پێغەمبەری خودا ﷺ باسی (الطیرة) شومی کرا ، ئەویش فەرموی: لەوەدا گەشبینی جوان و حەلاڵە ، مسوڵمان لە کارەکەی ناگێڕێتەوە، جا ئەگەر هەرکامتان شتێکی بینی پێی ناخۆش بوو بابڵێت :(خودایە، هەرچی شتە باش وجوانەکانە تەنها خۆت دروستیان دەکەیت و دەیان هێنیتە بوون ، هەرچی شتە خراپ و ناشیرینەکانە ، تەنها خۆت لایان دەدەیت ، ناشتوانین حاڵی خۆمان بگۆڕین لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی دیکە مەگەر تەنها بە کۆمەکی خۆت، هیچ هێز و قوەتێکیشمان نیە مەگەر خۆت پێمان ببەخشێت بە کۆمەکی خۆت )

**82**– ولأحمد من حديث ابن عمرو : ( مَنْ رَدَّتْهُ الطِّيَرَةُ مِنْ حَاجَةٍ فَقَدْ أَشْرَكَ قَالُوا مَا كَفَّارَةُ ذَلِكَ ؟ قَالَ أَنْ تَقُولَ : اللَّهُمَّ لَا خَيْرَ إِلَّا خَيْرُكَ وَلَا طَيْرَ إِلَّا طَيْرُكَ وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ )

**83**– وله من حديث الفضل بن عباس رضي الله عنهما: إنما الطيرة ما أمضاك أو ردك.

---

81– (ابن مسعود) ﷺ دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی : ( ڕەشبینی جۆرێکە لە شیرك، ڕەشبینی جۆرێکە لە شیرك ) .(ابن مسعود) دەڵێت: (هەریەك لە ئێمە شتی وا دێت بەدڵیدا ( بەپێی عادەت و بۆماوە) ، بەڵام بە هۆی تەوەکول و پشت بەستن بە خوداوە : خودا ئەوشتە ناهێڵێت لە دڵیدا ) .

82– ئیمامی ئەحمەد لە حەدیسی ( ابن عمر ) دا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەس شومی بکات لە شتێکدا و بیگێڕێتەوە لە کارەکەی ئەوا شەریکی بۆ خودا داناوە ، ئەصحابەکان گوتیان ئەی کەفارەتی ئەوە چیە؟

---

79 البخاري (5756) و(5776) وسلم (2242)

80 ضعيف مرسل . أخرجه أبو داود , كتاب الطب (3919) والبيهقي(345)

81 حسن . أخرجه أبو داود داود ( 3910) والترمذي (1614) وإبن ماجة (3538)

82 حسن أخرجه أحمد (7045)

فەرموی : ئەوەی كە بڵێت : ( اللهم لا خير إلا خيرك، ولا طير إلا طيرك، ولا إله غيرك ) تەواو.

**ڕوونكردنەوە** : واتە: ئەم شتانە مسوڵمان ناگێڕێتەوە و لە كاری خۆی پەشیمانی ناكاتەوە، جا ئەگەر شتێكی وای بینی وشتێك هات بە دڵیدا با ئەو دوعایە بە دڵ و بە زمان بڵێت . هەر كەس ئەم ئەم دوعایە بە دڵ و زمان بڵێت ، مەنای وایە كارەكانی خۆی داوەتە دەست خودا و خۆی بەری كردووە لەوەی كە پەیوەست بێت بە غەیری خوداوە . بەڵام هەر كەس خۆی نەداتە دەست ﷻ وە خۆی بۆ خەیاڵاتی شەیتانی شل بكات ئەوا سزاكەی ئەوەیە كە چی پێ ناخۆش بێت بە سەریدا دێت .

83- وە هەر ئەحمەد ، لە حەدیسی فەزڵی كوڕی عەباسدا هێناویەتی:(شومی ئەوەیە كە هانت بدات بۆ كارێك یا لە كارێك ساردت بكاتەوە و پەشیمانت بكاتەوە )

## فيه مسائل:

الأولى: التنبيه على قوله: ﴿أَلا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِندَ اللّهُ﴾ مع قوله: ﴿طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ﴾

الثانية: نفي العدوى. الثالثة: نفي الطيرة. الرابعة: نفي الهامة. الخامسة: نفي الصفر.

السادسة: أن الفأل ليس من ذلك بل مستحب. السابعة: تفسير الفأل.

الثامنة: أن الواقع في القلوب من ذلك مع كراهته لا يضر بل يذهبه الله بالتوكل.

التاسعة: ذكر ما يقوله من وجده. العاشرة: التصريح بأن الطيرة شرك.

الحادية عشرة: تفسير الطيرة المذمومة.

## مەسەلەكانی ئەم باسە

---

83 ضعيف . أخرجه أحمد (1824) ضعفه أحمد شاكر والألباني

1- ئاگادار بوون لە واتای وتەی خودا (أَلا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِندَ اللّهُ ) **لە گەڵ**: (طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ) کە یەکەمیان مەعنای ئەوە دەدات کە ئەو بەڵایە بە قەدەری خودایە . دووەمیان مەعنای ئەوەیە کە ئەو بەڵایە بە هۆی تاوانی خۆتانەوە ڕووی داوە .

2- نەفی کردنی تەنینەوە (مەبەست ئەوەیە کە تەنینەوەی نەخۆشی هەر لە خۆیەوە ڕوو نادات بەڵکو بە قەدەری خودایە )

3- نەفی شومی واتە هیچ شتێ لە خۆیدا شوم نیە

4 – نەفی بایە قوش (واتە ئەمیش شوم نیە )

5- نەفی سەفەر ( واتە مانگی سەفەر شوم نیە کەواتە هیچساڵ وهیچ مانگ وهیچ ڕۆژێك و هیچ کاتێك شوم نیە)

6- گەشبینی بەر ئەوە ناکەوێت بەڵکو موستەحەببە واتە : سوننەتە .

7- تەفسیری گەشبینی (بەوە تەفسیر کراوە : کەلیمەیەکی جوانە ، چونکە گەشبینی هانی ئینسان دەدات کە چالاك بێت)

8- ئەگەر شومی کەوتە دڵەوە ، لەدڵیشەوە پێت ناخۆش بوو ئەوە زیانی نیە.

9- هەر کەسێ شتێکی وا هات بە دڵیدا دەبێت چی بڵێت ؟

10- ڕاگەیاندنی ئەوەی کە بە شوم زانین شیرکە.(بەپێی عەقیدەی خاوەنەکەی گەورە وبچوکی هەیە)

11- تەفسیری بە شوم زانینێ کە لۆمە کراوە (ئەویش ئەوەیە کە پاڵت پێوەبنێ یا هانت بدات بۆ کارێ یان ساردت بکاتەوە لە کارێك) .

ڕوونکردنەوە :

پێناسەی بە شومزانین (تعريف التطير)

:﴿ شرعًا: التشاؤم بكل مسموع أو مرئي أو معلوم، وهذا تعريف ابن القيم﴾

**واتە** :(شومی، ڕەشبینی، بە مایەیی نەگبەتی زانین: ئەمانە یەك مەعنایان هەیە) واتەی شەر :(بەشوم زانینی هەر شتێکی بیستراو یابینراو یا زانراو ) واتە :

ئەوانەی کە خەڵکی نەفام بە دڵیان نییە

1- بیستراو وەك : دەنگی قەلەڕەش ، دەنگی بایەقوش .

2- بینراو : وەك ئەوەی لە کاتی جاهیلیدا ، لە کاتی سەفەردا ، ئەگەر باڵندەیەك بەلای چەپدا هەڵفڕا دەگەڕانەوە و دەیانگوت : ئەم سەفەرە خێری تێدا نیە، یا ئەگەر کەروێشکێك بهاتایە بەردەمیان، هەروایان دەگوت یان ئەگەر کەسێکی نوقصان بێتە ڕێیان بە شومی دەزانن .

3- زانراو : وەك ناوی مانگەکان و کاتەکان وەك سێ شەممە یا چوارشەممە . ژمارەش وەك ژمارە سیانزە.

شومی یا ڕەشبینی دوو جۆری هەیە :

یەکەمیان : ئەگەر باوەڕی وابوو کە ئەو شتانە هەر خودی خۆیان کاریگەریان هەیە لەوەدا کە زیان بگەیەنن یا سود بگەیەنن ، ئەوە شیرکی گەورەیە .

دووەم : ئەگەر عەقیدەی وابوو کە ئەو شتانە سەبەب و هۆکارێکن بۆ ڕوودانی زیان گەیاندن یا سود پێگەیاندن ، و خودا خۆی کردونی بە سەبەب ، ئەم جۆرەیان شیرکی شیرکی بچوکە .

## 28- باب ما جاء في التنجيم

84- قال البخاري في "صحيحه": قَالَ قَتَادَةُ  خَلَقَ اللهُ هَذِهِ النُّجُومَ لِثَلَاثٍ زِينَةً لِلسَّمَاءِ وَرُجُومًا لِلشَّيَاطِينِ وَعَلَامَاتٍ يُهْتَدَى بِهَا فَمَنْ تَأَوَّلَ فِيهَا غَيْرَ ذَلِكَ أَخْطَأَ وَأَضَاعَ نَصِيبَهُ وَتَكَلَّفَ مَا لَا عِلْمَ لَهُ بِهِ. أ.هـ.

85- وكره قتادة تعلم منازل القمر، ولم يرخص ابن عيينة فيه، ذكره حرب عنهما، ورخص في تعلم المنازل أحمد وإسحاق.

86- وعن أبي موسى قال: قال رسول الله ﷺ ثَلَاثَةٌ لَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ مُدْمِنُ خَمْرٍ وَقَاطِعُ رَحِمٍ وَمُصَدِّقٌ بِالسِّحْرِ ) رواه أحمد وابن حبان في صحيحه.

---

## بابی28باسی ئەستێرەناسی یا فەلەکناسی

84–[84](قەتادە دەڵێت : خودا ئەم ئەستێرانەی بۆ سێ حیکمەت دروست کردووە :

یەکەم : بۆ ڕازاندنەوەی ئاسمانی دونیا.

دووەم : بۆ ڕەجمی شەیتانەکان . ئەوانەی نهێنی ئاسمانەکان دەفڕێنن.

سێیەم : بۆئەوەی بکرێت بە نیشانە ، کاروانچی و موسافیرەکان ڕێگەی خۆیانی پێ بدۆزنەوە ، جا هەر کەس دیعایەی ئەوە بکات کە بۆ غەیری ئەمانە بە کار دێن . ئەوا تاوانێکی گەورەی کردووە بەشی خۆی لە بەهەشت نەهێڵاوە و بارێکی لە خۆی ناوە (کە عیلمی غەیبە) هیچی لێ نازانێت) تەواو.

85– [85]( قەتادە فێربوونی مەنازلی مانگی بە مەکروە (واتە : بە حەرام داناوە) و (سفیان بن عیینە ) ڕوخصەتی پێ نەداوە ئەمەش حەربی کوڕی ئیسماعیل لەوانەوە گێڕاویەتیەوە بەڵام ئیمامی أحمد وإسحاق ڕوخصەتیان پێداوە . ( بۆ زانینی کاتەکان )

فيه مسائل: الأولى: الحكمة في خلق النجوم. الثانية: الرد على من زعم غير ذلك.

الثالثة: ذكر الخلاف في تعلم المنازل.

الرابعة: الوعيد فيمن صدق بشيء من السحر ولو عرف أنه باطل.

---

86– [86]ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (سێ کەس ناڕۆنە بە هەشتەوە

---

84 أخرجه البخاري تعليقا ، كتاب بدء الخلق باب النجوم .

85 ذكره ابن رجب في كتاب فضل علم السلف على علم الخلف

86 حسن . بمجموع الطرق والشواهد أخرجه أحمد وابن حبان (5349) وأبو يعلى في المسند (7248) والطبراني في المجمع . والحاكم وضعّفه الألباني

یەکەم: ئەو کەسەی کە بەردەوام مەی دەخواتەوە .

دووەم : ئەو کەسەی کە باوەڕ بە ساحیر دەکات ( کە نەوعێکیان ئەستێرەناسیە)

سێیەم : ئەو کەسەش کە سیلەی ڕەحم دەپچڕێنێت)

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- حیکمەت لە دروست کردنی ئەستێرەکاندا ( تەنها سیانن )

2- ڕەددانەوەی هەر کەسێ کە ئیدعای شتێکی دیکە بکات( جگە لەو سیانە لە بارەی ئەستێرەکانەوە )

3- باسی خیلاف و ناکۆکی لە نێوان عولەمادا لە بارەی فێربوونی مەنازیل یا خولگەکانی مانگ .

4- هەڕەشە کراوە لەو کەسەی کە باوەڕ بکات بە هەر جۆرە سیحرێ . ئەگەر چی بشزانێت کە سیحر درۆیە.

ڕوونکردنەوە :

1- بەڕاست زانین یان باوەڕکردن بە ئەستێرەناس سێ جۆری هەیە :

یەك :(تصدیق بالقلب ) سەلماندن بە دڵ: ئەوەیە کە باوەڕی وابێ کە ئەستێرە ناسەکە ڕاست دەکات.

دوو: (تصدیق السان) باوەڕکردن بە زمان : ئەوەیە کە ئەستێرە ناسەکە بڵێت لەمەودوا ئەوەو ئەوە ڕوو دەدات ، ئەمیش بەزمان شتێ بڵێت کە مەعنای ئەوە بدات کە باوەڕی کردووە بە ئەستێرە ناسەکە، ئەمەش هەر کافر دەبێت .

سێ :(تصديق الجوارح) سەلماندن بە ئەندامەكانی لاشە ، ئەمەش ئەوە دەگرێتەوە كە بەپێی وتەی ئەستێرەناسەكە بجوڵێتەوە .

2- پێناسەی ئەو ئەستێرەناسیەی كە حەرام كراوە: ئەوەیە كە بارودۆخی ئەستێرەكان بكرێتە بەڵگە و نیشانەی ڕووداوەكانی سەر زەمین شتە هەست پێكراوەكانی سەر زەوی.

**29- باب ما جاء في الاستقساء بالأنواء**

وقول الله تعالى: ﴿ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ [ الواقعة : 82 ]

**87**- عن أبي مالك الأشعري رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: أَرْبَعٌ فِى أُمَّتِى مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ لاَ يَتْرُكُونَهُنَّ الْفَخْرُ فِى الأَحْسَابِ وَالطَّعْنُ فِى الأَنْسَابِ وَالاِسْتِسْقَاءُ بِالنُّجُومِ وَالنِّيَاحَةُ ». وَقَالَ « النَّائِحَةُ إِذَا لَمْ تَتُبْ قَبْلَ مَوْتِهَا تُقَامُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ مِنْ جَرَبٍ » رواه مسلم.

---

**بابی 29**

## باسی هەر کەسیٚ باوەڕی وا بیٚت کە ئەستیٚرەو جوڵەی ئەستیٚرەکان هۆکاری باران بارینن

﴿ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ ﴿الواقعە:82﴾

واتە :(ئێوە لە جیاتی ئەوەی شوکری خودا بکەن کە ڕزقی بۆتان باراندووە ، دەڕۆن درۆ دەکەن بەو جۆرەی کە ناڵێن ئەمە ڕزقی خودایە و دەڵێن بە هۆی جولەی فلاْن ئەستێرەوە بارانمان بۆ باری )

87–ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی : چوار شت لە ناو ئوممەتەکەمدا کاری جاهیلی ونەفامین و تەرکی ناکەن .

یەکەم : فەخر کردن بە کاری باب وباپیرانەوە ( وکەسانی نزیك).

دووەم : تانەدان لە نەسەبی خڵکی.

( وەك ئەوەی کە بلێت فلاْن کوڕی فلاْن نیە، یا فلاْن زۆڵە یا کوڕی حەماڵە )

سێیەم : عەقیدە بوون بەوەی کە ئەستێرەکان و جوڵەیان سەبەبی باران بارینن.

چوارەم : شیوەن کردن بۆ مردوو )

فەرمووی :( ژنی شیوەن گێڕ ئەگەر پێش مەرگی تۆبە نەکات ئەوا بەو حاڵەتەوە زیندوو دەکرێتەوە کە پۆشاکێکی پڕ بە بالاْی لە بەر دەکرێت کە مسی تواوەیە لە گەڵ کراسێکی درێژی گەڕوگولی واتە : گەڕی گولی هەموو لاشەیان دادەپۆشێت )

88– ولهما عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ ﷺ قَالَ صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ عَلَى إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنْ اللَّيْل فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ ( هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ فَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ وَأَمَّا مَنْ قَالَ بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالْكَواكِبِ)

---

87 مسلم (934)

88- <sup></sup>زەیدی کوڕی خالد ﷺ دەڵێت :پێغەمبەری خودا ﷺ ئیمامەتی نوێژی بەیانی بۆ کردین ، ئەمەش لە حودەیبییە بوو لە پاش بارانی شەو . جا کاتێ سەلامی دایەوە ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی : ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی فەرموو ؟

ئەوانیش گوتیان : خوداو پێغەمبەرەکەی دەزانن .

فەرمووی: خودا فەرمووی: (هەندێ لە عەبدەکانم سپێدەیان بەسەردا هات و ئیمانیان بە من هێنا، و هەندێکیان کافر بوون. جا ئەوەی (بە دڵ یا بە دەم ) گوتی: بە فەزڵ و ڕەحمەتی خوداوە بارانمان بۆ باری ، ئەوە ئیمانی بەمن هێناوە و کافر بووە بە ئەستێرەکان . بەڵام ئەوەی گوتی : بە هۆی هەڵاتن یا ئاوا بوونی ئەستێرەکانەوە بارانمان بۆ باری ، ئەوە کافر بووە بە من و ئیمانی بە ئەستێرەکان هێناوە ) تەواو

***ڕوونکردنەوە*** : ئەم حەدیسە ئەوە دەردەخات کە دروست نیە کارەکانی خودا بدرێتە پاڵ غەیری خودا . وەك بگوترێت بە فلان ئەستێرە یا هەڵاتنی یا ئاوا بونی فلان ئەستێرە بارانمان بۆ باری ئەم وتەیەش سێ مەعنای هەیە:

أ. بەهۆی ئەستێرەکانەوە باران باری

ب . لەگەڵ هەڵاتن یا ئاوابونی فلان ئەستێرەدا باران باری

ج . بە کۆمەکی فلان ئەستێرە باران باری

. بەکارهێنانی ئەو لەفزەش بە هیچ شێوەیەك دروست نیە . فتح المجید هەمان باب

89- ولهما من حديث ابن عباس بمعناه وفيه قال بعضهم: لقد صدق نوء كذا وكذا، فأنزل الله هذه الآيات: (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ) إلى قوله: (وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ) [ الواقعة 82 ]

فيه مسائل: الأولى: تفسير آية الواقعة. الثانية: ذكر الأربع من أمر الجاهلية.

الثالثة: ذكر الكفر في بعضها. الرابعة: أن من الكفر ما لا يخرج عن الملة.

الخامسة: قوله: (أصبح من عبادي مؤمن بي وكافر) بسبب نزول النعمة.

---

88 البخاري (1038) مسلم (71)

السادسة: التفطن للإيمان في هذا الموضع.    السابعة: التفطن للكفر في هذا الموضع.

الثامنة: التفطن لقوله: (لقد صدق نوء كذا وكذا).

التاسعة: إخراج العالم للمتعلم المسألة بالاستفهام عنها، لقوله: (أتدرون ماذا قال ربكم؟).

العاشرة: وعيد النائحة.

---

89–ﷺموسلیم لە حەدیسی (ابن عباس) دا هێناویەتی كە هەمان مەعنای هەیە و تیایدا هاتووە ( هەندێكیان گوتیان : واللە جولەی فلان و فلان ئەستێرە ڕاست دەرچوو (یان هاتە دی ) ، بۆیە خودای گەورە ئەو ئایەتانەی دابەزاند كە دەفەرموێ

﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ٧٦ ﴾ هەتا ئایەتی 82

## مەسەلەكانی ئەم باسە

1– تەفسیری ئایەتەكەی سوڕەتی الواقعة

2– باسی ئەو چوار شتەی  كە كاری نەفامی و جاهیلین .

3– باسی ئەوەی كە هەندێكیان كوفرن .

4– هەندێك كوفر هەیە موسڵمانی پێ لە دین دەرناچێت .

5– فەرمووی هەندێ لە عەبدەكانم ،سپێدەیان بە سەردا هات وئیمانیان بەمن هێنا ،و هەندێكیان كافر بوون ئەمەش بە هۆی دابەزینی نیعمەتەكەوە بوو .

6– تێگەیشتن لە چۆنیەتی ئیمان هێنان لەم شوێنەدا .

7– تێگەیشتن لە چۆنیەتی كافر بوون لەم شوێنەدا .

8– تێگەیشتن لەوەی كە گوتیان :واللە ، جولەی فلان و فلان ئەستێرە ڕاست دەرچوو.

9– عالم مەسەلەیەك دەخاتە بەردەستی تەلەبەكەی بەوەی كە سوئالی لێدەكات. ئەمەش بە پێی فەرمودەكەی ﷺ كە فەرموی :(ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی فەرموو).

10– هەڕەشە كردن لە ژنانی شیوەنگێڕ.

---

89 مسلم فقط (73)

رِوونکردنەوە :

1- (النوء ) ئەستێرەیە کاتێ لە خۆر هەڵاتەوە هەڵدێت لە کاتی بەرەبەیاندا، یا کاتێك ئاوا دەبێت لە خۆرئاواوە، هەر لە کاتی بەرەبەیاندا .

2- لە حەدیسی ژمارە (78) دە فەرموێ (ولا نوء) : یەعنی ئەستێرە و خولگەکانیان هیچ کاریگەریان لەسەر ژیانی سەرزەوی نیە، ئەو عەقیدەیە کە دەڵێت : ئەستێرەکان بە پێی خولگەکانیان کاری گەری دەکەنە سەر، با، وهەورەکان ، باران بارین، نەخۆشیەکان، جەنگەکان، ئەو جۆرە شتانە، ئەو عەقیدەیە هیچ ئەصڵێکی نیە، بەڵکو ئەوە خورافاتی جاهیلانەیە .

3- لەبارەی جوڵەی ئەستێرەکان سێ مەوقیف هەیە

1. دەڵێن : جوڵەی ئەستێرەکان هەرخۆی کاریگەری دەکاتە سەر دیاردە سروشتی و کۆمەڵایەتیەکان لەسەر زەوی ئەمەیان شیرکی گەورەیە و ئینسان پێی کافر دەبێت .

2. دەڵێن : جوڵەی ئەستێرەکان سەبەب و هۆکارێکە خودا خۆی دایناوە کە کاریگەری لە سەر ژیانی خەڵکی و دیاریدەکانی سەر زەوی هەبێت، ئەمەیان شیرکی بچوکە .

3. دەڵێن : جوڵەی ئەستێرەکان تەجروبەی وەقت و کاتەکانە، ئەمەیان شیرك نیە بەڵام نابێت موسوڵمان ئەو قسەیە بەکار بهێنێت، بۆئەوەی وتەکەی لە وتەی کافران نەچێت .بەڵکو باشتر ئەوەیە بۆ نمونە بڵێت ئەو بارانە فەزڵی خودایە و لە کاتێکی ئاواوئاوا دا باراندویەتی. السبك الفريد

## 30 – باب قول الله تعالى:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ﴾ ﴿البقرة :165﴾

وقولــه: ﴿ قُلۡ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ وَإِخۡوَٰنُكُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ وَعَشِيرَتُكُمۡ وَأَمۡوَٰلٌ ٱقۡتَرَفۡتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ أَحَبَّ إِلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٖ فِي سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٤ ﴾ التوبة

---

بابی 30

## باسی مەحەببەت وخۆشەویستی كە عیبادەتە

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِ ﴾﴿البقرة :165﴾

**واتە :(هەندێ لە خەڵكی هەن كە جگە لە خودا كە دەیپەرستن، هاوتایان بۆ خودا داناوە كە بیپەرستن، ئەمەش لەوەدایە كە چەندە خودایان خۆش دەوێت، ئەوەندەش هاوتاكانیان خۆش دەوێت ) تەواو**

﴿ قُلۡ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ وَإِخۡوَٰنُكُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ وَعَشِيرَتُكُمۡ ﴾ **تا دوایی ﴿التوبة :24﴾**

**واتە :(ئەی پێغەمبەر بڵێ : 1.ئەگەر باوانتان 2. وەمنداڵەكانتان 3. وە براكانتان**

**4. وە هاوسەرەكانتان 5. وە كەسەكانتان بە گشتی**

**6. وە سەروەت و سامانێك كە كۆتان كردوەتەوە و تیایدا ماندوو بوون**

**7. وە بازرگانیەك كە دەترسن بازاڕی بشكێت .**

**8. وە خانووەكانتان كە لێی ڕازین . جا ئەگەر هە یەكێ لەو ئەو شتانە لاتان خۆشەویسترە لە ( فەرمانی ) خودا وپێغەمبەرەكەی و جیهاد كردن لە ڕێگەی خودادا. ئەوا چاوەڕێ بكەن هەتا خودا فەرمانی خۆی دەنێرێت ( بەسەرتاندا و چ سزایەكتان دەدا) خوداش هیدایەتی ئەو قەومە فاسقە نادات (واتە ئەگەر : خۆشەویستی ئەوانە بخەنە پێش خۆشەویستی خوداوە )**

90- عن أنس ﷺ ، أن رسول الله ﷺ قال:

« لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ وَوَالِدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ » أخرجاه.

91- ولهما عنه قال: قال رسول الله ﷺ : (ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بهن حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ)

وفي رواية: (لَا يَجِدُ أَحَدٌ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ حَتَّى .. ) إلى آخره.

---

**90- ﷺ ئەنەس دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی :(هیچ کەستان ئیمان ناهێنێت هەتا منی زیاتر خۆش دەوێت لە منداڵەکانی وباب ( باپیر ودایکیشی ) و هەموو خەڵکی )**

**91- ﷺدیسانەوە ئەنەس دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرموی: سێ صیفەت هەن هەر کەسێ ئەوانەی تێدا بێت ئەوا بە هۆی ئەوانەوە هەست بە شیرینی ئیمان و ئیسلامیش دەکات :**

**یەکەم : دەبێت خودا و ( فەرمانی) پێغەمبەرەکەی لەلای خۆشەویستربێت لە غەیری ئەوان (وەك ژن و مناڵ ) واتە : ئەمر و فەرمانی پێغەمبەرەکەی زیات رپێ خۆش بێت لە لە ڕازی کردنی کەسانی دیکە.**

**دووەم : ئەگەر کەسێکی (ئیمانداری ) خۆشویست تەنها لەبەر خودا خۆشی بوێت.**

**سێیەم : دەبێت پێی ناخۆش بێت ببێتەوە بە کافر، پاش ئەوەی کە ﷲ لە کافری نەجاتی دا، هەروەك چۆن پێی ناخۆشە هەڵبدرێتە ناو ئاگرەوە .**

**لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێت :( شیرینی ئیمان ناچێژێت هەتا ...) تا کۆتایی حەدیسەکە**

---

**90** البخاري(15) مسلم (44)

**91** البخاري كتاب الإيمان باب حلاوة الإيمان (15) مسلم (44 و43) والترمذي (2624)

**92**– وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: من أحب في الله، وأبغض في الله، ووالى في الله، وعادى في الله، فإنما تنال ولاية الله بذلك، ولن يجد عبد طعم الإيمان وإن كثرت صلاته وصومه حتى يكون كذلك. وقد صارت عامة مؤاخاة الناس على أمر الدنيا، وذلك لا يجدي على أهله شيئا. رواه بن جرير،

**93**– وقال ابن عباس في قوله تعالى: ( وتقطعت بهم الأسباب ) قال: المودة

---

**ڕوونکردنەوە : ئیمامی نەوەوی دەڵێت :(شیرینی ئیمان ئەوەیە: کە تام و چێژ لـە عیبـادەت وەربگرێـت ، و بەرگـەی ناڕەحەتیـەکان بگرێت....خۆشەویسـتی خوداش بەوە دەبێت کە ئیتاعەی بکرێت وە موخالەفەی نەکرێت، خۆشەویستی پێغەمبەریش ﷺ هەروادەبێت ) . تەواو**

92 – ﷺ( ابن عباس ) دەڵێت : (هەرکەسێك ئەهلی ئیمان وتاعەتی لە بەر خودا خۆش ویست ، و ڕق و کینەی لەبەر خودابێت، لەبەر خودا دۆستایەتیان بکات، ولەبەر خودا دوژمنایەتی گوناهاران بکات ئەوا بەم کارەی دەبێت بە دۆست و وەلی خودا جا هیچ عەبدێك تامی ئیمان ناچێژێت با نوێژ و ڕۆژووشی زۆر بێت هەتا بەو جۆرە دەکات . ئەوەتە برایەتی زۆربەی خەڵکی ئەم سەردەمە لە سەر کارو باری دونیایە ئەمەش هیچ سودێکی بۆیان نیە . بەڵکو زەرەریشی بۆیان هەیە .

**ڕوونکردنەوە**: مەعنای ووتەکەی ابن عباس بەم جۆرەیە : کە ئەهلی ئیمان و تاعەتی لەبەر خودا خۆش بویێت ودۆستایەتیان بکات وە هەر کەس کوفر و شیرك بکات یا لە تاعەتی خودا دەر بچێت ، ئەم لەبەر خودا ڕقی لێیان بێت و دوژمنایەتیان بکات .

دووەم: لە ( قره عیون الموحدین ) دەڵێت (هەر کەس کوفر و شیرك بکات دوژمنایەتی کردنی واجبە بە پێی توانا)

93–ﷺ(ابن عباس ) لە بارەی تەفسیری { وتقطعت بهم الأسباب } دەڵێت:

---

92 أخرجه عبدالله بن المبارك في الزهد (353) والطبراني في الكبير (13537) ولم يوجد عند ابن الجرير

93 أثر صحيح . أخرجه الطبري ( 2431) والحكم في الستدرك وصححه ووافقه الذهبي

(واتە : ئەو خۆشەویستیە (کە بۆ غەیری خودا بووە) لە بەینیاندا نامێنێت لە ڕۆژی قیامەتدا ) ( واتە لە بەینی سەرکردە و شوێنکەوتووەکانیانا نامێنێت ).

فيه مسائل: الأولى: تفسير آية البقرة. الثانية: تفسير آية براءة.

الثالثة: وجوب محبته ﷺ على النفس والأهل والمال.

الرابعة: أن نفي الإيمان لا يدل على الخروج من الإسلام.

الخامسة: أن للإيمان حلاوة قد يجدها الإنسان وقد لا يجدها.

السادسة: أعمال القلب الأربعة التي لا تنال ولاية الله إلا بها، ولا يجد أحد طعم الإيمان إلا بها.

السابعة: فهم الصحابي للواقع: أن عامة المؤاخاة على أمر الدنيا.

الثامنة: تفسير: (وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الأَسْبَابُ) [ البقرة : 166 ].

التاسعة: أن من المشركين من يحب الله حباً شديداً.

العاشرة: الوعيد على من كانت الثمانية أحب إليه من دينه.

الحادية عشرة: أن من اتخذ نداً تساوي محبته محبة الله فهو الشرك الأكبر.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی سوڕەتی البقرة

2- تەفسیری ئایەتەکەی سوڕەتی بەڕائەت.

3- خۆشویستنی پێغەمبەرﷺ واجبە ودەبێت بخرێتە پێش خۆشەویستی کەس و کارو ماڵ و سامانەوە .

4- کە گوترا ئیمانی نەهێناوە مەعنای وانیە کە لە ئیسلام دەرچووە .

5- ئیمان تام وچێژی شیرینی هەیە جا هەندێ جار ئینسان هەستی پێ دەکات و هەندێ جاریش هەستی پێ ناکات .

6- ئەو چوار کردەوەیەی دڵ تەنها بەوانە نەبێت ، دۆستایتی خودا بە دەست نایت هەر بەوانەش نەبێت تامی ئیمان ناچێژرێت.

7- تێگەیشتنی ئەصحاب لە واقیع : کە زۆربەی برایەتی خەڵکی لەبەر کاروباری دونیایە.

8- تەفسیری :{ وتقطعت بهم الأسباب }

9- هەندێك لە موشریكان هەن خودایان زۆر خۆش دەوێت

10- هەڕەشەی توند لە هەر كەسیٚ كە ئەو هەشت شتەی ، زیاتر خۆش بوێت لە دینەكەی

11- هەر كەس هاوتایەك دابنێت بۆ خودا ، بەو جۆرە كە لە خۆشەویستیدا بەقەدەر خۆشەویستی خودا خۆشی بوێت ، ئەوە شیركی گەورەیە .

ڕوونكردنەوە: : چوار جۆر خۆشەویستی هەیە . واجبە لە یەك جیا بكرێنەوە. هەموو ئەوانەش كە گومڕا بوون بە هۆی ئەوەوە گومڕا بوون كە ئەو چوار جۆرە لە یەك جیا ناكەنەوە .

یەكەمیان : خۆشویستنی خودا . ئەمەیان بە تەنها بەس نییە كە ئینسان ڕزگار بكات لە عەزابی خودا و پاداشتی خودای دەست بخات

دووەمیان : خۆشویستنی هەر شتیٚ كە خودا خۆشی دەوێت و پێی خۆشە . ئەمە ئینسان دێنێتە ناو ئیسلامەوە لە كوفر دەری دەهێنێت . خۆشەویسترین كەسیش لای خودا ئەوكەسەیە كە ئەم جۆرەیانی زیاتر لە خۆیا بەدی هێنا بێت .

سێیەمیان : خۆشویستن لە بەر ڕەزامەندی خودا و بەو جۆرەش كە خوا دەیەوێت .

چوارەمیان : خۆشویستنی غەیری خودا لە گەڵ خوادا ، هەر كەسیٚ شتێكی خۆشویست لە گەڵ خودادا . ئەوەش تەنها لەبەر خودا نەبوو. لە پێناوی خودادا نەبوو ، بەو جۆرەش نەبوو كە خودا دەیەوێت ، ئەوا ئەو شتەی كردوو بە شەریكی خودا .

مایەوە پێنجەمیان كە خۆشویستنی سروشتیە ، ئەمەیان بەدەر لەم بابەتەیە . ئەمیش ئەویە كە ئینسان ئارەزووی شتیٚ بكات كە لەگەڵ تەبعی خۆیدا بگونجیٚ ، وەك خۆشەویستی تینوو بۆ ئاو ، برسی بۆ خواردن . وەك خۆشەویشتی خێزان و منداڵ . ئەم جۆرەیان هیچ لۆمەیەكی لە سەر نییە ، ئەگەر بیٚ ئاگای نەكات لە یاد و خۆشەویستی خودا .

لە (الجواب الكافي / ابن القيم) وەرگیراوە

**31**– باب قول الله تعالى ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾ آل عمران

وقوله: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ فَعَسَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ التوبة:

وقوله: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِىَ فِى ٱللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ ﴾ {العنكبوت :10}

---

## بابی 31

# ترسان لە خودا عیبادەتە و ترسان لە غەیری خودا شیرکە

**بۆ سەلماندنی ئەو مەسەلەیە دانەر سێ ئایەتی هێناوە:**

**یەکەم :** ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾

**واتە:( ئەوە شەیتانە ئێوە دەترسێ بە دۆستەکانی، دەی مەترسن لەوان و تەنها لە من بترسن ، ئەگەر ئیماندارن)**

**دووەم :**﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ﴾ **تادوایی﴿التوبة18﴾ واتە :( تەنها ئەوانە بۆیان هەیە مزگەوتەکانی خودا ئاوەدن بکەنەوە بە عیبادەت کە ئیمانیان هێناوە بە خودا و بە ڕۆژی ئاخیرەت ، وە نوێژەکانیان ڕادەپەڕێنن بە جوانی، وە زەکات دەبەخشن ، وە لە هیچ کەس ناترسن جگە لە الله. جا بە تەئکید ئەوانە هیدایەت دراون )**

**سێیەم :**﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِىَ فِى ٱللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ ﴾

واتە :﴿ هەندێك لە خەڵكی دەڵێن: ئیمانمان هێنا بە خودا، جا كاتێك بەهۆی ئیمان هێنان بە خودا و دینداریەوە ئازار دران ، واحساب دەكەن كە فیتنەی خەڵكی ( واتە : بەڵای خەڵكی )، وەك عەزابی خودایە ﴾ تەواو

(واتە : لە دەست ئازار و سزای خەڵكی ڕادەكەن و خۆیان دەخەنە ناو سزا و عەزابی خوداوە )

**94**– عن أبي سعيد ﷺ مرفوعا: (إن من ضعف اليقين: أن ترضى الناس بسخط الله، وأن تحمدهم على رزق الله، وأن تذمهم على مالم يؤتك الله، إن رزق الله لا يجره حرص حريص، ولا يرده كراهية كاره).

**95**– وعن عائشة رضي الله عنها: أن رسول الله ﷺ قال: ( من التمس رضى الله بسخط الناس رضي الله عنه وأرضى عنه الناس، ومن التمس رضى الناس بسخط الله سخط الله عليه وأسخط عليه الناس) رواه ابن حبان في صحيحه.

---

94–شفی ئەبوسەعید بە مەرفوعی ڕیوایەتی كردوە ( یەقین بوون بە خوداو دینەكەی . سێ شت لاوازی دەكەن :

یەكەم : ئەوەیە كەخەڵكی ڕازی بكەیت ، لەبەرانبەر ئەوەدا خودا لە خۆت ناڕازی بكەیت .

دووەم : حەمدو ستایشی خەڵكی بكەیت لەسەر ئەوەی كە خودا ڕزقی داویت و پێتی بەخشیوە .

سێیەم : زەم و لۆمەی خەڵكی بكەیت لەسەر ئەوەی كە خودا، ڕزقێك یا شتێكی نەبەخشیوە پێت . بە تەئكید ڕزقی خودا . سوربونی كەسانی بە تەماع ڕایناكێشێت ، وە كەسانێكیش پێیان ناخۆشبێت كە ئەو ڕزقەی بۆ بێت ناتوانن بیگێڕنەوە) تەواو.

---

94 ضعيف . أخرجه أبو نعيم في الحلية

95- ﴿عائیشه (رضي الله عنها ) دەگێڕێتەوە  کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی:(هەر کەسێك بەدوای ئەوەدا بگەڕێت کە خودا لە خۆی ڕازی بکات، لە بەرانبەر ئەوەدا خەڵکی لێی ناڕازی بن، ئەوا خودا لێی ڕازی دەبێت وەهاش دەکات کە خەڵکی (موسوڵمان ) لێی ڕازی بن . وە هەرکەسێك بەدوای ئەوەدا بگەڕێت کە خەڵکی ڕازی بکات . لەبەرانبەر  ئەوەشدا خودا لێی ناڕازی بێت ، ئەوا خودا لێی تورە دەبێت و خەڵکیشی لیٚ تورە  دەکات ) تەواو .

فيه مسائل:  الأولى: تفسير آية آل عمران.

الثانية: تفسير آية براءة.  الثالثة: تفسير آية العنكبوت.

الرابعة: أن اليقين يضعف ويقوى.  الخامسة: علامة ضعفه، ومن ذلك هذه الثلاث.

السادسة: أن إخلاص الخوف لله من الفرائض.

السابعة: ذكر ثواب من فعله.          الثامنة: ذكر عقاب من تركه

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی ئالی عیمڕان .

2-  تەفسیری ئایەتەکەی  سورەتی{براء ة}

3- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی{ العنکبوت}

4- یەقین لاواز دەبێت و بەهێز دەبێت (واتە: کەم دەکات و زیاد دەکات )

5- نیشانەی لاوازی یەقین، لەوانەش ئەو سیانەن کە لە حەدیسەکەی ئەبوسەعیدا باس کراوە .

6-  ئیخلاص لە ترسدا بەوەی کە تەنها لە خودا بترسین (تەوحیدە)، یەکێکە لە واجبات ،

---

95 حسن  أخرجه الترمزي(2414) وابن حبان  (276)

7- باسی پاداشتی هەركەسێ كە ئەوكارە بكات ( واتە: تەنها لە خودا بترسێت ) .

8- سزای هەركەسێك كە بەو جۆرە نەكات .

__ڕوونكردنەوە__ : ترس سێ جۆرە

1- ترسی نهێنی: ئەوەیە كە لە غەیری خودا بترسێت كە زیانی پێ بگەیەنێت بە نهێنی، جن بێت یا تاغوت بێت، یا ئەولیاو صالیحان بێت، ئەمەیان شیركی گەورەیە .

2- ترسی حەرام : ئەوەیە كە ئینسان لە ترسا، واز لە واجبات و ئەركە دینیەكان بهێنێت، ئەمەیان هۆی دابەزینی ئایەتەكەی ئالی عیمرانە. و شیركی بچوكە .

3- ترسانی سروشتی یا (**طبیعی**) : وەك ترسان لە دڕندە یا دوژمنێك كە زیانت پێبگەیەنن، بەڵام ئەم ترسە، هانی نادات واز لە ئەرك و واجباتی دینی بهێنێت . ئەمەیان ئاساییە

**32** باب قول الله تعالى: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٢٣﴾[المائدة]

وقوله: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ) الآية

وقوله (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ) الآية

وقوله ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ﴾

---

## بابی 32

# باسی پشت بەستن بە خودا کە عیبادەتە وپشت بەستن بە غەیری خودا شیرکە

**بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە دانەر چوار ئایەتی هێناوە**

**یەکەم:** ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٢٣﴾

**واتە :( تەوەکول تەنها بە خودا ببەستن، نەکەن تەوەکول بەغەیری خودا ببەستن ئەگەر ئیماندارن).**

**دووەم:** ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٢﴾ {**الأنفال** }

واتە :(بە تەئکید ئیمانداری تەواو ئەو کەسانەن کە کاتێ ناوی خودا هێندرا دڵیان ڕادەچڵەکێت ، وە کاتێك ئایەتەکانی قورئان خوێندرایەوە بە سەریاندا ئیمانیان پێ زیاد دەکات، وە تەنها بە خودا تەوەکول دەبەستن ).

سێیەم : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٤ ﴾ {الانفال}

واتە :( ئەی پێغەمبەر، بەستە کە ﷲ پشت و پەنات بێت . ئەو ئیماندارانەش کە شوێنت کەوتون، بەسیانە هەر ئەو پشت و پەنایان بێت )

چوارەم :﴿ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ ﴾ الطلاق: ٣

واتە :(وە هەرکەسێ تەوەکول و پشت بەستنی بە خودا بێت : ئەوا خودا بەسیەتی کە پشت و پەنای ئەو بێت ) ( واتە : دەیپارێزێت و دوژمن زیانی پێ ناگەیەنێت )

**96**- عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: ( حسبنا الله ونعم الوكيل )

قالها إبراهيم ﷺ حين ألقي في النار، وقالها محمد ﷺ حين قالوا له:

(إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ)

رواه البخاري والنسائي.

**فيه مسائل:**

الأولى: أن التوكل من الفرائض. الثانية: أنه من شروط الإيمان.

الثالثة: تفسير آية الأنفال. الرابعة: تفسير الآية في آخرها. الخامسة: تفسير آية الطلاق.

السادسة: عظم شأن هذه الكلمة، وأنها قول إبراهيم ومحمد ﷺ في الشدائد.

---

96 – (ابن عباس ) دەڵێت :﴿ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ١٧٣ ﴾ کاتێك ئیبراهیم هەڵدرایە ناو ئاگرەکەوە ، ئەوەی گوت ، و محمد یش ﷺ هەروای گوت کاتێ گوتیان پێی :(بە تەئکید خەڵکی کۆبونەوە بۆ جەنگی ئێوە جا کەواتە لێیان بترسن ، ئەمانیش ئیمانیان بەوە زیادی کرد و گوتیان ﴿ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ ﴾

---

96 96. البخاري (4563) والنسائي في الكبرى .

واتە : خودا تەنها خۆی بەسمانە، کە پیلانی دوژمنان پوچەڵ بکاتەوە، و نائومێدیان بکات .

وە گوتیان (وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ) واتە :( هەرئەو باشترین کەسە، کە کارەکانمان بدەینە دەستی، خۆی دەزانێت چی باشە ئەوەمان بۆ دەکات ) تەواو

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1. تەوەکول و پشت بەستن بەخودا : یەکێکە لە واجباتەکانی دین .
2. تەوەکول شەرتی ئیمانە :(واتە هەر کەس پشت بە خودا نەبەستێت ئیمانی نیە )
3. تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی **الأنفال** .
4. تەفسیری ئایەتەکەی ئەخیری سورەتی **الأنفال** .
5. تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی **الطلاق** .
6. گەورەیی و قەدری ئەم کەلیمەیە : کە وتەی ابراهیم ﷺ و محمد ﷺ بووە لە هەڵوێست و کاتە سەختەکاندا.

***ڕوونکردنەوە*** :

**یەك:** پێناسەی تەوەکول یاپشت بەستن بە خودا : ئەوەیە کە هەموو کارەکانت بدەیتە دەست خودا ، لەدڵیشەوە . ئیعتیماد و متمانەت بە ئەو بێت ، ڕازی بیت کە خودات بەس بێت و وەکیلت بێت .

**دوو** : پشت بەستن بە غەیری خودا دوو جۆری هەیە :

یەکەمیان : پشت بەستن بە مەخلوقاتەکان، لە کارێکدا کە تەنها خودا بتوانێت ئەو کارانە بکات ، وەك شیفادان ، سەلامەتکردن ، پاراستن، ئەمەیان شیرکی گەورەیە .

دووەمیان: پشت بەستن بە مەخلوقات لە کارێکدا کە لە توانیدا ببێت ئەمەش پێی دەگوترێت : پشت بەستن بە ئەسباب ئەمەیان شیرکی بچوکە .

**سێ** : (هەندێك لە سەلەف گوتویانە : خودا، بۆ هەر کارێك پاداشتێکی داناوە، کە لە جۆری کردەوەکەیە، پاداشتی تەوەکول و پشتن بەستن بە خودا، ئەوەیە کە خودا هەر خۆی پشتی دەگرێت و کارەکانی بۆ ئاسان دەکات ، خودا فەرموی : هەرکەس

تەوەكولی بە خودا بێت  ئەوا خودای بەسە، نەیفەرمووە ئەوە و ئەوەی پێدەدرێت  لە پاداشتدا ، هەروەك لە كردەوەكانی دیكە دا فەرمویەتی ) ....فتح المجید

**33** – باب قول الله تعالى:

﴿ أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٩٩ ﴾ **الأعراف**

وقوله: ﴿ قَالَ وَمَن يَقۡنَطُ مِن رَّحۡمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ٥٦ ﴾ الحجر

**97**– عن ابن عباس رضي الله عنهما، أن رسول الله ﷺ سئل عن الكبائر، فقال: ( الشرك بالله، واليأس من روح الله، والأمن من مكر الله ).

**98**– وعن ابن مسعود رضي الله عنه قال:(أكبر الكبائر: الإشراك بالله، والأمن من مكر الله، والقنوط من رحمة الله، واليأس من روح الله) رواه عبد الرزاق.

فيه مسائل:   الأولى: تفسير آية الأعراف.   الثانية: تفسير آية الحجر.

الثالثة: شدة الوعيد فيمن أمن مكر الله.     الرابعة: شدة الوعيد في القنوط.

---

## بابی33

## باسی ئەمین بوون لە فێڵ و پیلانی خودا ونائومێد بوون لە ڕەحمەتی خودا

﴿ أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٩٩ ﴾ {**الأعراف** : }

واتە :( ئایە ئەوانە لە فێڵ و پیلانی خودا، ئەمین بوون. هیچ کەس لە فێڵی خودا ئەمین نابێت مەگەر قەومێك کە تەواو خەسارەتمەندبن )

﴿ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ ﴾{**الحجر** : }

واتە:(کێ هەیە لە ڕەحمەتی پەروەردگاری نا ئومێد بێت (کە صیفەتی زاتی خودایە) مەگەر ئەوکەسانەی کە تەواو گومڕابوون )

97-[97]ابن عباس رضي الله عنه دەڵێت: سوئال کرا لە پێغەمبەری خودا ﷺ لەبارەی تاوانە گەورەکانەوە ؟ ئەویش فەرموی :﴿ئەمانەن: شەریك دانان بۆ خودا ، و نائومێد بون لەوەی کە خودا دەروی خێرت لێبکاتەوە، وە ئەمین بوون لە فێڵی خودا ﴾ تەواو

98-[98] ابن مسعود دەڵێت : (گەورەترینی تاوانە گەورەکان ئەمانەت : شەریك دانان بۆ خودا و ئەمین بون لە فێڵی خودا ( لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکاندا، وە نائومێد بون لە ڕەحمەتی خودا ، وە بە دوور زانین و نائومێد بون لەوەی کە خودا (لە کاتی ناڕەحەتیدا ) دەرگای خێرت لێ بکاتەوە)

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی ئەعراف

2- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی حیجر

3- هەڕەشەی توند لە سەر ئەوکەسانەی کە لە فێڵی خودا، ئەمین و بێ غەم دەبن .

4- هەڕەشەی توند لە نائومێد بوون لە ڕەحمەتی خودا .

ڕوونکردنەوە : ئەم بابە باسی دوو تاوانی گەورە دەکات

یەکەمیان : نەترسان لە خودا

---

97 حسنه الألباني في صحيح الجامع (4476) أخرجه البزار (106) وابن أبي حاتم في التفسير وأخرج البخاري نحوه معّلقا.

98 موقوف صحيح ، أخرجه عبدالرزّاق (19706) والطبراني في الكبير (8783) .

دووەمیان : ترسێکی زۆر لە خودا کە ئینسانەکە نائومێد بێت لەوەی کە خودا ڕەحمی پێ بکات . نیشانەکەشی ئەوەیە کە ئینسانەکە هەوڵ نادات بۆ ڕەزامەندی خودا و تەمەڵی دەیگرێت ولە خودا ناپاڕێتەوە .

**34**– باب من الإيمان بالله الصبر على أقدار الله

وقول الله تعالى: ﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ﴾

**99**– قال علقمة: هو الرجل تصيبه المصيبة فيعلم أنها من عند الله، فيرضى ويسلم.

**100**– وفي صحيح مسلم عن أبي هريرة ، أن رسول الله ﷺ قال: (اثنتان في الناس هما بهم كفر: الطعن في النسب، والنياحة على الميت).

---

بابی 34

## باسی یەکێك لە صیفەتەکانی ئیمان هێنان بە خودا صەبر گرتنە لەسەر قەدەرەکانی

**خودای بڵند فەرمویەتی:** ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾ التغابن

واتە :( هەرکەسێك ئیمان بهێنێت بە خودا، ئەوا لە پاداشتی ئەوەدا خودا هیدایەتی دڵی دەدات، و خوداش بە هەموو شتێك زانایە و عەلیمە . دەزانێت چی باشە بۆ عەبدەکانی ئەوەیان بۆ دەکات )

99–[99]عەلقەمەی نەخەعی لە بارەی تەفسیری ئەو ئایەتەوە دەڵێت :(ئەوە باسی پیاوێك دەکات کە هەر موصیبەتێکی دێت بەسەردا ، دەزانێت ئەو موصیبەتە لەلایەن خوداوەیە، ئەو جا بە قەدەری خودا ڕازی دەبێت و خۆی تەسلیمی خودا دەکات ).

100– [100]پێغەمبەرﷺ فەرموی :(دوو صیفەت لە ناو خەڵکیدا دەمێننەوە و کفریشن : یەکیان تانە دانە لە نەسەبی خەڵکی، دووەمیان : شیوەن کردنە لە سەر مردوو )

**101**– ولهما عن ابن مسعود مرفوعاً: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ وَشَقَّ الْجُيُوبَ وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ )

**102**– وعن أنس رضي الله عنه، أن رسول الله ﷺ قال: (إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدِهِ الْخَيْرَ عَجَّلَ لَهُ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدِهِ الشَّرَّ أَمْسَكَ عَنْهُ بِذَنْبِهِ حَتَّى يُوَافِيَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)

**103**– وقال النبي ﷺ:( إِنَّ عِظَمَ الْجَزَاءِ مَعَ عِظَمِ الْبَلَاءِ وَإِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ قَوْمًا ابْتَلَاهُمْ فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السَّخَطُ ) حسنه الترمذي.

---

101– [101]ابن مسعود رضي الله عنه دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : ئەو کەسە لە ئێمە نیە کە (لە کاتی بەڵاو موصیبەتا ) لە ڕوومەتی خۆی بدات ( واتە لە سنگی خۆی یا ڕانی بدات یا بکێشێت بە سەری خۆیدا ) یایەخەی خۆی دابدڕێت و بانگەوازی نەفامی وجاهیلی هەڵبدات ) تەواو

---

99 أخرجه الطبري في التفسير (34194) وعبد الرزاق في التفسير وأخرج البخاري نحوه معّلقا .

100 مسلم (67) وأحمد .

101 البخاري (1297) ومسلم (103) والترمذي (999)

102- ئەنەس دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرموی :(ئەگەر خودا چاکەی (ئاخیرەتی) بویێت بۆ عەبدەکەی ، سزای گوناهەکانی ناخاتە قیامەت ، بەڵکو هەر زوو سزای دەدات ( واتە بە بەڵا و موصیبەت ) بۆ ئەوەی بە پاکی بگەڕێتەوە . ئەگەر خراپەی عەبدەکەشی بویێت (لەپاشتی کردەوەکانیدا) ئەوا لێی دەگەڕێت بە گوناهەکانیەوە بمێنێتەوە، هەتا بەو گوناهانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دەگاتەوە بە پەروەردگاری )

103- پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی :(ئەڵبەتە پاداشتی گەورە (لای خودا )، لەگەڵ بەڵا و ئیمتیحانی گەورەدایە (ئەگەر صەبر بگرێت و بەتەمای خودابێت ) و بەتەئکید ئەگەر خودا قەومێکی (ئیمانداری ) خۆشویست ، ئەوا توشی بەڵا و موصیبەتیان دەکات ، جا هەرکەس لە گەڵ ( صەبر گرتندا) ڕازی بێت (بە خودا)، ئەوا خودا لێی ڕازی دەبێت . هەر کەسێکیش ناڕازی بێت ئەوا پاداشتەکەی ئەوەیە ) خودا لێی ناڕازی دەبێت ).

فيه مسائل:

الأولى: تفسير آية التغابن. الثانية: أن هذا من الإيمان بالله. الثالثة: الطعن في النسب.

الرابعة: شدة الوعيد فيمن ضرب الخدود وشق الجيوب ودعا بدعوى الجاهلية.

الخامسة: علامة إرادة الله بعبده الخير. السادسة: إرادة الله به الشر.

السابعة: علامة حب الله للعبد. الثامنة: تحريم السخط. التاسعة: ثواب الرضي بالبلاء.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی التغابن (بەم جۆرەیە )

2- صەبرگرتن لە سەر قەدەری خودا : بەشێکە لە ئیمان هێنان بە خودا .

3- تانەدان لە نەسەب و عەیبدار کردنی ( کوفرە).

---

102 جيد الترمذي (2396) والحاكم (8799) وصححه الألباني في الصحيحة .

103 حسن .أخرجه الترمذي (2396) . وابن ماجة (4031) وهو في السلسلة الصحيحة .

4- هەڕەشەی توند لەسەر هەرکەسێ ، کە لە ڕومەتی خۆی دەدات و یەخەی خۆی دەدڕێت ، و بانگەوازی جاهیلی و نەفامی هەڵدەدات .

5- نیشانەی ئەوەی کە خودا بیەوێت عەبدەکەی توشی چاکە بکات .

6- (ئەگەر ) خودا، بیەوێت عەبدەکەی توشی بەدی بکات. (نیشانەکەی چیە )

7- نیشانەی خۆشەویستی خودا، بۆ عەبدەکەی .

8- ناڕازی بوون بە کاری خودا (حەرام کراوە ) .

9- پاداشتی ڕازی بوون بە بەڵاو موصیبەت (ئەوەیە کە خودا لێی ڕازی دەبێت )

***__ڕوونکردنەوە:__*** صەبر واتە ئارام گرتن سێ نەوعە

**یەکەم : صەبر گرتن لەسەر تاعەتی خودا .**

**دوەم: صەبرگرتن لەوەدا کە بێفەرمانی خودا نەکرێت .**

**سێیەم : صەبرگرتن لەسەر قەدەری خودا واتە موصیبەتەکان کە ئەمەیان مەبەستی دانەرە لەم باسەدا.**

**حەدیسی103 باسی پلەی ڕازی بوون دەکات و پلەی عەبدەکەی پێ بەرز دەبێتەوە .**

## 35- باب ما جاء في الرياء

وقول الله تعالى: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَاْ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ الآية [ الكهف : 110]

**104**- عن أبي هريرة مرفوعاً: قَالَ اللَّهُ تَعَالَى أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ مَعِى فِيهِ غَيْرِى تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ » رواه مسلم.

**105**- وعن أبي سعيد مرفوعاً (أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِمَا هُوَ أَخْوَفُ عَلَيْكُمْ عِنْدِى مِنَ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ ؟ , قُلْنَا : بَلَى. فَقَالَ : الشِّرْكُ الْخَفِىُّ : أَنْ يَقُومَ الرَّجُلُ يُصَلِّى , فَيُزَيِّنُ صَلاَتَهُ لِمَا يَرَى مِنْ نَظَرِ رَجُلٍ). رواه أحمد.

---

## بابی 35

# باسی ڕیا كە شیركە

﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾ ﴾ الكهف

**واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: من تەنها ئینسانێكم وەك ئێوە، (جیاوازیمان ئەوەیە كە ) من وەحیم بۆدێت (لە لایەن خوداوە) ، خالق و پەرستراوی بە حەقی ئێوە یەك پەرستراوە كە اللّٰه یە، جا هەركەس بە تەمای ئەوەیە، بگات بە دیداری پەروەردگاری ، با كردەوەی چاكە بكات (بە پێی سوننەت ) و لەگەڵ پەرستنی خودا دا، هیچ كەسی دیكە نەكات بە شەریكی خودا ).**

**104– پێغەمبەر[104] ﷺ فەرمویەتی: خودای بەرز و بڵند فەرمویەتی:**

**﴿من دەوڵەمەنترین و بێ نیازترین ئەو كەسانەم كە شەریكم بۆ داندراوە و پێویستم بە هیچ جۆرێكی شەریكایەتی نیە ، جا هەر كەس كردەوەیەكی باش یا عیبادەتێ بكات ، لەناو كارەكەیدا كەسێك بكات بە شەریكم، ئەوا واز دەهێنم لە خۆشی و ئەو كارەشی لێ وەرناگرم ) لە ڕیوایەتەكەی ابن ماجەدا دەڵێ : دەیدەم بەو كەسەی كە كردوویەتی بە شەریكم .**

**فیه مسائل:**

الأولى: تفسير آية الكهف.

الثانية: الأمر العظيم في رد العمل الصالح إذا دخله شيء لغير الله.

الثالثة: ذكر السبب الموجب لذلك، وهو كمال الغنى.

الرابعة: أن من الأسباب، أنه تعالى خير الشركاء. الخامسة: خوف النبي ﷺ على أصحابه من الرياء.

السادسة: أنه فسر ذلك بأن يصلي المرء لله، لكن يزينها لما يرى من نظر رجل إليه.

---

**104** مسلم (2985) وابن ماجة (4202)

105- ئەبوسەعید دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئایا پێتان ڕابگەیەنم چ شتێکی مەترسی زیاترە بۆ ئێوە لە مەسیحی دەجال؟ گوتیان : بەڵێ ، فەرموی : شیرکی شاراوەیە ، ئەمیش ئەوەیە پیاوێك هەڵدەستێت نوێژ دەکات و نوێژەکەی دەڕازێنێتەوە ، ئەمەش لە بەر ئەوەی دەبینێ پیاوێ تەماشای دەکات ) تەواو.[105]

ڕوونکردنەوە : شیرکی شاراوە مەبەست ئەو جۆرە شیرکەیە کە تەنها کاری دڵە و شاراوەیە و تەنها خودا پێی دەزانێت. ئەم فەرموودەیە دەیسەلمێنێت کە ڕیا جۆرێکە لە شیرك.

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی الکهف

2- ئەو کارە، مەزنە ئەوەیە کە هەر کردەوەیەکی چاکە ، ئەگەر شتێکی بۆ غەیری خودا ، تێکەڵ بوو، ئەوا ڕەد دەکرێتەوە .

3- باسی هۆی ڕەد کردنەوەی ئەو کردەوانە. ئەویش ئەوەیە کە خودا لە دەوڵەمەندیدا تەواوە موحتاجی شەریکایەتی نییە.

4- یەکێ لەو هۆیانە ئەوەیە کە خودا لە ناو هەموو شەریکەکاندا لە هەر هەموویان باشترە .

5- ترسی پێغەمبەر(ﷺ) لەوەی کە ئەصحابەکان توشی ڕیا ببن.

6- پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بەوە تەفسیر کردووە کە ئینسان نوێژ بۆ خودا بکات . بەڵام نوێژەکەی بە جوانی بکات لە بەر ئەوەی کە پیاوێ تەماشای دەکات .

**ڕوونکردنەوە: پێناسەی ڕیا لە شەرعدا**

( فهو عمل الصالحات يريد مدح الناس وثناءهم)

---

105 حسن أخرجه أحمد(11272) وإبن ماجة (4204)

ئەنجام دانی کردەوە چاکەکانە واتە عیبادەتەکان ، بە نیەتی ئەوەی خەڵکی مەدح وستایشی بکەن.

فەرموی (**ترکتە وشرکە**) واتە کردەوەکەی پوچەڵ دەبێتەوە .

## 36- باب من الشرك إرادة الإنسان بعمله الدنيا

وقول الله تعالى: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ هود

**106**- وفي الصحيح عن أبي هريرة قال: قال رسول الله ﷺ: "تَعِسَ عبدُ الدّينارِ تَعِسَ عبدُ الدّرهمِ تَعِسَ عبدُ الخَميصةِ تَعِسَ عبدُ الخميلة: إن أعطِيَ رضيَ وإن لم يُعْطَ سَخِطَ, تَعِسَ وانتَكَسَ, وإذا شِيكَ فلا انتُقِشَ. طَوبى لعَبدٍ آخِذ بعِنانِ فرَسِهِ في سبيلِ اللهِ, أشعثٍ رأسُهُ مغبرةٍ قدماهُ, إن كان في الحراسةِ كان في الحراسةِ, وإن كان في الساقة كان في الساقة. إنِ استأذَنَ لم يؤذَنْ له, وإن شَفَعَ لم يُشَفّعْ".

---

## بابی 36

# باسی جۆرێك لە شیرك ئەوەیە کە ئینسان بیەوێت لە بەرانبەر کردەوە چاکەکانیدا دونیای دەست بکەوێت .

تەفسیری ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ..... )

**واتە : هەر کەس (لە بەرانبەر کردەوە چاکەکانیدا نیەتی ئەوەی هەبێت کە (پاداشتی) دونیاو جوانیەکانی دونیا بە دەست بهێنێ کە ماڵ و منداڵە ئەوا هەر لە دونیادا بە بێ هیچ کەمی و نوقصانیەك پاداشتی کردەوەکانیان دەدەینەوە . ئەوانە لە ئاخیرەتدا جگە لە ئاگر هیچی دیکەیان دەست ناکەوێت . هەرچی کردەوەیەکی چاکەشیان کردووە (ئەوا لە قیامەتدا پوچەڵ دەردەچێت) هەموو کردەوە چاکەکانیشیان بە زایە چووە ) تەواو**

106- **ئەبوهورەیرە** رضي الله عنه **دەڵێت : پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموی :(دەك بە دەمدا بکەوێت عەبدی دینار . بکەوێت بە دەمدا عەبدی درهەم . بکەوێت بە**

---

**106** البخاري (2887)

فيه مسائل: الأولى: إرادة الإنسان الدنيا بعمل الآخرة. الثانية: تفسير آية هود.
الثالثة: تسمية الإنسان المسلم: عبد الدينار والدرهم والخميصة.
الرابعة: تفسير ذلك بأنه إن أعطي رضي، وإن لم يعط سخط
الخامسة: قوله (تعس وانتكس). السادسة: قوله: (وإذا شيك فلا انتقش).
السابعة: الثناء على المجاهد الموصوف بتلك الصفات.

---

دەمدا عەبدی پۆشاك . بكەوێت بە دەمدا عەبدی پەتوو. ( نیشانەی عەبدی دونیا ئەمەیە و بەمەدا دەیناسیتەوە) ئەگەر پێی بەخشرا ڕازی دەبێت وبێدەنگ دەبێت ، ئەگەر پێشی نەبەخشرا ناڕازی دەبێت . بە دەمابكەوێت وبشكەوێت بە ملدا وە ئەگەر دڕكێ چوو بە گیانیدا بۆی دەرنەیەتەوە ( واتە : ئەگەر كەوتە ناڕەحەتیەوە لێی دەر باز نەبێت).

مژدەی بەهەشت بۆ عەبدێك كە ئەم صیفەتانەی تێدایە :

1. هەمیشە ئامادەیە و دەستی گرتووە بە جڵەوی ئەسپەكەیەوە و لە جیهادایە،
2. لە ڕێگەی خودا دا (واتە : كارەكەی بە ئیخلاصەوە دەكات).
3. (هەمیشە مەشغولە نیشانەكەی ئەوەیە) قژوسەری ئاڵۆزاو وگیانی خۆڵاویە .
4. ئەگەر لە حەرەسیاتا دانرا حەرەسیاتەكەی بە جوانی بەڕێوەدەبات وە ئەگەر لە ئەخیری سوپاوە دانرا، گوێی ناداتێ هەر كاری خۆی ڕادەپەڕێ.
5. (پلەو پایەی لای خەڵكی بەم جۆرەیە) ئەگەر ئیزنی خواست لە ئەمیر و كاربەدەستان كە بڕواتە لایان یا قصە بكات ئیزنی نادەن، ئەگەر تكاشی كرد، تكای لێ وەرناگیرێت ) تەواو

## مەسەلەكانی ئەم باسە

1- ئینسان لە بەرانبەر كردەوەی ئاخیرەتدا ، داوای دونیادەكات .

2- تەفسیری ئایەتەكەی سورەتی هود.

3- لەو حەدیسەدا ئینسانی موسڵمان ناو براوە ، بە عەبدی دینار و درهەم و پەتوو.

4- تەفسیری ئەوەش ئەوەیە کە :ئەگەر هەر شتێکی داوا کرد و پێی درا ئەوا ڕازی دەبێ وە ئەگەر پێی نەدرا ناڕازی دەبێت .

5- فەرموودەکەی :(بەدەمدا بکەوێت و بە ملدا بکەوێت) .

6- فەرموودەکەی :(ئەگەر دڕك چوو بە جەستەیدا بۆی دەرنەیەتەوە)

7- ستایش کردنی ئەو موجاهیدەی کە ئەو صیفاتانەی تێدایە .

***ڕوونکردنەوە*** :

لە بارەی ئەو ئایەتەوە ، سوئال کرا لە (دانەر ) بە ڕەحمت بێت لە جوابدا گوتی :(ئەوە چەند نەوعێ دەگرێتەوە:

***یەکەم*** : موشریك و کافر : لەم دونیایەدا کردەوەی چاکە دەکەن ، وەك بەخشینی خواردن و ڕێزگرتن لە دراوسێ و ڕێزگرتن لەدایك وباوك و ئەنواعی چاکە : ئەوە لە ئاخیرەتدا پاداشتی نیە ، چونکە لەسەر (بناغەی) تەوحید ئەو کارانەی نەکردوە ... ئەمە بەر ئەو ئایەتە دەکەوێت کە فەرمووی (مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا) لەوانەیە پاداشتی کردەوەکەی بدرێتەوە لەدونیادا ...

***دووەم*** : ئیمانداریك ، کردەوەی چاکەدەکات ، لەبەر خودا نایکات ، بەڵکو تەنها بۆ تەماعی دونیا دەیکات ، وەك ئەو کەسەی حەج دەکات بۆ پارە لە جیاتی خەڵکی دی، یا وەك ئەوەی زانستی شەرعی دەخوێنێ بۆ ئەوەی وەزیفەیەکی پێبدەن ، ئەمە کردەوەیەکی بەتاڵە لە دونیادا ، لە ئاخیرەتیشدا پوچ دەردەچێت . ئەمە شیرکی بچوکە.

***سێیەم*** : ئیمانداریك کردەوەی چاکەدەکات ، بۆ خودا . نە لەبەر دونیا و نە لەبەر وەزیفە ، بەڵکو دەیەوێت خودا پاداشتی بداتەوە ، وەك (ئەوەی دەیەوێت خودا شیفای بدات ، یا لەچاو یا لە دوژمن بیپارێزێت ، ئایەتەکە ئەمەش دەگرێتەوە .

بەڵکو موسوڵمان دەبێت لەوە بەرزتر داوابکات و هیمەتی بەرز بێت . ئەگەر بە تەماعی ئاخیرەتەوە کردەوەی چاکە بکات ، ئەوا خوداش کارەکانی دونیای بۆئاسان دەکات و کۆمەکی دەکات .

***چوارەم*** : کەسێ کردەوەی چاکە دەکات، پاشان بەهۆی شیرکەوە، هەمووی هەڵدەوەشێنێتەوە ) تەواو

**37**– باب من أطاع العلماء والأمراء في تحريم ما أحل الله أو تحليل ما حرم الله فقد اتخذهم أرباباً من دون الله

**107**– وقال ابن عباس: يوشك أن تنزل عليكم حجارة من السماء، أقول: قال رسول الله ﷺ وتقولون: قال أبو بكر وعمر؟!

وقال الإمام أحمد: عجبت لقوم عرفوا الإسناد وصحته، يذهبون إلى رأي سفيان، والله تعالى يقول:

﴿ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾

أتدري ما الفتنة؟ الفتنة: الشرك، لعله إذا رد بعض قوله أن يقع في قلبه شيء من الزيغ فيهلك.

---

## بابی 37

## هەر كەسێك ئیتاعەی زانا و ئەمیر و سەركردەكان بكات ، لەوەدا كە شتێك حەرام بكرێت كە خودا حەڵاڵی كردوە . یاشتێ حەڵاڵبكرێت كە خودا حەرامی كردوە ، ئەوا ئەوانی كردوە بە خودا و پەرستراوی خۆی جگە لە ﷲ

107–(ابن عباس ) [رضي الله عنهما] دەڵێت:﴿نزیكە لە ئاسمانەوە بەرد دابارێت بەسەرتاندا ، (چونكە) دەڵێم : پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئاوای فەرمووە ، ئێوەش ڕەدی دەكەنەوەو دەڵێن : ئەبوبەكر و عومەر ئاوایان گوتوە )

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت :(سەرم سوڕماوە لەو كەسانەی كە شارەزای ئیسنادی حەدیسن و دەشزانن كام حەدیسە صەحیحە . ( واتە : زانان ) دەڕۆن شوێن ڕەئی سوفیانی سەوری دەكەون . خوداش دەفەرموێ:

﴿ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾ النور

---

**107** صحيح لغيره . أخرجه أحمد (3121)صححه أحمد شاكر في المسند

واتە : ﴿ئەوانەی کە موخالەفەی ئەمری پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەکەن ولێی لا دەدەن با بترسن و خۆیان پارێزن لەوەی کە توشی فیتنە یا سزایەکی بە سویٚ ببن ﴾ دەزانن ئەم فیتنەیە چییە کە لەم ئایەتەدا باس کراوە؟

**108**– عن عدي بن حاتم: أنه سمع النبي ﷺ يقرأ هذه الآية:

(اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ) فقلت له: إنا لسنا نعبدهم قال: (أليس يحرمون ما أحل الله فتحرمونه ويحلّون ما حرم الله، فتحلونه؟) فقلت: بلى. قال فتلك: عبادتهم) رواه أحمد، والترمذي وحسنه.

---

ئەم فیتنەیە شیرکە ، نەبادا ئەگەر هەندیٚ وتەی پێغەمبەر ﷺ ی ڕەد کردەوە ( لەبەر خاتری قسەی کەسیٚ کە خۆی بە زانا یا بە خوداپەرستی دەزانیٚ )، بەو هۆیەوە کەمێك لادان لە دڵیدا ڕوو بدات، بەو هۆیەوە بە هیلاکدا بچێت ﴾

108 –رضي الله عنه عەدی کوڕی حاتەم (کە نەصرانی بوو پاشان بوو بە موسڵمان ) ، دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) ئەم ئایەتەی دەخوێند

﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ﴾ التوبة: ٣١

واتە :( جولەکە و نەصرانیەکان زانا و خوداپەرستەکانی خۆیان کردبوو بە پەرستراوی خۆیان، جگە لە ﷲ . وە مەسیحی کوڕی مەریەمیشیان کردبوو بە پەرستراوی خۆیان ، وە ئەوان هیچ ئەمرێکیان بە سەردا نەدرابوو ، تەنها ئەوە نەبێت کە یەك خودا بپەرستن، هیچ پەرستراوێك نیە کە حەق بێت جگە لە ﷲ . ئەویش پاك و بێگەردە دوورە لەوەی کە شەریکیان بۆ داناوە )

(أرباب ) واتە : شەریکیان بۆ خودا دانا بوو لە یاسا داناندا .

عەدی دەڵیٚ : منیش گوتم : ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە ( پێشتر کە نەصرانی بووین ) نەمانپەرستوون. (واتە سوجدە وڕکوعمان بۆ نەبردوون)

---

**108** حسن أخرجه الترمذي (3095) وأحمد .

فەرموی : ئەی ئەوە نیە ، ئەوەی خودا حەڵاڵی کردوە ئەمان هاتوون حەرامیان کردوە، ئێوەش یەکسەر بە حەرامتان دادەنا، ئەوەش کە خودا حەرامی کردوە ئەوان حەڵاڵیان کردوە ، ئێوەش یەکسەر بە حەڵاڵتان دادەنا ؟ منیش گوتم : بەڵێ وایە.

فەرموی: دەی ئەوە پەرستنەکەی ئەوانە ( کە لە ئایەتەکەدا باس کراوە ) تەواو .

فيه مسائل: الأولى: تفسير آية النور.

الثانية: تفسير آية براءة. الثالثة: التنبيه على معنى العبادة التي أنكرها عدي.

الرابعة: تمثيل ابن عباس بأبي بكر وعمر، وتمثيل أحمد بسفيان.

الخامسة: تغيّر الأحوال إلى هذه الغاية، حتى صار عند الأكثر عبادة الرهبان هي أفضل الأعمال، وتسمى الولاية، وعبادة الأحبار هي العلم والفقه ثم تغيرت الحال إلى أن عبد من دون الله من ليس من الصالحين، وعبد بالمعنى الثاني من هو من الجاهلين.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی نور.

2- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی بەڕائەت .

3- ئاگادار بون لە مەعنای عیبادەتکردن، ئەوەی ئەو جۆرەیان کە عەدی ئینکاری لێ دەکرد .

4- ( ابن عباس) هات ، ئەبوبەکر و عومەری کرد بە نمونە ، ئیمامی ئەحمەدیش سوفیانی سەوری کرد بە نمونە ..

5- ( گۆڕانی حاڵی خەڵکی ئەم سەردەمە ، هەتا وای لێهاتوە لای زۆرینەی خەڵکی، عیبادەت کردن بۆ خوداپەرستەکان ،( بە حسابی خۆیان ) ئەوە بە باشترین کردەوە دەزانن ، و ناویان لێناوە : دۆستایەتی و خۆشەویستی ئەولیاکان . واش دەزانن کە پەرستنی زاناکان ئەوە زانستە و فیقهە ( مەبەستی دانەر ئەوەیە هەر کەسێ وتەی زاناکان بخاتە پێش وتەی خودا و پێغەمەر ئەوە

**زاناكانی پەرستووە ) . پاشان ئەمڕۆ بار و دۆخەكە بەوە گەیشتوە، كە عیبادەت بۆ كەسانێك دەكرێت كە صالح نین ، بە مەعنای دوەمیش كەسانێك دەپەرسترێت كە نەفام وجاهیلن نەك زاناش بن).**

**38** – باب قول الله تعالى: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا) [ النساء 60– 62 ]

وقوله: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ قَالُواْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ)[ البقرة 11 ]

وقوله: (وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا ) [ الأعراف : 56 ].

وقوله: (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ) [ المائدة 50 ]

**109**– عن عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما، أن رسول الله ﷺ قال: ( لا يؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعاً لما جئت به) قال النووي: حديث صحيح، رويناه في كتاب "الحجة" بإسناد صحيح.

---

## بابی 38

# ئیمان هێنان بە پێغەمبەر و تەفسیری ئەو ئایەتە

**لەو بارەوە دانەر چوار ئایەتی هێناوە**

**یەكـــــــــــەم:** ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ٦٠ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا ٦١ فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا ٦٢ ﴾ النساء:

واتە :﴿ تۆ سەیری ئەوانە ناكەیت و لات عەجیب نیە ئیدعا دەكەن  كە ئیمانیان هێناوە بەوەی كە نازڵ كراوە بۆ تۆ ( چ قورئان بێت چ سوننەت) ، بەوەش كە نازڵ كراوە لە پێش تۆدا ، دەیانەوێت بڕۆن بۆلای تاغوت و حوكم  بدات لە نێوانیانـدا، وە بـە تەئكیـد ئـەمری ئـەوەیان پێكـراوە ( لـە لایـەن خـودا و پێغەمبەرەوە) كە بەرانبەر  تەواوی تاغوتەكان كافر بن (نەوەك بڕۆن ئیمانی پێ بهێنن بەوەی كە حوكمەكەیان بەرنەوە بۆلای ) . وە هەر یەك لە شەیتانەكانیش دەیەوێت گومڕایان بكات ، بە جۆرێك بە تەواوی دووریان بخاتەوە لە ڕێگای حەق و هیدایەت {60} وە كاتێ پێیان گوترا، وەرن بۆلای ئەوەی كە خودا دای بەزانـدوە بـۆلای پێغەمبەرەكـەی، دەبینیـت بـە تـەواوی پشـت لـە تـۆ دەكـەن {61}ئینجا دەبێت حاڵیان چۆنبێت كاتێ توشی موصیبەتێك بوون، بە هۆی تاوانەكانیانەوە، پاشان ( بە ناچاری ) دێنەوە بۆلات ( ئەوجا) سوێند دەخۆن بە خودا ( لەوەو بەر كە چوین بۆلای تاغوتەكان كە حوكم بدەن لە نێوانماندا ) نیەتمان تەنها ئەوە بوە كە چاكە بكەین و خۆمان لەگەڵ ئەواندا بگونجێنین، و عەقیدەشمان وا نەبووە كە ئەو حوكمە ڕاست بێت ﴾ تەواو

دووەم: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١ ﴾ البقرة

واتە:﴿ كاتێ بەو منافیقانە گوترا خراپە و فەساد مەنێنەوە لە سەر زەوی .دەڵێن ئێمە هەر خۆمان چاكسازین﴾

سێیەم:﴿ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا ﴾ {الاعراف:56 }

واتە :( لە گەڵ ئەوشدا خراپەو فەساد مەنێنەوە لە سەر زەوی  پاش ئەوەی سەر زەوی چاك كرا ) واتە :﴿ نەكەن بێفەرمانی خودا بكەن وبانگەواز بكەن بۆ لای غەیری خودا و پێغەمبەرەكەی ﴾

چوارەم : ﴿ أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ٥٠ ﴾{المائدة }

واتە :﴿ ئایا ئەوانە حوکمی جاهیلی و نەفامیان دەوێت ( لە حوکمی خودا لادەدەن ) ئەی جا کێ هەیە حوکمی جوانتر بێت لە حوکمی ﷲ ، لای قەومێك کە یەقینیان ببێت (بە شەرعی خودا )﴾ ابن کثیر

109–عبدالله کوڕی عومەر گوتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموی: (هەریەکێ لە ئێوە ئیمانی (کاملَی ) نیە هەتا وای لێدێت، ئارەزوەکانی شوێن ئەوە دەکەون کە من هێناومە واتە{قورئان وسونەت} .

110– وقال الشعبي: كان بين رجل من المنافقين ورجل من اليهود خصومة؛ فقال اليهودي: نتحاكم إلى محمد . لأنه عرف أنه لا يأخذ الرشوة . وقال المنافق: نتحاكم إلى اليهود . لعلمه أنهم يأخذون الرشوة – فاتفقا أن يأتيا كاهناً في جهينة فيتحاكما إليه، فنزلت: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ).

111– وقيل: نزلت في رجلين اختصما، فقال أحدهما: نترافع إلى النبي ﷺ وقال الآخر: إلى كعببن الأشرف، ثم ترافعا إلى عمر، فذكر له أحدهما القصة. فقال للذي لم يرض برسول الله ﷺ: أكذلك؟ قال: نعم، فضربه بالسيف فقتله.

---

110– شەعبی دەڵێت :(لە بەینی پیاوێکی مونافیق و پیاوێکی جولەکەدا ناکۆکی پەیدا بوو بوو، جولەکەکە گوتی: دەڕۆین بۆ لای محمد ، با حوکم بدات لە نێوانماندا ( چونکە دەیزانی پێغەمبەر (ﷺ) بەرتیل وەرناگرێت ) مونافیقەکەش گوتی : دەڕۆین بۆلای پیاوێکی جولەکە ( چونکە دەیزانی بەرتیل وەردەگرێت ) . پاشان ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە بچن بۆلای کاهینێ لە جوهەینە، و داوای لێبکەن حوکم بدات لەنێوانیاندا ، پاشان ئەو ئایەتە دابەزی:( أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ... )

---

109 أخرجه إبن أبي عاصم (15) والبغوي ضعّفه الألباني والأرناؤوط وابن رجب في جامع العلوم والحكم .

110 أخرجه الطبري(9896)

111- ﷺوه گوتراوه :( ئەوئایەتە لە بارەی دوو پیاوەوە دابەزیوە کە کێشەیان لە بەیندا پەیدا بوو بوو، یەکیان گوتی: کێشەکەمان دەبەین بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی دیکەیان گوتی دەیبەینەوە بۆلای کەعبی کوڕی ئەشرەف . پاشان کێشەکەیان بردەوە بۆلای عومەری کوڕی خەتاب. یەکیان بەسەر هاتەکەی بۆ گێڕایەوە . عومەریش بەوەیانی گوت  کە بەحوکمی پێغەمبەر ڕازی نەبوو بوو: جا بە ڕاست مەسەلەکە ئاوا بوو ؟ گوتی :بەڵێ  .عومەریش بە شمشێرەکەی لێی دا و کوشتی ).

فيه مسائل:

الأولى: تفسير آية النساء وما فيها من الإعانة على فهم الطاغوت.

الثانية: تفسير آية البقرة: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ) .

الثالثة: تفسير آية الأعراف (وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا) .

الرابعة: تفسير: (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ)   الخامسة: ما قاله الشعبي في سبب نزول الآية الأولى.

السادسة: تفسير الإيمان الصادق والكاذب.   السابعة: قصة عمر مع المنافق.

الثامنة: كون الإيمان لا يحصل لأحد حتى يكون هواه تبعاً لما جاء به الرسول ﷺ .

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی  سورەتی نیساء:60بە پێی حەدیسەکان . چ کار ئاسانیەکی تێدایە بۆ تێگەیشتن لە مەعنای تاغوت

(واتە تاغوت ئەوەیە  کە حوکم دەکات بە غەیری ئەوەی کە خودا دایبەزاندوە ، خوداش خۆی ناوی بردووە  بە تاغوت )

---

111 أخرجه الثعلبي والكلبي عن ابن عباس . صححه ابن حجر .

2- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی البقرة:{ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ } واتە لە گەورەترینی فەساد لە سەر ئەڕزا ئەوەیە کە حوکم ببرێتەوە بۆ لای غەیری قورئان و سوننەت )

3- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی الأعراف:{ وَلا تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاحِهَا } (واتە لە گەورەترین فەساد و خراپەنانەوە لەسەر ئەرزا دوای چاکردنی سەرزەوی ئەوەیە کە : غەیری شەریعەت بکرێت بە حەکەم )

4- تەفسیری { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ } [المائدة:50]

(واتە : حوکمی جاهیلی ئەوەیە کە حوکم بە شتیٚ بکرێت کە غەیری قورئان و سوننەت بێت ، چونکە هەر حوکمیٚ کە پێچەوانەی حوکمی خودا بێت ئەوە حوکمی جاهیلیە لە هەرکاتێکدا بێت با ناویشی بنرێت قانون یا نیزام یا دەستور، هەرچی ناوێکی هەبێت، ئەوا هەرحوکمی جاهیلیە ).

5- ئەوەی کە شەعبی گوتی لە بارەی سەبەبی دابەزینی ئایەتەکەوە :

(واتە : تەنها نیەت هێنان بوو، ئەی ئەگەر کارەکەی بکردایە چۆن دەبوو ) .

6- تەفسیری ئیمانی ڕاستەقینە و ئیمانی درۆینە ، (واتە: ئیمانی ڕاستە قینە ئەوەیە کە قورئان و سوننەت ، بکرێت بە حەکەم ، ئیمانی درۆینەیش ئەوەیە کە تاغوت بکرێت بەحەکەم ) .

ڕوونکردنەوەی ئەو شەش خاڵە لە إعانة المستفيد| صالح ابن الفوزان وەرگیراوە

7- بەسەرهاتی عومەر لەگەڵ مونافیقەکەدا .

8- ئیمان نایەتەدی ، بۆهیچ کەس هەتا ئارەزوەکانی شوێن ئەوە دەکەوێت کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی.

***ڕوونکردنەوە:***

﴿ قَالَ ابْنُ الْقَيِّمِ رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَى: مَعْنَى الطَّاغُوتِ مَا تَجَاوَزَ بِهِ الْعَبْدُ حَدَّهُ مِنْ مَعْبُودٍ أَوْ مَتْبُوعٍ أَوْ مُطَاعٍ ﴾

واتە : هەر شتێ کە هەر عەبدێ لە سنوری خۆی کە عەبدایەتییە بیباتە دەر ئەوە تاغوتە .

ئەوانیش سێ جۆرن :

یەکەم : تاغوتی عیبادەت . ئەوانەن کە خەڵکی عیبادەتیان بۆ دەکەن و خۆشیان ڕازین.

دووەم : تاغوتی شوێنکەوتن ، ئەوانەن کە خەڵکی شوێ گوتە و فکرەکانێن دەکەون ، لەو شتانەدا کە پێچەوانەی گوتەی خودا و پێغەمبەرەکەی بێت.

سێیەم : تاغوتی گوێڕایەڵی . ئەوانەن کە خەڵکی فەرمانەکانیان جێ بەجێ دەکەن لەو شتانەدا کەپێچەوانەی فەرمانی خودا و پێغەمبەرەکەی بێت .

**39**– باب من جحد شيئاً من الأسماء والصفات

وقول الله تعالى: ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَنِ﴾ [ الرعد **30** ]

**112**– وفي صحيح البخاري قال علي:

حَدِّثُوا النَّاسَ بِمَا يَعْرِفُونَ , أَتُرِيدُونَ أَنْ يُكَذَّبَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ ؟

**113**– وروى عبد الرزاق عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه عن ابن عباس: أنه رأى رجلاً انتفض . لما سمع حديثاً عن النبي ﷺ في الصفات، استنكاراً لذلك فقال: (ما فرق هؤلاء؟ يجدون رقة عند محكمه، ويهلكون عند متشابهه) انتهى.

---

بابی 39

## هەرکەس ئینکاری شتێ لەناو، وصیفاتەکانی خودابکات،

**واتە: حوکمی چیە. خودا دەفەرموێ:**

﴿ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَٰنِ ۚ قُلْ هُوَ رَبِّي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴿٣٠﴾ ﴾ الرعد

واتـه :(ئـەوان کـافربوون بـەوەی کـه خـودا نـاوی (الـرحمن) بێـت، بڵـێ تـەنها (الـرحمن) پەرسـتراو وپەروەردگارمـه ، هـیچ پەرسـتراوێکی دیکـه نییـه کـه حـەق بێـت جگـه لـه ئـەو ، پشـت بەسـتن و تـەوەکولم تـەنها بـه ئـەوه . دەبێـت تۆبـه کردنیش هەر بۆلای ئەو بێت )

112- ﷺعەلی کوڕی ئەبو تالب دەڵێت :( قصـەیەك بۆ خەڵکی باس بکەن یا گوتارێکیان بۆ بدەن ، که لێی تێبگەن وعەقڵیان تەحەمولی بکات، ئایا دەتانەوێت سەرەنجام وا لەو خەڵکە بکەن که گوتەی خوداو پێغەمبەرەکەی بە درۆ بزانن )

113-ﷺابن عباس پیاوێکی بینی کاتێ گوێبیستی حەدیسێکی پێغەمبەر بوو (ﷺ)، له بارەی صیفاتەکانی خوداوە ، ئەو پیاوە ڕاپەڕی ( وەك ئینکاری لێ بکات و به ناشەرعی بزانێت) .

**114**- ولما سمعت قريش رسول الله ﷺ يذكر: (الرحمن) أنكروا ذلك. فأنزل الله فيهم: (وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَنِ) .

فيه مسائل: الأولى: عدم الإيمان بجحد شيء من الأسماء والصفات.

الثانية: تفسير آية الرعد. الثالثة: ترك التحديث بما لا يفهم السامع.

الرابعة: ذكر العلة أنه يفضي إلى تكذيب الله ورسوله، ولو لم يتعمد المنكر.

الخامسة: كلام ابن عباس لمن استنكر شيئاً من ذلك، وأنه هلك.

---

**ابن عباس** گوتی: ئەوانە بۆچی دەترسن ؟ کاتێ باسی ئەو صیفەتانەی خودا دەکرێ کـه مـەعناکانیان لا ڕوونـه نـەرم دەبـن و بـاوەڕی پێدەکـەن . ئـەو صیفەتانەش کـه چۆنیەتیەکەی لایـان ڕوون نیـه و عـەقڵیان قبـوڵی ناکـات، بـه هیلاکدا دەچن، واته: باوەڕی پێ ناکەن و ڕەدی دەکەنەوە )

---

112 البخاري ، كتاب العلم .

113 أخرجه عبدالرزّاق في المصنف (20895) وابن أبي عاصم في السنة .

واتە : هەر کەس ئینکاری هەر شتێ لە ناوەکانی خودا یان صیفاتەکانی خودا بکات ، ئەوا دەڕوات ڕیزی ئەوانەی کە گومڕا بوون (الهالکین)

114- [114] کاتێ قورەیش گوێبیستی پێغەمبەری خودا بوون ﷺ کە ناوی (الرّحمن )ی دەهێنا ئینکاریان لێ کرد . خوداش لە بارەی ئەوانەوە ئەو ئایەتەی دابەزاند { وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَنِ }

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- بە ئینکاری کردنی هەر شتێ لە ناو و صیفاتەکانی خودا ، ئینسان بێ ئیمان دەبێت.

2- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی ڕەعد

3- نابێت حەدیسێ باس بکرێت کە گوێگر لێی حاڵی نابێت . یا خراپ لێی حاڵی دەبێت

( ئەمەش ناو وصیفاتەکانی خودا ناگرێتەوە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو کۆڕ و مەجلیسێکدا باسی دەکردن )

---

114 أخرجه الطبري (20396) .

4- باسی هۆکارەکەی کە بۆچی نابێت هەندێ شت باس بکرێت، چونکە دەبێتە هــۆی ئــەوەی کــە وتــەی خــوداو پێغەمبەرەکــەی ﷺ بــە درۆ بزانرێــت بــا گوێگرەکەشی مەبەستی ئەوە نەبێت .

5- وتەکەی **ابن عباس** لە بارەی ئەو کەسەوە کە ئینکاری کرد لـە صیفاتەکانی خودا بەو هۆیەشەوە بە هیلاکا چوو (چونکە ناو و صیفاتەکانی خودا موحکەمن (واتە : مەعنایان ڕوونە) و لە هەموو شوێنێ باس دەکرێن ، لە قورئاندا هاتوون و عەوام وهەموو خەڵکی قوئان دەخوێننەوە )

**40**- باب قول الله تعالى: ﴿يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ﴾ النحل **83**

قال مجاهد ما معناه: هو قول الرجل: هذا مالي، ورثته عن آبائي.

وقال عون بن عبد الله: يقولون: لولا فلان لم يكن كذا. وقال ابن قتيبة: يقولون: هذا بشفاعة آلهتنا.

وقال أبو العباس – بعد حديث زيد بن خالد الذي فيه: (إن الله تعالى قال: أصبح من عبادي مؤمن بي وكافر.. ) الحديث، وقد تقدم. وهذا كثير في الكتاب والسنة، يذم سبحانه من يضيف إنعامه إلى غيره ، ويشرك به.

قال بعض السلف: هو كقولهم: كانت الريح طيبة، والملاح حاذقاً، ونحو ذلك مما هو جارٍ على ألسنة كثير.

فيه مسائل: الأولى: تفسير معرفة النعمة وإنكارها. الثانية: معرفة أن هذا جارٍ على ألسنة كثير.

الثالثة: تسمية هذا الكلام إنكاراً للنعمة.    الرابعة: اجتماع الضدين في القلب.

---

## بابی40 نابێت نیعمەتەکان بدرێنە پاڵ غەیری ﷲ

تەفسیری ( يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ) [النحل:83]

واتە :(دان دەنێن  بە نیعمەتەکانی خودادا و ئیعترافی پێدەکەن واتە دەزانن گشت نیعمەتەکان لە لایەن خوداوەیە ، پاشان ئینکاری لێدەکەن یان لە بیری خۆیانی دەبەنەوە ، و زۆربەشیان کافرن )

دانەر بۆ ئەم ئایەتە سێ تەفسیری هێناوەتەوە :

یەکەم : موجاهید کە تابیعیە دەڵێت :(ئەو ئایەتە ئەوە دەگرێتەوە کە پیاوێك بڵێت :( ئەمە ماڵ وموڵکی خۆمە ، لە باب و باپیرانەوە بۆم ماوەتەوە ).

دووەم : (عون بن عبدالله) کە تابیعییە دەڵێت :( تەفسیرەکەی ئەوەیە کە دەڵێن : ئەگەر فلان نەبوایە ئاوا نەدەبوو )

سێیەم :(**ابن قتيبة** ) ی دینەوەری دەڵێت :(ئەو ئایەتە ئەوە دەگرێتەوە کە کافرەکان دەڵێن( هذا بشفاعة آلهتنا) واتە: ئەم نیعمەتە کە خودا داویەتی پێمان بە هۆی تکا و ڕجای پەرستراوەکانی خۆمانەوە پێمان دراوە ).

ابن تیمیە لە دوای ئەوحەدیسەی (زيد بن خالد) کە دەڵێت : ﷲ فەرموی : ( أصبح من عبادي مؤمن بي كافر بالكوكب ومؤمن ..) دەڵێ :﴿ ئەمە لە قورئان وسونەتدا زۆر هاتووە . خودا زەمی ئەو کەسانە دەکات کە نیعمەتەکانی خۆی دەدەنە پاڵ غەیری خوداو دەیانکەن بە شەریکی خودا لە (نیعمەتەکانیدا) ﴾ تەواو

هەندێ لە سەلەف گوتویانە : ئەمە وەك ئەوە وایە کە دەڵێت : باکەی نەرم بوو، دەریاوانەکەش زیرەك بوو، بۆیە نەجاتمان بوو  گوتە گەلێکی وەك ئەمانە کە بە سەر زمانی زۆرێك لە خەڵکیدا دێن. (واتە : با عەقیدەشی لەگەڵ نەبێت هەمان حوکمی هەیە )

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری دانپێدانان بە نیعمەتەکان وئینکاری لێکردنی .
2- زانینی ئەوەی کە ئەم ئینکاری لێکردنە بە سەر زمانی زۆربەی خەڵکیدا دێت.
3- ناونانی ئەم جۆرە قصانە بە ئینکاری کردنی نیعمەتەکان
4- هەردوو دژەکە بەیەکەوە لە دڵێکدا کۆ دەبنەوە .

( واتە :دان پێدانان و ئینکاری لێکردن ،یان ئیمان و کوفر )

رِوونکردنەوە :ئەم مەسەلەیە دوو ڕوو هەڵدەگرێت:

***یەکەم:*** ئەگەر بیەوێت مەدح و ستایشی سەبەبەکە بکات، دەبێت یەکەم جار باسی فەزڵی خودا بکرێت . وەك ئەوەی کە دەڵێن :( ئەگەر فلان نەبوایە ماڵەکەمان دەسوتا، ئەگەر سایەقەکە زیرەك نەبوایە دەعمی دەکرد)، ئەم جۆرە گوتانە هەڵەیە وشیرکی بچوکە، دەبێت ئەم نیعمەتی سەلامەتیە بە نیعمەتی خودا بزانرێت نەیدەینە و پالْ سەبەبەکان . دەبێت بڵێین :ئەگەر ڕەحمی خودا نەبوایە پاشان فلان نەبوایە ئاوا دەبوو .واتە :یەکەم جار دەڵێین خودا ئنجا( پاشان ) دەخەینە بەینەوە ).

***دووەم:*** ئەگەر مەبەستی تەنها خەبەر پێدان بێت ، ئەمەیان دروستە ، وەك ئەوەی لێت بپرسن ئەمەت لە کوێ بوو تۆش بڵێیت : ئەمە میراتییە .

**41**–باب قول الله تعالى: (فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ) [ البقرة : **22** ].

**115**– قال ابن عباس في الآية: الأنداد: هو الشرك أخفى من دبيب النمل على صفاة سوداء في ظلمة الليل؛ وهو أن تقول: والله، وحياتك يا فلان وحياتي، وتقول: لولا كليبة هذا لأتانا اللصوص، ولولا البط في الدار لأتانا اللصوص، وقول الرجل لصاحبه: ما شاء الله وشئت، وقول الرجل: لولا الله وفلان. لا تجعل فيها فلاناً هذا كله به شرك) رواه ابن أبي حاتم.

---

### بابی 41

## تەفسیری (فَلا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَاداً وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ)

واتە :(جا کەواتە، هاوتا بۆ خودا دامەنێن، لە حاڵێکدا ئێوە دەزانن کە هاوتای نییە )

115- (ابن عباس) لە بارەی تەفسیری ئەو ئایەتەوە دەڵێت :

﴿ مەبەست لە (أنداد) واتە: هاوتا، شیرکە ، ئەوەش شاراوەترە لە تەپەی پێی مێرووولە لە سەر بەردێکی صافی ڕەش لە شەوە زەنگدا . ئەمەش ئەم (چوار نمونە) دەگرێتەوە : کە بڵێیت :

1. سوێند بە خودا و بە ژیانی تۆ ئەی فلاَن . یان سوێند بە خۆم

2. یان بێژیت : ئەگەر سەگەکە نەبوایە دزەکان دەهاتنە سەرمان . ئەگەر مراویەکە لەم ماڵەدا نەبوایە ، دزەکان دەهاتنە سەرمان

3. یان ئەوەش کە پیاوێك بە هاوەڵەکەی بڵێت ئەگەر خودا ویستی و تۆ ویستت

4. یا وتەی پیاوێك کە دەڵێت ئەگەر خودا و فلاَن نەبوایە ..... نەکەیت فلاَن بخەیتە ڕیزی خوداوە . ئەمە هەمووی شەریك دانانە بۆ خودا ﴾ ابن کثیر

116- ابن عمر دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمویی: (هەر کەس سوێند بخوات بە غەیری خودا ئەوا کوفری کردووە یا شەریکی بۆ خودا داناوە )

**116**– وعن عمر بن الخطاب رضي الله عنه: أن رسول الله ﷺ قال: (من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك) رواه الترمذي وحسنه، وصححه الحاكم.

**117**– وقال ابن مسعود: لأن أحلف بالله كاذباً أحب إليّ من أن أحلف بغيره صادقاً.

**118**– وعن حذيفة رضي الله عنه، عن النبي ﷺ قال: (لا تقولوا: ما شاء الله وشاء فلان، ولكن قولوا: ما شاء الله ثم شاء فلان) رواه أبو داود بسند صحيح.

**119** – وجاء عن إبراهيم النخعي، أنه يكره أن يقول: أعوذ بالله وبك، ويجوز أن يقول: بالله ثم بك. قال: ويقول: لولا الله ثم فلان، ولا تقولوا: لولا الله وفلان.

---

115 قول ابن عباس في ابن كثير وابن أبي حاتم في التفسير .

116 صحيح . أخرجه الترمذي وأبو داود وأحمد .

117–[117]ابن مسعود دەڵێت :( ئەگەر سوێند بخۆم بە خودا و درۆ بکەم، لام باشترە لەوەی کە سوێند بخۆم بە غەیری خوداو ڕاست بڵێم )

ڕوونکردنەوە : شیخ الإسلام دەڵێت : چونکە سوێند خواردن بە خودا و بە درۆوە ، ئەمە تەوحیدە . سوێن خواردنیش بە غەیری خودا بە ڕاستگۆیی، ئەمە شیرکە . چاکەی تەوحیدیش گەورەترە لە چاکەی ڕاستگۆیی . خراپەی شیرکیش خراپترە لەخراپەی درۆ .

118 –[118]حوزەیفە ﵁ دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی :(مەڵێن خودا ویستی و فلان ویستی . بەڵکو بڵێن خودا ویستی پاشان فلان ویستی ).

119–[119]ئیبراهیمی نەخەعی بە مەکروهی زانیوە ( واتە : بە حەرامی زانیوە ) کە پیاو بڵێت : پەنا بە خودا و بە تۆ . وە بە دروستی زانیوە کە بڵێت پەنا بە خوداو پاشان بە تۆ . دەبێت بڵێت ئەگەر خودا پاشان فلان نەبوایە ، و نابێت بڵێت : ئەگەر خودا و فلان نەبوایە

فيه مسائل: الأولى: تفسير آية البقرة في الأنداد.

الثانية: أن الصحابة رضي الله عنهم يفسرون الآية النازلة في الشرك الأكبر بأنها تعم الأصغر.

الثالثة: أن الحلف بغير الله شرك.الرابعة: أنه إذا حلف بغير الله صادقاً، فهو أكبر من اليمين الغموس.

الخامسة: الفرق بين الواو وثم في اللفظ.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

---

117 موقوف جيد . أخرجه عبد الرزاق (15929) والطبراني في الكبير .

118 صحيح أبو داود (4890) وأحمد في المسند .

119 أخرجه ابن أبي الدنيا في كتاب الصمت (347) وعبد الرزاق (19811) بنحوه .

1- تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی بەقەڕە لەبارەی (الأنداد) واتا (هاوتا)
2-ئەصحابە ، ئەوئایەتەی لەبارەی شیرکی گەورەوە دابەزیوە ، وەها تەفسیریان کردووە کە شیرکی بچوکیش دەگرێتەوە .
3- سوێند خواردن بە غەیری خودا شیرکە .
4- ئەگەر، یەکێ سوێند بخوات بە غەیری خودا وە ڕاستگۆ بێت ، تاوانەکەی لەوە گەورەترە کە سوێند بخوات بە خودا و بڵێت واللە وام کردوە یا نەمکردوە و درۆش بکات.
5- سەرنج بدە جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان بەکار هێنانی (و) لەگەڵ (پاشان) لەو وتانەدا .

ڕوونکردنەوە : لێت دەپرسن : لە هەندێ حەدیسدا سابت بووە کە ئەصحاب سوێنییان خواردووە بە غەیری خودا وەك : (أفلح وأبيه إن صدق) وەڵامەکەی : زانایان بۆ ئەو مەسەلەیە پێنج جوابیان هەیە ، جوانترینیان ئەوەیە کە سوێند خواردن بە غەیری خودا یەکەم جار حەرام نەکراوە . بەڵکو دواتر حەرام کراوە .

**42- باب ما جاء فيمن لم يقنع بالحلف بالله**

**120**- عن ابن عمر رضي الله عنهما، أن رسول الله ﷺ قال:( لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ مَنْ حَلَفَ بِاللَّهِ فَلْيَصْدُقْ وَمَنْ حُلِفَ لَهُ بِاللَّهِ فَلْيَرْضَ وَمَنْ لَمْ يَرْضَ بِاللَّهِ فَلَيْسَ مِنْ اللَّهِ) رواه ابن ماجه بسند حسن.

فيه مسائل: الأولى: النهي عن الحلف بالآباء.

الثانية: الأمر للمحلوف له بالله أن يرضى. الثالثة: وعيد من لم يرض

---

## بابی 42

# لەبارەی هەرکەسێکەوە قەناعەت نەکات بە سوێند خواردن بە خودا

120– [120]ابن عمر ﷺ دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی : (سوێند مەخۆن بە باوانتان . هەرکەس سوێندی خوارد بە خودا با ڕاستگۆ بێت و درۆ نەکات . وە هەرکەس سوێندیان بۆ خوارد بە خودا با ڕازی بێت . هەرکەسیش ڕازی نەبێت ئەوا خودا لە خۆی و کردەوەکەی بەرییە ) .

***ڕونکردنەوە*** :

***یەکەم :*** ئەمە ئەو کەسە دەگرێتەوە کە سوێند خواردن بەخودا قبوڵ نەکات، چونکە قەناعەتی بە ناوەکانی خودا نیە، گەورەیەتی خوداش لە دڵیدا نەچەسپاوە، باوەڕ بەو کەسەش ناکات کە خودای بە گەورە زانیوە ، بەڵکو داوادەکات کە سوێند بخورێت بە غەیری خودا، و غەیری خوداش بە گەورە دابنرێت ، لەبەر ئەوەی قەدری خودای لە دڵیدا بەکەم زانیوە و مەخلۆقیش لەدڵیدا گەورەترە لە خالق . ( ابن جبرين ..)

***دووەم*** : ئەمە بۆ هەموو شوێن وکاتێ نیە بەڵکو بۆ سوێنددانی شەرعیە . کە تایبەتە بە حەلکردنی کێشەی نێوان دوو لایەن . کە هیچ بەڵگەیەك دەست نەکەوت لایەنێکیان سوێند دەدرێت . بەڵام ئەگەر سوێندی خوارد بە پێچەوانەی واقیع واجب نیە لە سەری کە ڕازی بێت (الغنيمان )

## مەسەلەکانی ئەم باسە

---

120 حسن أخرجه ابن ماجة .

1– قەدەغەکردنی سوێند خواردن بە باب و باپیران .

2– فەرمان دراوە بەو کەسەی کە سوێندی بۆ خوراوە بە خودا، دەبێت ڕازی بێت.

3– هەڕەشە لەو کەسەی کە ڕازی نابێت .

**43– باب قول: ما شاء الله وشئت**

**121– عَنْ قُتَيْلَةَ أَنَّ يَهُودِيًّا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ إِنَّكُمْ تُنَدِّدُونَ وَإِنَّكُمْ تُشْرِكُونَ تَقُولُونَ مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ وَتَقُولُونَ وَالْكَعْبَةِ فَأَمَرَهُمْ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادُوا أَنْ يَحْلِفُوا أَنْ يَقُولُوا وَرَبِّ الْكَعْبَةِ وَيَقُولُونَ مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ شِئْتَ** رواه النسائي وصححه

**122– وله أيضاً عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ :مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ فَقَالَ :[أَجَعَلْتَنِي لله ندا بَلْ مَا شَاءَ اللَّهُ وَحْدَهُ ]**

---

## بابی 43

# گوتنی خودا بیەوێت و تۆش بتەوێت

121- ﷺقوتەیلە دەڵێت :(جولەكەیەك هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و گوتی :( ئێوە شەریك بۆ خودا دادەنێن ، دەڵێن ، خودا ویستی و تۆ ویستت . دەشڵێن سوێند بە كەعبە . پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی دا بە موسوڵمانان ئەگەر سوێندیان خوارد بڵێن سوێند بە خودای كەعبە : وە بڵێن : خودا ویستی و پاشان تۆ ویستت ) .

122- ﷺابن عباس دەڵێت : پیاوێك گوتی بە پێغەمبەری خودا ﷺ خودا ویستی و تۆ ویستت ، ئەویش فەرمووی :( ئایامنت كرد بە هاوتای خودا ؟ بەڵكو بڵێ خودا ویستی بە تەنها ).

123- ﷺتوفەیل ( كە برای عائیشەیە لە دایكەوە ) گوتی: ( لە خەودا بینیم كە بەلای كۆمەڵێك جولەكەدا تێپەڕیم . گوتم : ئێوە قەومێكی باشن ئەگەر نەتانگوتایە عوزێر كوڕی ﷲ یە .

**123**- ولابن ماجه عَنِ الطُّفَيْلِ ، أَخِي عَائِشَةَ لأُمِّهَا، قَالَ: رَأَيْتُ كَأَنِّي مَررتُ بِنفرٍ مِنَ الْيَهُودِ ، فَقُلْتُ: إِنَّكُمْ لأَنْتُمِ الْقَوْمُ، لَوْلا أَنَّكُمْ تَقُولُونَ: عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ، قَالُوا: وَأَنْتُمِ الْقَوْمُ، لَوْلا أَنَّكُمْ تَقُولُونَ: مَا شَاءَ اللَّهُ، وَشَاءَ مُحَمَّدٌ، ثُمَّ مَرَرْتُ بِنفرٍ مِنَ النَّصَارَى، فَقُلْتُ: إِنَّكُمْ لأَنْتُمِ الْقَوْمُ، لَوْلا أَنَّكُمْ تَقُولُونَ: الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ، فَقَالُوا: وَأَنْتُمِ الْقَوْمُ، لَوْلا أَنَّكُمْ تَقُولُونَ مَا شَاءَ اللَّهُ وَشَاءَ مُحَمَّدٌ، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ أَخْبَرْتُ بِهَا من أخبرتُ ، ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ

فأخبرته. قال: (هل أخبرت بها أحداً؟) قلت: نعم. قال: فحمد الله وأثنى عليه، ثم قال:

---

121 حسن . أخرجه أحمد والنسائي .

122 حسن . أخرجه أحمد وابن ماجة (2117) والبخاري في الأدب المفرد .

123 حسن .أخرجه ابن ماجة (2118) وأحمد والدارمي . والطبراني في الكبير (8214)

(أما بعد؛ فإن طفيلاً رأى رؤيا، أخبر بها من أخبر منكم، وإنكم قلتم كلمة كان يمنعني كذا وكذا أن أنهاكم عنها. فلا تقولوا: ما شاء الله وشاء محمد، ولكن قولوا: ما شاء الله وحده).

---

**ئەوانیش گوتیان : ئێوەش قەومێکی باشن ئەگەر نەتانگوتایە خودا ویستی و محمد ویستی . پاشان بەلای کۆمەڵێك نەصرانیدا تێپەڕیم . پێیانم گوت : ئێوە قەومێکی باشن ئەگەر نەتانگوتایە مەسیح کوڕی ﷲ یە . ئەوانیش گوتیان : ئێوە قەومێکی باشن ، ئەگەر نەتانگوتایە خودا ویستی و محمد ویستی .**

**جا کاتێ ڕۆژ بوویەوە ، ئەو خەوەم بۆ چەند کەسێ گێڕایەوە . پاشان چوم بۆلای پێغەمبەر ﷺ وە خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی : ئایا بۆ کەست گێڕاوەتەوە . گوتم بەڵێ.**

**توفەیل گوتی: ئینجا پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژی جەماعەت سپاس و ستایشی خودای کرد، پاشان فەرمووی :( طفیل) خەوێکی بینیوە ، بۆ چەند کەسێکتانی گێڕاوەتەوە ، ئێوەش کەلیمەیەکتان دەگوت ، شتێکی ئاواو ئاوا ڕێگریان لێکردم کە لێتانی حەرام بکەم (واتە: شەرمی کردووە بە بێ ئیزنی خودا حەرامی بکات). ئیدی مەڵێن : خودا ویستی و محمد ویستی، بەڵکو بڵێن خودا هەر خۆی ویستی ).**

**فيه مسائل:**

الأولى: معرفة اليهود بالشرك الأصغر. الثانية: فهم الإنسان إذا كان له هوى.

الثالثة: قوله ﷺ: (أ جعلتني لله نداً؟) فكيف بمن قال:

يا أكرم الخلق ما لي من ألوذ به سواك . . . .والبيتين بعده.

الرابعة: أن هذا ليس من الشرك الأكبر، لقوله: (يمنعني كذا وكذا).

الخامسة: أن الرؤيا الصالحة من أقسام الوحي. السادسة: أنها قد تكون سبباً لشرع بعض الأحكام.

## مەسەلەكانی ئەم باسە

1–جولەكە شارەزای شیركی بچوك بوون .( لەگەڵ ئەوەشدا كە گومڕا بوون، بەڵام هەندێ لەزانایانی ئەم ئوممەتی ئیسلامە لە شیركی گەورەش تێ ناگەن )

2– ئینسان ئەگەر ئارەزوی شتێك بكات لێی تێدەگات .(وەك ئەو جولەكەیە)

3– وتەكەی پێغەمبەر (ﷺ) ( ئایا منت كرد بە هاوتای خودا ) ئەی دەبێت ئەوە چۆن بێت كە گوتویەتی بە پێغەمبەر ﷺ :( جگە لە تۆ هیچ كەسم نیە پەنای پێ بەرم ) دوو بەیتەكەی دواتریش لە ( **بردة المديح**) دا

4– ئەو وتانەی ئەصحابەكان شیركی گەورە نییە، بە پێی ئەوەی كە فەرمووی ( ئەوە و ئەوە ڕێگری لێكردم كە پێتان بڵێم)

5– خەوی ڕاست بەشێكە لە بەشەكانی پێغەمبەرایەتی .

6– هەندێك جار بووەتە هۆی دامەزراندنی هەندێك ئەحكام .

( ئەمەش تەنها بۆ پێغەمبەر بووە ﷺ )

## 44– باب من سب الدهر فقد آذى الله

وقول الله تعالى ﴿ وَقَالُواْ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ﴾ ﴿الجاثية 24﴾

**124**– في الصحيح عن أبي هريرة، عن النبي ﷺ قال:

« قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يُؤْذِينِى ابْنُ آدَمَ يَسُبُّ الدَّهْرَ وَأَنَا الدَّهْرُ أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ».

وفي رواية: [لَا تَسُبُّوا الدَّهْرَ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الدَّهْرُ ]

فيه مسائل: الأولى: النهي عن سب الدهر. الثانية: تسميته أذى لله.

الثالثة: التأمل في قوله: (فإن الله هو الدهر). الرابعة: أنه قد يكون ساباً ولو لم يقصده بقلبه.

---

بابی 44

## هەرکەس جوێن بدات بە زەمانە ، ئەوە ئازاری خودای داوە

﴿ وَقَالُواْ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ﴾ **[الجاثية 24]**

**واتە: ( موشریکەکان گوتیان : ژیانمان تەنها ژیانی دونیایە . دەمرین و دەژین وژیان بە سەر دەبەین ، کەس لە ناومان نابات تەنها زەمانە نەبێت . ئەوان لەو بارەوە هیچ عیلمێکیان لا نییە نەکەم ونە زۆر . تەنها ئەوەیە کە ئەوان مەزەنە دەکەن و هەرچی دەڵێن لەو بارەوە وەهم وخەیاڵە ) تەواو .**

**124–[شمیتر] ئەبوهورەیرە ﵁ دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرموی : خودای بڵند فەرموویەتی : (نەوەی ئادەم ئازارم دەدات بەوەی کە جوێن دەدات بە زەمانە . زەمانەش خۆمم شەو و ڕۆژ بەسەر یەکدا دەهێنم ).**

**لە ڕیوایەتێکی دیکەدا ئاوایە :**

**(جوێن مەدەن بە زەمانە چونکە خودا هەر خۆی زەمانەیە )**

### مەسەلەکانی ئەم باسە

**1–نەهی کردن لەوەی کە جوێن بدرێت بە زەمانە .**

**2–ئەو کارە ناو نراوە بە ئازار دانی خودا .**

**3– وورد بونەوە لە فەرمودەکەی (چونکە خودا هەر خۆی زەمانەیە )**

---

**124 البخاري** (4826) **ومسلم** (2246)

( واتە : خۆی زەمانەی دروست کردووە )

4- هەندێك جاران ئینسان جوێن دەدات . ئەگەر چی لە دڵەوە نیەتی ئەوە نەبێت کە جوێن بدات .

***ڕوونکردنەوە*** : ئەگەر جوێنی دا بە زەمانە دوو حاڵەتی هەیە :

یەکەم : ئەگەر مەبەستی خودا بێت ئەوە دیارە کە کوفرە .

دووەم : ئەگەر مەبەستی غەیری خودا بێت ، واتە عەقیدەی وایە : کە غەیری خودا زەرەر و قازانجی بە دەستە . ئەمەیان شیرکی گەورەیە .

نمونەی جوێندان بە زەمانە وەك ئەوەی کە دەڵێن : زەمانە ڕووی ڕەش بێت، یا دونیا باری بۆ کەس نییە یا دونیا بیٚ وەفایە یا چەرخی چەپگەرد.. یان سوکایەتی پێکردن . بە خراپ باسکردن ، ئاخ و ئۆخ هەڵکێشان لە دەست زەمانە .

## 45- باب التسمي بقاضي القضاة ونحوه

**125**- في الصحيح عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ [ قَالَ إِنَّ أَخْنَعَ اسْمٍ عِنْدَ اللَّهِ رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الْأَمْلَاكِ ، لَا مَالِكَ إِلَّا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ]قَالَ سُفْيَانُ مِثْلُ شَاهَانْ شَاهْ وفي رواية: (أغيظ رجل على الله يوم القيامة وأخبثه). قوله (أخنع) يعني أوضع.

فيه مسائل:

الأولى: النهي عن التسمي بملك الأملاك. الثانية: أن ما في معناه مثله، كما قال سفيان.

الثالثة: التفطن للتغليظ في هذا ونحوه، مع القطع بأن القلب لم يقصد معناه.

الرابعة: التفطن أن هذا لإجلال الله سبحانه.

---

## بابی 45

# باسی ناونان بە قازی قازیەکان و هاوشێوەکانی

125- [125]أبوهريرة رضي الله عنه دەڵێت : پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی : (بە تەئکید سوکترین و بێ ڕێزترین ناو، لای خودا ، ئەوەیە پیاوێك خۆی ناو بنێت مەلیکی مەلیکان، چونکە هیچ کەس (بە تەواوی ) خاوەنی هیچ شتێ نیە جگە لە الله )

سوفیان دەڵێت: شاهانشاه ، هەروەك ئەوە (واتە هەمان حوکمی هەیە)

لەڕیوایەتێکدا ئاوا هاتوە :

( تورەیی و غەزەبی خودا لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو کەسە زۆر سەختە، ناوەکەیشی لە ناوی هەمو خەڵکی پیسترە ).

**مەسەلەکانی ئەم باسە**

---

**125** البخاري (6205) ومسلم (2143)

1- نەهی كردن لەوەی كە هەركەسێ ناوی خۆی بنێ (مەلیكی مەلیكان) . ( واتە گەورەی هەموو پادشاكان )

2- مەعناكەی هەمان حوكمی هەیە : وەك سوفیان وتی :وەك شاهانشاه (واتە: بە هەر زمانێك بێت هەمان حوكمی هەیە) (ئەمەش بە پێی قیاس)

3- ئاگاداربون لەوەی كە ئەمە و هاوشێوەكانی، حوكمی توندیان هەیە . لەگەڵ دڵنیا بوون لەوەی كە خەڵكی لەدڵەوە مەبەستیان مەعنا خراپەكەی نیە .

4-ئاگاداربون لەوەی كە ئەم قەدەغەكردنە لە پێناوی ڕێزگرتنە لە ناوەكانی خودا . (چونكە خودا هەر خۆی گەورەی هەموو قازیەكان وهەموو پادشاكانە)

<u>ڕوونكردنەوە</u> : مەبەست لەم باسە ئەوەیە هەر ناوێك لە ناوەكانی خودا بچێت و گشتگیر بێت ئەوە جائیز نییە . و شیركی بچوكە .

## 46- باب احترام أسماء الله وتغيير الاسم لأجل ذلك

126- عن أبي شريح: أنه كان يكنى أبا الحكم؛ فقال له النبي ﷺ
[ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ فَقَالَ إِنَّ قَوْمِي إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ أَتَوْنِي فَحَكَمْتُ بَيْنَهُمْ فَرَضِيَ كِلَا الْفَرِيقَيْنِ فَقَالَ :مَا أَحْسَنَ هَذَا فَمَا لَكَ مِنْ الْوَلَدِ قَلت : شُرَيْحٌ وَمُسْلِمٌ وَعَبْدُ اللَّهِ قَالَ فَمَنْ أَكْبَرُهُمْ قُلْتُ شُرَيْحٌ قَالَ فَأَنْتَ أَبُو شُرَيْحٍ ] رواه أبو داود وغيره.

فيه مسائل: الأولى: احترام أسماء الله وصفاته ولو لم يقصد معناه.
الثانية: تغيير الاسم لأجل ذلك. الثالثة: اختيار أكبر الأبناء للكنية.

---

بابی46

## باسی ڕێزگرتن لە ناوەکانی خودا ، گۆڕینی ناویش لەپێناوی ئەوەدا واجبە

126- ئەبو شورەیح دەگێڕێتەوە ﷺ کە بە کونیەی ( أبوالحَكَم) بانگ دەکرا، جا لەبەر ئەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد و فەرمووی :( خودا هەر خۆی حەکەمە ( واتە هەر حوکمێکی دابێت دەبێت جێ بە جێ بکرێت جا قەدەری بێت یا شەرعی)، وە دەبێت هەرچی حوکمیشە هەر بۆ لای ئەو بگەڕێتەوە ) .

ئەبو شوڕیحیش گوتی : ئەگەر قەومەکەم لە هەر شتێکدا ناکۆکیان تێ بکەوتایە دەهاتن بۆلام ، منیش لە نێوانیاندا حوکمم دەدا (واتە : صولْح و ئاشتەوایم دەکرد )، هەردوو لاش ڕازی دەبوون (بەو صولْحە ).

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: (ئەمە چەند جوانە ( واتە ئەو عەدالەت و ئینسافە)، ئەی چەند منالْت هەیە ؟ گوتم : شورەیح و موسیلم و عبدالله .

فەرمووی : کامیان گەورەکەیانە ؟ گوتم : شوڕەیح فەرمووی : کەواتە تۆ (أبو شریح) یت ﷺ

---

126 حسن . أخرجه أبو داود (4955) والنسائي والطبراني في الكبير .

ڕوونکردنەوە : ئەو کارەی ئەبو شورەیح ئەوە بوو کە لە نێوانیاندا صوڵحی دەکرد ، هەوڵی دەدا شتێ بدۆزێتەوە کە هەردوولا ڕازی بکات ، ئەوانیش ڕازی دەبوون . ئەمەش پێی دەگوترێت صوڵح کە لە سەر ئەساسی ڕازی بوونە . ئەمەش پێی ناگوترێت حوکم کردن ، چونکە حوکمکردن لە سەر ئەساسی پابەندبوونە بە حوکمی حاکمەکەوە . (الدر النضيد)

مەسەلەکانی ئەم باسە

1. ڕێزگرتنی ناو صیفاتەکانی خودای گەورە، ئەگەر چی لەناونانە غەڵەتەکەشدا ، مەعناکەی مەبەست نەبوو بێت .
2. ناوگۆڕین لە پێناوی ئەوەدا . (واجبە )
3. هەڵبژاردنی ناوی کوڕەگەورە بۆ کونیە . (سوننەتە)
(ئەگەر کوڕی نەبووئەوا کچە گەورەکەی)

ڕوونکردنەوەیەك : لە بارەی ناونان بە ناوەکانی خودا ، کە دەبن بە چەند بە شێکەوە:

یەکەمیان : ئەو ناوانەی کە تەنها بۆ خودا دەبن . وەك ( الرحمان ، القدوس ، الرب ) ناونان بەو ناوانەوە ، حەرامە و شەریك دانانە بۆ خودا لە ناو و صیفاتەکانیدا .

دووەمیان : ناونان لەگەڵ مەبەستی مەعناکەیدا . وەك ئەوەی ئینسانێك ناو بنرێت بنرێت بە ناوێك لە هەمان کاتا مەعناکەیشی مەبەست بێت وناوەکە ناوی خوداش بێت. بە بەڵگەی حەدیسەکەی ئەبو شورەیح . نمونەیەکی دی ئەگەر یەکێك بەڕەحم بوو بەو هۆیەوە ناو نرا ڕەحیم ، ئەوە حەرامە و شیرکی بچوکە لە ناوەکانی خودادا .

سێیەمیان : ناونان بە ناوێك کە مەعناکەی مەبەست نەبێت . وەك یەکێ ناو بنرێ بە حەکیم یان ڕەحیم ئەمەیان دروستە مادام مەبەستیان مەعناکەی نەبێت .

## 47- باب من هزل بشيء فيه ذكر الله أو القرآن أو الرسول

وقول الله تعالي: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ التوبة: ٦٥

**127**- عن ابن عمر، ومحمد بن كعب، وزيد بن أسلم، وقتادة – دخل حديث بعضهم في بعض – : أنه قال رجل في غزوة تبوك: ما رأينا مثل قرائنا هؤلاء، أرغب بطوناً، ولا أكذب ألسناً، ولا أجبن عند اللقاء. يعني رسول الله ﷺ وأصحابه القرّاء. فقال له عوف بن مالك: كَذَبْت , وَلَكِنَّك مُنَافِق , لَأُخْبِرَن رَسُول اللَّه ﷺ ! فَذَهَبَ عَوْف إِلَى رَسُول اللَّه لِيُخْبِرهُ , فَوَجَدَ الْقُرْآن قَدْ سَبَقَهُ , فجاء ذلك الرجل إلى رسول الله ﷺ وقد ارتحل وركب ناقته، فقال: يا رسول الله! إنما كنا نخوض ونتحدث حديث الركب، نقطع به عنا الطريق. فقال ابن عمر: كأني أنظر إليه متعلقاً بنسعة ناقة رسول الله ﷺ ، وإن الحجارة تنكب رجليه – وهو يقول: إنما كنا نخوض ونلعب – فيقول له رسول الله ﷺ (أَبِاللّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ) ما يتلفت إليه وما يزيده عليه.

---

### بابی 47

## هەرکەس ، گاڵتە بکات بەهەر شتێ کەناوی خودا ، یا قورئان ،یا هەر پێغەمبەرێکی تێدا بێت . ( کافر بووە )

**گاڵتە کردن بە خودا ، واتە : گاڵتە کردن بە یەکێ لە صیفەتەکانی یان ناوەکانی یان کارەکانی یا فەرمانەکانی.**

( وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ...).**تادوایی**

**واتە :﴿ واللە ئەگەر، سوئال بکەیت لەو مونافیقانە ( بۆ چی ئەوەیان گوتووە ، ئەوا بە تەئکید دەڵێت : ئێمە کە ئەو قصانەمان کردووە ، تەنها ئەوە بووە کاتمان پێ بەسەر بردووە و گاڵتەمان کردووە (واتە : مەبەستمان گاڵتە پێ کردن و سوکایەتی پێکردن نەبووە) . تۆش بڵێ : ئایا بە خودا و بە ئایەت و نیشانەکانی و بە پێغەمبەرەکانی گاڵتەجاڕی و سوکایەتی دەکەن ﴾**

127–بیئیتر(ابن عمر ) و (محمد بن کعب) و زەیدی کوڕی ئەسلەم و قەتادە دەگێڕنەوە کۆی حەدیسەکەیان بەم جۆرەیە :

( پیاوێك لە غەزای تەبوکدا کە لە ساڵی نۆی هیجریدا ڕووی دا گوتی: کەسمان نەبینیوە وەك ئەم قورئان خوێنانەمان ورگزل و درۆزن ، و ترسنۆك بن لە جەنگدا ، مەبەستی پێغەمبەری خودا و ئەصحابەکانی بوو ﷺ . عەوفی کوڕی مالیك کە لەو مەجلیسەدا ، ئامادە بوو، پێی گوت : درۆت کرد بەڵکو تۆ مونافیقیت ، واللە دەڕۆم بۆ پێغەمبەری دەگێڕمەوە .

ئنجا عەوف چوو بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ئەوەی ئاگاداری بکاتەوە . دەبینێ پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ قورئان لەو بارەیەوە دابەزیوە . ئەوجا پیاوەکە چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا دەبینێ، پێغەمبەر ﷺ شوێنەکەی جێ هێڵاوە و سواری وشترەکەی بووە . پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە ئەو قسانەمان تەنها بۆ خۆشی و گاڵتە کردووە ، ماندوو بوونی ڕێگەمانی پێ لە بیر دەبەینەوە (واتە لە دڵەوە نەمان گوتوە ).

ابن عمر دەڵێت : لە بەر چاومە، ئەو پیاوە خۆی بە قایشی وشترەکەی پێغەمبەرەوە هەڵواسی بوو . بە دەم ڕێوە قاچی لە بەردەڵان هەڵدەکەوت و دەیگوت :

(ئێمە تەنها کاتمان بەو گوتانە بە سەر بردووە گاڵتەمان کردووە ، (وبەڕاستیمان نەبووە )

پێغەمبەر یش ﷺ لە جەوابدا ئەو ئایەتەی خۆندەوە کە مەعناکەی بەمجۆرەیە : (ئایە بە ئایەتەکانی خودا و پێغەمبەرەکەی گاڵتەجاڕیتان دەکرد ، عوزر مەهێننەوە . بە تەئکید ئێوە بوون بە کافر، پاش ئەوەی کە ئیمانتان هێنابوو ) پێغەمبەر (ﷺ) نەلای کردەوە بە لایاندا ونە لەوە زیاتری پێیان گوت )

---

127 حسن . تفسیر إبن کثیر والطبري وابن حاتم . حسّن إسناده الشیخ مقبل بن هادي الوادعي کما في صحیح السند من ( إسباب النزول )

فيه مسائل: الأولى: وهي العظيمة: أن من هزل بهذا فهو كافر.

الثانية: أن هذا هو تفسير الآية فيمن فعل ذلك كائناً من كان.

الثالثة: الفرق بين النميمة والنصيحة لله ولرسوله.

الرابعة: الفرق بين العفو الذي يحبه الله وبين الغلظة على أعداء الله.

الخامسة: أن من الأعذار ما لا ينبغي أن يقبل.

---

## مەسەلەكانی ئەم باسە

1- ئەو مەسەلە گەورەیە کە هەرکەسێ گاڵتە بکات بەوانە ، ئەوا کافر دەبێت

2- ئەوەش تەفسیری ئایەتەکەیە . لەبارەی هەر کەسێکەوە کە ئەم جۆرە کارانە بکات جا هەر کەس بێت .

3- فەرق هەیە لە نێوان قصە هێنان و قصە بردندا لە گەڵ دڵسۆزی نواندن بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی .( واتە باسکردنی کاری مونافیقان و خراپە کاران ، لای کاربەدەستان بۆ ئەوەی تەمێیان بکەن ، و شەرعیان بە سەردا جێ بەجێ بکەن نە غەیبەتە و نە قصە هێنان و بردن).

4- فەرق هەیە لە نێوان لێبوردن ئەوەی کە خودا پێی خۆشە ، لە گەڵ ڕەقی نواندن لە بەرانبەر دوژمنانی خودادا

5- هەندێك عوزر هێنانەوە هەیە نابێت قبوڵ بکرێن .

## باب 48 ما جاء في قول الله تعالى:

﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِنَّا مِنْ بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَذَا لِي ﴾

قال مجاهد: هذا بعملي وأنا محقوق به. وقال ابن عباس: يريد من عندي.

وقوله: (قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي) [ القصص : 78 ] قال قتادة: على علم مني بوجوه المكاسب. وقال آخرون: على علم من الله أني له أهل. وهذا معنى قول مجاهد: أوتيته على شرف.

---

## بابی 48 تەفسیری ئەو ئایەتە:

﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِنَّا مِنْ بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَذَا لِي ﴾ [فصلت : 50]

**واتە :﴿ کاتێ خودا ڕەحمەتی خۆی دەبەخشێت بە ئینسان . پاش نەخۆشکەوتن لەشساغی کرد ، پاش فەقیری دەوڵەمەندی کرد ، دەڵێت : ئەم نیعمەتانە شایستەی خۆمن﴾**

**دانەر بۆ ئەم ئایەتە سێ تەفسیری هێناوە :**

**یەکەم : موجاهید دەڵێت : ( هذا لي ) واتە ئەمە بەهۆی کارو کاسپی و شارە زایی و کردەوەی خۆمەوە دەستم کەوتووە ، خۆشم شایستەی ئەم نیعمەتانەم )**

**دووەم : ابن عباس دەڵێت: ( هذا لي ): (یەعنی ئەمانە بە هۆی کردەوەی خۆم و خۆم بە دەستم هێناوە و تیایدا ماندوو بووم )**

**خودا دەفەرموێ:** { قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي] القصص:78

**سێیەم : قەتادە لە بارەی تەفسیری ئەو ئایەتەوە دەڵێت : واتە ( گوتی : خودا لە بەر ئەوە ئەم سەروەت وسامانەی داوە پێم چونکە دەزانم چۆن کاسپی دەکەم )**

**وە هەندێك لە سەلەف گوتویانە : واتە : کە ئەم نیعمەتانەم پێدراوە لە بەر ئەوەیە کە خودا عیلمی ئەوەی هەبووە کە من شایستەی ئەم شتانەم . ئەمەش هەمان مەعنای تەفسیرەکەی موجاهیدە کە دەڵێت : لەبەر ئەوە پێم دراوە کە من خاوەنی پلەو پایەی بەرزم و ڕێزدارم .**

**کۆی وتەی هەموویان ئەوەیە : کە نیعمەتەکانی داوەتە پاڵ هەوڵ و کردەوەی خۆی.**
**ئەمەش پێی دەگوترێت : لەبیرکردنی فەزڵی خودا.**

128– عن أبي هريرة ﷺ : أنَّه سَمِعَ النَّبيّ ﷺ ، يقُولُ : (( إنَّ ثَلاثَةً مِنْ بَني إِسْرَائِيلَ : أبْرَصَ ، وَأَقْرَعَ ، وَأَعْمَى ، أَرَادَ اللهُ أنْ يَبْتليَهُمْ فَبَعَثَ إليْهِمْ مَلَكاً ، فَأتَى الأَبْرَصَ ، فقَالَ : أيُّ شَيءٍ أَحَبُّ إلَيْكَ ؟ قَالَ : لَوْنٌ حَسنٌ ، وَجِلدٌ حَسَنٌ ، وَيَذْهبُ عَنّي الَّذِي قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ ؛ فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ قَذَرُهُ وَأُعْطِيَ لَوناً حَسناً . فَقَالَ : فَأيُّ المَالِ أَحَبُّ إِليكَ ؟ قَالَ : الإِبلُ – أَوْ قالَ : البَقَرُ شكَّ إسحاق – فَأُعطِيَ نَاقَةً عُشَرَاءَ ، فقَالَ : بَارِكَ الله لَكَ فِيهَا .

فَأَتَى الأَقْرَعَ، فقَالَ: أَيُّ شَيءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: شَعْرٌ حَسَنٌ، وَيَذْهَبُ عَنِّي هَذَا الَّذِي قَذِرَني النَّاسُ ؛ فَمَسَحَهُ فَذَهبَ عَنْهُ وأُعْطِيَ شَعراً حَسَناً . قالَ : فَأيُّ المَالِ أَحَبُّ إليْكَ ؟ قَالَ : البَقَرُ ، فَأُعْطِيَ بَقَرَةً حَامِلاً ، وَقالَ : بَارَكَ الله لَكَ فِيهَا .

فَأَتَى الأَعْمَى ، فَقَالَ : أَيُّ شَيءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ ؟ قَالَ : أَنْ يَرُدَّ الله إِلَيَّ بَصَرِي فَأُبْصِرُ النَّاسَ؛ فَمَسَحَهُ فَرَدَّ اللهُ إِلَيْهِ بَصرهُ. قَالَ: فَأَيُّ المَالِ أَحبُّ إِليْكَ ؟ قَالَ : الغَنَمُ ، فَأُعْطِيَ شَاةً والداً ، فَأَنْتجَ هذَانِ وَوَلَّدَ هَذَا ، فكانَ لِهذَا وَادٍ مِنَ الإبلِ ، وَلِهذَا وَادٍ مِنَ البَقَرِ ، وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الغَنَمِ .

ثُمَّ إنَّهُ أَتَى الأَبْرَصَ في صُورَتِهِ وَهَيئَتِهِ ، فَقَالَ : رَجلٌ مِسْكِينٌ قَدِ انقَطَعَتْ بِيَ الحِبَالُ في سَفَري فَلا بَلاغَ لِيَ اليَومَ إلاَّ باللهِ ثُمَّ بِكَ ، أَسْأَلُكَ بِالَّذي أعْطَاكَ اللَّونَ الحَسَنَ ، والجِلْدَ الحَسَنَ ، وَالمَالَ ، بَعِيراً أَتَبَلَّغُ بِهِ في سَفَري ، فَقَالَ : الحُقُوقُ كثِيرةٌ . فَقَالَ : كأنِّي اعْرِفُكَ ، أَلَمْ تَكُنْ أَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ فقيراً فأعْطَاكَ اللهُ !؟ فقَالَ : إنَّمَا وَرِثْتُ هَذَا المالَ كَابِراً عَنْ كَابِرٍ ، فَقَالَ : إنْ كُنْتَ كَاذِباً فَصَيَّرَكَ الله إِلَى مَا كُنْتَ .

وَأَتَى الأَقْرَعَ في صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ ، فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لِهَذا ، وَرَدَّ عَلَيهِ مِثْلَ مَا رَدَّ هَذَا ، فَقَالَ : إنْ كُنْتَ كَاذِباً فَصَيَّرَكَ اللهُ إِلَى مَا كُنْتَ .

وَأَتَى الأَعْمَى في صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ ، فَقَالَ : رَجُلٌ مِسْكِينٌ وابنُ سَبيلٍ انْقَطَعتْ بِيَ الحِبَالُ في سَفَرِي ، فَلا بَلاَغَ لِيَ اليَومَ إلاَّ بِاللهِ ثُمَّ بِكَ ، أَسأَلُكَ بالَّذِي رَدَّ عَلَيْكَ بَصرَكَ شَاةً أَتَبَلَّغُ بِهَا في سَفري ؟ فَقَالَ : قَدْ كُنْتُ أعمَى فَرَدَّ اللهُ إِلَيَّ بَصَرِي فَخُذْ مَا شِئْتَ وَدَعْ مَا شِئْتَ فَوَاللهِ ما أَجْهَدُكَ اليَومَ بِشَيءٍ أَخَذْتَهُ للهِ – عز وجل –. فَقَالَ : أَمْسِكْ مالَكَ فِإنَّمَا ابْتُلِيتُمْ . فَقَدْ رضي الله عنك ، وَسَخِطَ عَلَى صَاحِبَيكَ )) أخرجاه

128–ﷺأبوهريرة گوتی: گوێبیستی پێغەمبەر بووم (ﷺ) کە فەرمووی :

(سێ کەس هەبوون لە ناو نەوەکانی ئیسرائیل دا ، گەڕوگولێك و کەچەڵێك و کوێرێك . خودا ویستی تاقیان بکاتەوە . لەبەر ئەوە مەلائیکەیەکی نارد بۆ لایان (لە شێوەی ئینساندا ). چوو بۆ لای گەڕوگولەکە گوتی : حەز لە چی شتێ دەکەیت . گوتی ڕەنگێکی جوان و پێستێکی جوان .ئەم نەخۆشیەشم پێوە نەمێنێت کە خەلکی بە هۆیەوە قێزم لێ دەکەنەوە .

فەرمووی ئەوجا مەلائیکەتەکە دەستی هێنا بە گیانیدا و گەڕوگولیەکەی نەما و پێستێکی جوانیشی پێدرا .ئنجا ملائیکەتەکە گوتی :پاشان حەزت لە چ جۆرە ماڵێکە ؟ ئەویش گوتی وشتر یا مانگا .(ئیسحاق گومانی هەبوو کامیانی گوت) ئنجا وشترێکی ئاوسی پێ درا . ملائیکەتەکە گوتی: خودا بەرەکەتی تێ بکات بۆت ) .

پێغەمبەر ﷺ فەرموی : ئنجاچوو بۆ لای پیاوە کەچەڵەکە وپێی گوت : چی شتێکت پێ خۆشە ( کە پێت بدرێت) . ئەویش گوتی ڕەنگێکی جوان وقژێکی جوان . ئەم نەخۆشیەشم پێوە نەمێنێت کە بە هۆیەوە خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە . فەرمووی ئەو جا مەلائیکەتەکە دەستی هێنا بە سەریدا و نەخۆشیە پیسەکەی نەما قژێکی جوانی پێدرا . پاشان مەلائیکەتەکە گوتی : ئەی چ ماڵێکت پێ خۆشە کە پێت بدرێت ؟ گوتی: مانگا یا وشتر ئنجا مانگایەکی ئاوسی پێدرا . و مەلائیکەتەکەش گوتی : خودا بەرەکەتی تێ بکات بۆت .

پاشان چوو بۆ لای کوێرەکەو گوتی : چی شتێکت پێ خۆشە گوتی : خودا هەردوو چاوەکانم پێ بداتەوە و خەڵقی پێ ببینم . ئەویش دەستی هێنا بە

---

128 البخاري (3464) ومسلم (2964)

چاوەکانیدا و چاك بوونەوە . مەلائیکەتەکە گوتی : ئەی چ ماڵێکت پێخۆشە کە پێت بدرێت ؟ گوتی : مەڕ. ئەوجا مەڕێکی ئاوسی پێدرا .

پاشان وشتر و مانگا و مەڕەکان کەوتنە زاوزێ . یەکیان بوو بە خاوەنی دۆڵێك وشتر و ئەی دیکەیان بوو بە خاوەنی دۆڵێك مانگا . ئەوی دیکەشیان دۆڵێك مەڕ.

پاشان مەلائیکەتەکە ڕۆیشتەوە بۆ لای پیاوە گەڕوگولەکە لە شێوە و شکڵی جارانی پیاوە گەڕوگولەکەدا و گوتی: پیاوێکی هەژارو ڕێبوارم و دوورە ولاٌتم، ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ ولاٌتی خۆم . مەگەر خودا یارمەتیم بدات پاشان تۆش یارمەتیم بدەیت

. لەبەر ئەو خودایەی کە ڕەنگی جوان و ماڵ وسامانی داپێت .داوات لێدەکەم، وشترێکم پێ بدەیت با پێی بگەڕێمەوە ولاٌتی خۆم .

لە وەلاٌمدا گوتی: حەق وحقوقی زۆرم لەسەرە ، جاهەر کەسێك بێت وپێی ببەخشم خۆم هیچم بۆ نامێنێتەوە . ئەویش گوتی: ڕێك دەتناسمەوە . ئەرێ تۆ گەڕوگول نەبوویت خەڵکی بێزی دەکردەوە لێت، ئەرێ فەقیر نەبوویت، خودا ماڵ و سامانی بەخشی پێت ؟ ئەویش گوتی : نەخەیر ،ئەم ماڵ وسامانەم لە باب وباپیرانمەوە کە گەورەو بەڕێز بوون پشتا وپشت بۆم ماوەتەوە .

مەلائیکەتەکە گوتی:ئەگەر درۆ بکەیت لەوە بەر چۆن بوویت .دەك خودا وات لێ بکاتەوە .

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی : ئەوجا چوو بۆلای کەچەڵەکە چی بەو گوت هەمان قصە وباسیشی لە گەڵ ئەمیشدا دامەزراند . ئەمیش هەروەك ئەو جوابی دایەوە . بەمیشی گوت : ئەگەر درۆ بکەیت لەوە بەر چۆن بوویت دەك خودا وەهات لێ بکاتەوە .

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی : پاشان چوو بۆلای چاو کوێرەکە لە شێوەی پیاوێکی چاوکوێردا و گوتی :پیاوێکی هەژارو ڕێبوار و دوورە ولاٌتم .ناتوانم ئێستا بگەڕێمەوە . مەگەر خودا یارمەتیم بدات و پاشان تۆ . لەبەر ئەو خودایەی کە

چاوتی پێت دایەوە . مەڕێکم پێبدە , تا لە سەفەرەمدا سەرفی بکەم وبگەڕێمەوە شوێنی خۆم .

فيه مسائل: الأولى: تفسير الآية.

الثانية: ما معنى: (لَيَقُولَنَّ هَذَا لِي) . الثالثة: ما معنى قوله: (أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي).

الرابعة: ما في هذه القصة العجيبة من العبر العظيمة.

---

پیاوەکە گوتی : من کوێر بووم . خودا چاوی دایەوە پێم جاتۆش هەرچیت دەوێت بیبە .وەڵلاهی هەرچی بەریت چ کەم وچی زۆر دەستت ناگرم . ئەمەش تەنها بۆ ڕەزامەندی خودا .

مەلائیکەتەکەش پێی گوت :دەست بگرە بەماڵی خۆتەوە ،ئێوە تاقی کرانەوە ئەوا خودا لە تۆ ڕازی بوو، لە دوو هاوەڵەکەشت توڕە بوو )

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکە .

2- مەعنای (لیقولن هذا لي)

3- مەعنای { إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي }

4- لەم داستانە عەجیبەدا پەند و عیبرەتی گەورە هەیە .

ڕوونکردنەوە : گەڕوگولی جۆرە نەخۆشیەکە دەیدات لە پێست وپەڵەی سپی لە سەری پەیدا دەبێت . لە شوێنەکەی مووی سپی دێتە دەر لە جیاتی مووی ڕەش . ئەگەر چی گەنجیش بێت، بەم شێوەیە دەمێنێتەوە وچارەی نییە .

**49**- باب قول الله تعالى:

﴿ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ ﴾ الأعراف

قال ابن حزم: اتفقوا على تحريم كل اسم معبَّد لغير الله؛ كعبد عمر، وعبد الكعبة، وما أشبه ذلك، حاشا عبد المطلب.

**129**- وعن ابن عباس رضي الله عنه في الآية قال: لما تغشاها آدم حملت، فأتاهما إبليس فقال: إني صاحبكما الذي أخرجتكما من الجنة لتطيعاني أو لأجعلن له قرني أيل، فيخرج من بطنك فيشقه،

---

**بابی 49**

**تەفسیری** ﴿ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ ﴾

**واتە : ﴿ کاتیێ خودا منالێکی ساغ وسەلامەتی دا پێیان . ئەو دایك و باوکە . لە منداڵەکەیاندا شەریکیان بۆ خودا دانا . خوداش بەرز و بڵندە لەو شەریکایەتیەی کە بۆ خودایان داناوە ﴾**

**ابن حزم دەڵێت :( عولەما یەکدەنگن لە سەر ئەوەی کە هەر ناوێك عەبدایەتی پێوە بێت بۆ غەیری خودا . وەك ( عبد عمرو ) و ( عبدالكعبة ) وهەر ناوێك لەوە بچێت ئەوا حەرامە . جگە لە ( عبدالمطلب ) کە لەو بارەیەوە یەکدەنگ نین .**

**129- ابن عباس** ﷺ **لە ڕیوایەتێکدا لە بارەی تەفسیری ئەم ئایەتەوە دەڵێت کاتیێ ئادەم حەوای داپۆشی . سکی پڕ بوو . پاشان إبلیس هات بۆ لایان و گوتی : من هاوڕێکەی خۆتانم ئەوەی کە ئێوەی لە بەهەشت بە دەرکردن دا .**

---

**129** ضعيف . أخرجه ابن أبي حاتم (8654) قال ابن جبرين (بل إنّ القصة لا تثبت).

وللە یان دەبێت بە قصەم بکەن یا دوو شاخی بزنە کێوی بۆ منالەکەتان دروست دەکەم . ئەوجا دێتە دەر و سکی دایکی هەڵدەدڕێت .

هەر دەیگوت وادەکەم و وادەکەم ، بەردەوام هەردوکیانی دەترساند .

گوتی: ناوی بنێن (**عبدالحارث** ) وازتان لێدەهێنم . ئەوانیش بە قصەیان نەکرد و منداڵەکەیان بە مردوویی هاتە دەر .

ولأفعلن ولأفعلن . يخوفهما . سِّمياه عبد الحارث، فأبيا أن يطيعاه، فخرج ميتاً، ثم حملت، فأتاهما، فقال مثل قوله، فأبيا أن يطيعاه، فخرج ميتاً، ثم حملت، فأتاهما، فذكر لهما فأدركهما حب الولد، فسمياه عبد الحارث فذلك قوله تعالى: (جَعَلاَ لَهُ شُرَكَاء فِيمَا آتَاهُمَا ) رواه ابن أبي حاتم.

**130**– وله بسند صحيح عن قتادة قال: شركاء في طاعته، ولم يكن في عبادته.

**131**– وله بسند صحيح عن مجاهد في قوله: ( لئن آتيتنا صالحاً ) قال: أشفقا ألا يكون إنساناً،

**132**– وذكر معناه عن الحسن وسعيد وغيرهما.

---

پاشان سکی کردەوە، ئەوجا هاتەوە بۆلایان ، دیسانەوە هەمان وتەی بۆیان دووبارە کردەوە . ئەوانیش خۆشەویستی منداڵ چوە دڵیانەوە ، بۆیە منداڵەکەیان ناونا( **عبدالحارث** ) ئەمە تەفسیری ئەو ئایەتە دەکات ( جَعَلاَ لَهُ شُرَكَاء فِيمَا آتَاهُمَا)

130– [130]قەتادە لە بارەی: تەفسیری ئەو ئایەتەوە دەڵێت :

ئەو شیرکە لەوەدا بووە کە بە گوێی شەیتانیان کردووە نەك عیبادەتی بکەن .

131–[131]موجاهید لەبارەی { لئن آتيتنا صالحاً } دەڵێت : دەترسان مناڵەکەیان ئینسان دەرنەچێت .

132– [132]لە حەسەنی بەصری وسەعید و غەیری ئەوانیشەوە هەمان مەعنایان گێڕاوەتەوە .

---

130 الطبري في التفسير ((15521).

131 إسناده لين أخرجه ابن أبي حاتم .

132 ابن أبي حاتم في التفسير

**ڕوونکردنەوە :**

( 1) ناو نان بە ( **عبدالمطلب** ) دروست نییە . ئەو ناوە هی سەردەمی جاهیلیە ، هەر لە بەر ئەوەشە پێغەمبەر(ﷺ) نەیگۆڕیوە . ئەمەش وەك ناوی باوكی عەمری كوڕی عاص كە لەو كاتدا لە ژیاندا نەمابوو ، پێغەمبەر نەهات بیگۆڕێت . بەڵام ئەصحابەیەكی دیكە خۆی ناوی عاص بوو پێغەمبەر(ﷺ) ناوەكەی گۆڕی .

(2) لە بارەی ئەم ئایەتەوە چەند ئەسەرێ لە ئەصحابەوە ڕیوایەت كراوە پێدەچێت ئەوان لە كەسانێكی ئەهلی كیتابەوە وەریانگرتبێت ، ئایەتەكەش بە صەریحی باسی ئادەم وحەوا ناكات كە دەفەرموێ :{ فلما تغشاها } چونكە لە كۆتایدا كە دەفەرموێ :{ فتعالی الله عما یشركون } بەڵگەیە لە سەر ئەوەی كە ئەوانەی ئەو كارەیان كردووە جەمعن واتە كۆن . مەبەستیش لەو ئایەتەدا هەموو دایك و باوكێك دەگرێتەوە . واتە هەموو ژن وپیاوێ . كاتێ ژنەكە حامیلە دەبێت لە خودا دەپاڕێتەوە ئەگەر منداڵێكی ساغیان پێ بدات ، ئەوا شوكری خودا دەكەن . بەڵام كاتێ خودا منداڵە ساغەكەی داپێیان ، غەیری خودا دەكەن بە شەریكی خودا لە منداڵەكەیاندا .

***سەرەنجام:*** ئەم چیرۆكە بە مەرفوعی سابت نەبووە . وە ئەگەر مەوقوفیش بێت لە سەر هەندێك ئەصحاب . ئەوا ئەوانیش لە لە كتێبەكانی بەنی ئیسرائیل وەریان گرتووە . بە دوای ئەوەدا نەگەڕاون كە خەبەرەكە سابتە یان نا، وایان زانیوە كە ئەمە تەفسیری ڕاستەقینەی ئایەتەكەیە .

ئەوەی ڕاست و دروست بێت ئەوەیە كە (**ابن كثیر**) لە حەسەنی بەصریەوە دەگێڕێتەوە كە هەموو ڕەگەزی نەوەی ئادەم دەگرێتەوە .

واتە : هەموو ژن و مێردێك داوا دەكەن ئەگەر منداڵەكەیان ساغ وسەلامەت بێت . خۆ ئەگەر وا بوو ئەوا شوكری خودا دەكەن . بەڵام كاتێ خودا منداڵەكەی بە ساغی پێدان ، بێ وەفایی دەكەن و وەعدەكەیان لە بیر دەكەن و شەریكی بۆ دادەنێن...

پاشان ئەو چیرۆكەش لە چەندەها ڕووەوە لە گەڵ ئایەتەكەدا ناگونجێت ...ئەمەش ئیختیاری ابن تیمیە و ابن قیم یشە . بۆ ڕوونكردنەوەی ئەمە دەتوانیت سەیری (السبك الفرید) بكەیت یان ( القول المفید).

فيه مسائل: الأولى: تحريم كل اسم معبّد لغير الله. الثانية: تفسير الآية.
الثالثة: أن هذا الشرك في مجرد تسمية لم تقصد حقيقتها.
الرابعة: أن هبة الله للرجل البنت السوية من النعم.
الخامسة: ذكر السلف الفرق بين الشرك في الطاعة، والشرك في العبادة.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- هەر ناوێ کە عەبدایەتی تێدا بێت بۆ غەیری خودا . بە حەرام دانراوە .
2- تەفسیری ئایەتەکە . (بەم جۆرەیە )
3- کە ئەم شیرکە تەنها لە ناو نانەکەدایە مەبەست حەقیقەتی ناونانەکەش نەبووە . (واتە : مەبەستیان ئەوە نەبووە کە منداڵەکەیان بە عەبدی شەیتان بزانن)
4- ئەگەر خودا کچێکی ساغی دا بە ئینسان ئەوە نیعمەتێکی گەورەیە .
5- سەلەف باسی ئەوەیان کردووە کە فەرق هەیە لە نێوان شیرکی تاعەتکردن و شیرکی عیبادەت بۆ کردندا .

**50 – باب قول الله تعالى ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ ١٨٠﴾**

**133**– ذكر ابن أبي حاتم عن ابن عباس رضي الله عنهما (يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ): يشركون. وعنه:

**134**– سموا اللات من الإله، والعزى من العزيز.

**135**– وعن الأعمش: يدخلون فيها ما ليس منها.

---

## بابی 50 باسی داوا کردن بە ناوە جوانەکانی خوداوە و پشتکردن لە نەفامان

﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٨٠﴾ الأعراف

**واتە :﴿ تەنها الله خاوەنی ناوە هەرە جوانەکانە ( کە لە جوانی و تەواویدا سنوریان نیە). جا کەواتە ئێوەش بەو ناوانەوە لە خودا بپاڕێنەوە و عیبادەتی بۆ بکەن و واز لەوانەش بێنن و لێیان دوور بکەونەوە کە لە بارەی ناوەکانی خوداوە لایان داوە . ئەوانە دواتر سزای ئەو کردەوانیان وەردەگرن کە ئەنجامیان داوە ﴾**

**دانەر بۆ ئەو ئایەتە سێ تەفسیری هێناوە :**

133–[133]**ابن عباس لە بارەی (يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ) دەڵێت :**

**(واتە : لە ناوەکانیدا ، شەریك بۆ خودا دادەنێن )**

134 –[134]**هەروەها لە (ابن عباس) ەوە دەڵێت :**

---

133 مروي عن قتادة أخرجه الطبري .

134 الطبري (15464) وابن أبي حاتم .

( واتە : لە ناوی (الإلـه ) ەوە بتەکەیان ناو نا لات وە لە( العزیـز) ەوە بتەکەیان ناونا عوزا )

135- [135] لە ئەعمەشەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی:

( واتە : ناوانیّ دەخەنە ڕیزی ناوەکانی خوداوە کە ئەوانە ناوی خودا نین )

فيه مسائل:

الأولى: إثبات الأسماء. الثانية: كونها حسنى. الثالثة: الأمر بدعائه بها.

الرابعة: ترك من عارض من الجاهلين الملحدين.

الخامسة: تفسير الإلحاد فيها. السادسة: وعيد من ألحد.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1-چەسپاندنی ناوەکانی خودا . (فێر بوونیشیان واجبە )

2- ناوەکانی خودا ئەو پەڕی جوان و تەواون .

3- ئەمر کراوە کە بەو ناوانەوە لە خودا داوا بکەین و عیبادەت بۆ خودا بکەین .

4- ئەمر کراوە بە سەرماندا کە دوور بکەوینەوە لەو کەسانەی کە لە ناوەکانی خودادا لایان داوە . ( نەچینە سەر ڕێگای ئەوان )

5- تەفسیری لادان لەبارەی ناوەکانی خوداوە .

6- هەڕەشەی خودا لەو کەسانەی کە لایان داوە

ڕوونکردنەوە :

1. یەکێك لە جۆرەکانی لادان ناونانی خەڵقیە بەناوەکانی خوداوە . وەك ( ڕەحمان،، ،کەریم ،صەمەد)

---

135 ابن أبي حاتم (8587)

داهێنانی ناو بۆ خودا بە جۆرێك كە لە شەرعدا نەهاتێت وەك ئەوەی كە دەڵێن : ئەندازیاری گەورە (المهندس الأعظم)

## 51- باب لا يقال: السلام على الله

**136**- في الصحيح عن ابن مسعود رضي الله عنه قال:

(كُنَّا إِذَا كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الصَّلَاةِ قُلْنَا السَّلَامُ عَلَى اللَّهِ مِنْ عِبَادِهِ السَّلَامُ عَلَى فُلَانٍ وَفُلَانٍ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ [لَا تَقُولُوا السَّلَامُ عَلَى اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلَامُ ]

فيه مسائل:

الأولى: تفسير السلام. الثانية: أنه تحية.

الثالثة: أنها لا تصلح لله. الرابعة: العلة في ذلك.

الخامسة: تعليمهم التحية التي تصلح لله

---

بابی 51

## نابێت بگوترێت: سلاو لە خودا

136 – ابن مسعود دەڵێت :﴿ كە لە گەڵ پێغەمبەر ﷺ بووینایە لە نوێژدا دەمانگوت : سەلام لە خودا لەلایەن عەبدەكانیەوە سەلام لە فلاًن وفلاًن( واتە

---

136 البخاري 835 ومسلم (402) وأحمد 4101

جبریل و میکائیل ) پێغەمبەریش ﷺ فەرموی :( مەڵێن سەلام لە خودا چونکە خودا هەر خۆی سەلامە ).

( واتە: دوورە لە هەموو نوقصانی و ناتەواوییەك، هەر خۆشی دروستکراوەکانی سەلامەت دەکات ) بەڵکو بڵێن (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ ) تا کۆتایی حەدیسەکە ﴿.

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری (السلام ) (کە ناوێکە لە ناوەکانی خودا واتە : دوور لە هەموو نوقصانی و عەیبیٚ )

2- ئەو سەلام کردنەی ئەصحاب مەبەستیان تەحیات بووە ( واتە : بە گەورە زانینی خودا) نەك مەعنای سەلام و سەلامەتی. ( واتە نییەتی باش لە کاری هەڵەدا دەوری نییە ).

3-سەلام کردن لە خودا کارێکی نابەجیٚ و نەگونجاو و ناشایستەیە وحەرامە .

4- هۆی ئەو نەگونجانە ڕوونکراوەتەوە .

یەکەم : خۆی ناوی سەلامە و صیفەتی سەلامە .

دووەم : (سڵاو لە فلان : واتە دوور بێت لە خراپەو نوقسانی و بەڵاو موصیبەت . خوداش خۆی دوورە لەوانە و پێویست ناکات ئەو دوعایەی بۆ بکرێت ).

5- پێغەمبەر ﷺ ئەصحابەکانی فێر کراون چ جۆرە تەحیەیەك بەکار بهێنن کە شایستەی خودا بێت .

( ئەوە بوو فێر کران کە بڵێن التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ )

واته :( هەر چی نەوعی مەزنایەتی وهەرچی عیبادەته تەنها بۆ خودایه و هەر شایستەی خۆیەتی نەك غەیری ئەو ). هەر چی نوێژ و داوا کردنه تەنها بۆ ئەوه ، هەرچی کردەوه پاکەکانه تەنها بۆ ئەوه).

**52– باب قول: اللهم اغفر لي إن شئت**

**137– في الصحيح عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ {لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي إِنْ شِئْتَ لِيَعْزِمْ الْمَسْأَلَةَ فَإِنَّهُ لاَ مُكْرِهَ لَهُ}**

**ولمسلم:[ وَلِيُعَظِّمْ الرَّغْبَةَ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لاَ يَتَعَاظَمُهُ شَيْءٌ أَعْطَاهُ}**

فيه مسائل: الأولى: النهي عن الاستثناء في الدعاء. الثانية: بيان العلة في ذلك.

الثالثة: قوله: (ليعزم المسألة). الرابعة: إعظام الرغبة.

الخامسة: التعليل لهذا الأمر.

---

بابی52

## نابێت بگوترێت : خودایه لێم خۆش ببه ، ئەگەر دەتەوێت

137– [بیسمتر](**أبوهريرة**) دەڵێت : پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموی : ( با کەستان نەڵێت (خودایه لێم خۆش ببه ئەگەر دەتەوێت ، خودایه ڕەحمم پێ بکه ئەگەر دەتەوێت .

---

**137** البخاري (6339) ومسلم (2679)

بادوعاو پاڕاناوەکەی بە گەرمی و بە عەزمەوە بکات ، چونکە خودا لەهیچ کارێکدا ناچارناکرێت ).

لە ڕیوایەتی موسلیمدا

(با لە دوعاکەی دا ، داوای شتی گەورە بکات . ئەڵبەتە هەر شتێك کە خودا ببیەخشێت لە لایدا گەورە و گران نییە ) .

## لەم باسەدا چەند مەسەلەیەك هەیە

1- نەهی کراوە لەوەی کەئەم جۆرە شەرتە، لە دوعادا بەکار بهێنرێت .
2- ڕوونکردنەوەی هۆی ئەو نەهی کردنە .
3- فەرمودەکەی : بابە گەرمی و عەزیمەتەوە داوابکات نەك بە ساردی و سڕیەوە
4- با لە دوعاکەیدا تەماعی زۆر بێت داوای شتی گەورە بکات .
5- ڕوونکردنەوەی هۆکاری ئەم فەرمانە .

***ڕوونکردنەوە:*** ئەوکەسەی کە لەخودا دەپاڕێتەوە واجبە لەسەری کە بە گەرم و گوڕیەوە لە خودا بپاڕێتەوە ، داواکاریەکەشی نەبەستێتەوە بە ویست و مەشیئەتی خوداوە . چونکە هەرکەس ئەگەر وای کرد ئەوا دوو مەعنا لەخۆ دەگرێت .

یەکەم : مەعنای ئەوە دەگەیەنێت کە لە داواکەیدا سارد و سڕە . وەك ئەوەی پێویستی بە خودا نەبێت . و بڵێت : ئەگەر شتێکی بۆ کردم ئەوا باشە ، ئەگەر نەشی کرد ئەوا هەر قەیناکا .

دووەم : وا دەزانێت ، کەخودا دۆعای خەڵکی قبوڵ دەکات و لەهەمان کاتیشدا پێی ناخۆشەو زۆری لێدەکرێت ، چونکە ( إن شئت) یەعنی زۆرت لێناکەم ، دەترسم زەحمەتت بدەم . بەڵام ئەگەر دەتەوێت و دەتوانیت لێم خۆش ببە و ڕەحمم پێبکە . ئەمەش شایستەی خودا نییە و بەکەم زانینی ڕێز و مەزنایەتی خودایە . خوداش لە هیچ شتێکدا زۆری لێناکرێت . (إعانة المستفيد )

**ئاگاداری** : **لای خۆشمان فێربوون لە ئەخێری دوعاوە دەڵێن : (إنشاء الله) .**

**دەڵێن : خودا عافومان بکات (إنشاء الله) ، خودا سەلامەتت بکات (إنشاء الله) ئەڵبەتە دوعاکردن بەم جۆرە بەر ئەو نەهیە دەکەوێت .**

## 53- باب لا يقول: عبدي وأمتي

138 – في الصحيح عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ {لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ اسْقِ رَبَّكَ أَطْعِمْ رَبَّكَ وَضِّئْ رَبَّكَ، وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ رَبِّي وَلْيَقُلْ سَيِّدِي وَمَوْلاَيَ وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ عَبْدِي أَمَتِي وَلْيَقُلْ فَتَايَ فَتَاتِي غُلاَمِي}).

فيه مسائل:

الأولى: النهي عن قول: عبدي وأمتي.

الثانية: لا يقول العبد: ربي، ولا يقال له: أطعم ربك.

الثالثة: تعليم الأول قول: فتاي وفتاتي وغلامي.

الرابعة: تعليم الثاني قول: سيدي ومولاي.

الخامسة: التنبيه للمراد، وهو تحقيق التوحيد حتى في الألفاظ.

---

**بابی53**

## نابێت بگوترێت عەبدی من و کەنیزەکی من

138 أبوهريرة رضي الله عنه دەڵێت : پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموی : (با هیچ کەستان نەڵێت : خواردن بدە بە ڕەببی خۆت ، یائاوی دەستنوێژ بێنە بۆ ڕەببی خۆت . بەڵکو باعەبدەکە بڵێت : گەورەم .ئێوەش با کەستان نەڵێت عەبدی من ، یا کەنیزکەکەی من بەڵکو لە جێگەی ئەوە با بڵێت کارەکەرەکەم یا خزمەتکارەکەم).

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- نەهی کراوە لەوەی کە (خاوەنی عەبد) بڵێت : عەبدەکەم . یا بڵێ کەنیزەکەکەم .

2- نابێت : عەبدەکەش بڵێت بە گەورەکەی : ڕەببی من وە نابێت پێی بگوترێت خواردن بدە بە ڕەببی خۆت .

3-یەکەمیان فێری ئەوە دەکرێت کە بڵێت خزمەتکارەکەم یا کارەکەرەکەم .

4- دەبێت دووەمیان فێری ئەوە بکرێت کە بەخاوەنەکەی بڵێت : گەورەم .

5- ئاگاداربوون و وریابونەوە لەوەی کە مەبەست لەم ئەمر و نەهیە، بەدی هێنانی تەوحیدە، لە هەموو ڕوویەکەوە . تەنانەت لەو گوتانەشدا کە لە دەم دەردەچن .

***ڕوونکردنەوە*** : ئەم مەسئەلەیە لەم کاتەدا لای خۆمان لای خەلکی تەواو ڕوون نیە.

یەکەم : چونکە ئەم کەلیمانە لە ناو کوردا بەکار ناهێنرێت و تایبەتە بەزمانی عەرەبی.

دووەم : ئەوە بۆ زەمانەیەکە خەڵکی خاوەنی عەبد و کۆیلە بن . بەڵام ئێمە دەتوانین . لە مەبەستی بابەتەکە حاڵی ببین کە نابێت کەلیمەیەك تایبەت بێت بە خودا ، ئێمە بەکاری بهێنین بۆ غەیری خودا ، با لەڕووی دەستور و زمانەوە تەواویش بێت ، ئەمەش لەپێناوی ڕێزگرتن لە ناو و صیفەتەکانی خودا پاشان

---

138 البخاري (2552) ومسلم (2449)

**کەلیمەی (ربً) دوو مەعنای هەیە یەکەم : خاوەن . دووەم : پەروەردگار. ئەو کاتە عەرەب کە دەیگوت ڕەببی واتە خاوەنەکەم . خاوەنەکەشی دەیگوت عەبدەکەم بەڵام لە شەرعدا ئەو دوو وشەیە بۆ بەینی خوداو عەبدەکەی بەکار دێت ، جا بۆئەوەی تێکەڵ بوون ڕوو نەدات . پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دوو وشەیەی بەو جۆرە قەدەغە کرد و دوو وشەی شیاوی لە جێگەیان دانا .**

## 54- باب لا يرد من سأل بالله

**139- عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ [ مَنْ اسْتَعَاذَ بِاللَّهِ فَأَعِيذُوهُ وَمَنْ سَأَلَ بِاللَّهِ فَأَعْطُوهُ وَمَنْ دَعَاكُمْ فَأَجِيبُوهُ وَمَنْ صَنَعَ إِلَيْكُمْ مَعْرُوفًا فَكَافِئُوهُ فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُونَهُ فَادْعُوا لَهُ حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ ]** رواه أبو داود والنسائي بسند صحيح.

فيه مسائل:

الأولى: إعاذة من استعاذ بالله.

الثانية: إعطاء من سأل بالله.

الثالثة: إجابة الدعوة.

الرابعة: المكافأة على الصنيعة.

الخامسة: أن الدعاء مكافأة لمن لم يقدر إلا عليه.

السادسة: قوله: (حتى ترون أنكم قد كافأتموه).

## بابی 54

# هەرکەس بەناوی خوداوە داوای شتێکی کرد نابێت ڕەد بکرێتەوە

139–ئیبنو عومەر دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : (هەرکەسێك داوای کرد بە ناوی خوداوە ، پێی ببەخشن ، وەهەر کەس پەنای گرت بە خودا پەنای بدەن ، وەهەرکەس دەعوەتی کردن بڕۆن بەدەم دەعوەتەکەیەوە . هەر کەسێکیش هەر چاکەیەکی کرد لە گەڵتاندا (با کافریش بێت ) (مادام ئەو کارە واجب نەبێت لە سەری) ، ئێوەش پاداشتی بدەنەوە ، ئەگەر نەتانبوو یا نەتانتوانی . ئەوا ئەوەندە دۆعای بۆبکەن هەتا وادەزانن کە پاداشتان داوەتەوە ) .

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1– پەنادانی هەرکەسێ کە پەنا بەخودا دەگرێت .
2– بەخشین بە هەرکەسێ کە بەناوی خوداوە داوای شتێك بکات .
3– چون بەدەم دەعوەتەوە .
4– پاداشت دانەوەی کەسێك کە چاکەی کردوە لە گەڵتاندا .
5– دۆعا بۆکردن پاداشتی ئەو کەسەیە کە ناتوانرێت چاکەی بەرانبەر بکرێتەوە .
6– فەرمودەکەی: هەتا وا دەزانن کە بە تەئکید پاداشتان داوەتەوە

ڕوونکردنەوەی مەسەلەکان :

---

139 صحيح أخرجه أبو داود (1672) والنسائي .

یەکەم : پەناگرتن بەخودا : وەك ئەوەی کەبڵێت پەنا بەخودا لە خراپەت یا لەدەست تۆ، یا توخوا وامەکە ، ئەوا واجبە وازی لێبێنیت .

دووەم : {داوا کردن بەناوی خوداوە} وەك ئەوەی کە بڵێت : بەخودا دەبێت فلاَن شت بدەی پێم، یا توخوا ئەو شتەم بدەرێ، یا لەبەر خودا . ئەمەش سێ حاڵەتی هەیە .

1- ئەگەر داوای حەقی خۆی کرد واجبە لەبەر ڕێزی ناوی خودا ، پاشان لەبەر حەقی خۆی پێی بدرێت.

2- ئەگەر داوای شتێکی ناحەق یا ناشەرعی کرد، ئەوا نابێت پێی بدرێت .

3- ئەگەر سواڵکەر بوو، ئەوا ئەگەر توانیت شتێکی پێ دەدەیت با کەمیش بێت ، بۆ بێدەنگ کردنی .

سێیەم : ئەو دەعوەتەی کە واجبە بڕۆیت بە دەمیەوە ، بە قەولی جمهوری زانایان تەنها دەعوەتی (وەلیمە)ی ژنهێنانە ، تایبەتە بۆ بەینی موسڵمانان و، ئەمەش ئەگەر ناشەرعی تێدا نەبێت . خۆ ئەگەر ناشەرعی تێدا بوو، بە چونی تاوانبار دەبێت.

## 55- باب لا يسأل بوجه الله إلا الجنة

140- عن جابر رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ « لاَ يُسْأَلُ بِوَجْهِ اللَّهِ إِلاَّ الْجَنَّةُ »

رواه أبو داود.

فيه مسائل:

الأولى: النهي عن أن يسأل بوجه الله إلا غاية المطالب. الثانية: إثبات صفة الوجه.

---

بابی 55

## کە بە (ڕوخساری خودا) وە دوعا کرا نابێت جگە لە بەهەشت داوای شتی دیکە بکرێت

140– جابر گوتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی : ( کە بە (ڕوخساری خودا) وە داوا کرا لە خودا نابێت جگە لە بەهەشت داوای شتی دیکە بکرێت )

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1– نەهی کراوە لەوەی کە لە داوا کردندا ، جگە لە گەورەترین داواکاری کە بەهەشتە داوای هیچ شتێکی دیکە بکرێت ، ئەگەر بە کەلیمەی (ڕوخساری خودا) وە داوا کرا .

2– ئیسپات کردن وسەلمانی صیفەتی ڕوخساری خودا .

**ڕوونکردنەوە** : هەر چەندە ئەم حەدیسە زەعیفە بەڵام قورئان پشتیوانی لێ دەکات وەك ئایەتی ﴿ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾ پاشان (**وجه الله**) گەورەترین صیفەتی خودایە . دەبێت گەورەترین ئامانج وداواکاری پێوە داوا بکرێت .

## 56– باب ما جاء في اللّو

وقول الله تعالى: (يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا) آل عمران

وقوله: (الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا) آل عمران 168

**141**– في الصحيح عن أبي هريرة أن رسول الله ﷺ قال: (احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلاَ تعْجزنّ وَإِنْ أَصَابَكَ شَىْءٌ فَلاَ تَقُلْ لَوْ أَنِّى فَعَلْتُ لكَانَ كَذَا وَكَذَا. وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللَّهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ »

---

**140** ضعيف أخرجه أبو داود ( 1673) . ضعيف الجامع (6366)

فيه مسائل: الأولى : تفسير الآيتين في آل عمران.

الثانية : النهي الصريح عن قول: لو، إذا أصابك شيء.

الثالثة : تعليل المسألة بأن ذلك يفتح عمل الشيطان. الرابعة : الإرشاد إلى الكلام الحسن.

الخامسة : الأمر بالحرص على ما ينفع مع الاستعانة بالله. السادسة : النهي عن ضد ذلك وهو العجز.

---

## بابی 56

# باسی بەكارهێنانی كەلیمەی (ئەگەر ) بۆ ڕابردوو

﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ﴾ [ آل عمران: **154**]

واتە :( مونافیقەكان ، گوتیان ئەگەر لەو كارەدا شتێكمان بەدەست بوایە ، (هەندێكمان) ئا لێرەدا نە دەكوژراین )

﴿ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْ ﴾ [ آل عمران: **168**]

واتە: (ئەوانەی لەبارەی براكانیانەوە گوتیان و خۆشیان دانیشتن و نەچوون بۆ غەزا : ئەگەر بە قصەی ئێمەیان بكردایە ، ئەوا نەدەكوژران )

141- أبوهريرة رضي الله عنه دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی :﴿ سوربە لەسەر ئەوەی كە سودت پێ دەگەیەنێت (بۆ دین و دونیات) لەوەشدا بەخۆت پشت ئەستور مەبە و داوای كۆمەكی یارمەتی لە خودا بكە ، تەمەڵی و ئیهماڵی مەكە.

پاش ئەوانە ئەگەر توشی شتێك بویت پێت ناخۆش بوو ئەوكاتە (بزانە ئەمە قەدەری خودایە) و مەڵێ: ئەگەر ئاوا و ئاوام بكردایە ، ئاواو ئاوا دەبوو . بەڵكو (لەبری ئەوە بە دڵ و بە زمان ) بڵێ ئەوە قەدەری خودایە . خودا چی ویست بیكات ، كردی. چونكە گوتنی ( ئەگەر بۆ ڕابردوو ) دەرگای كاری شەیتان دەكاتەوە ﴾

---

**141** مسلم (2664)

<ins>***ڕوونكردنــەوە***</ins> : بــەكارهێنانی كەلیمــەی( ئەگــەر) بــۆ ڕابــردوو . ئەگــەر بــۆ ڕوونكردنەوەی حوكمێك بوو ، ئەوا دروستە .

(كردنـەوەی دەرگـای كـار و كاریگـەری شـەیتان ) چـەند شـتیٚ دەگرێتـەوە : وەك ئـەوەی بـاوەڕی وابێـت دەیتـوانی واقع و قـەدەری خـودا بگـۆڕێـت ، یـان ئەوەتـە شـەیتان وەسوەسـە دەخاتـە دڵیـەوە و توشـی غـەم و خەفـەت و قەلـەقی نەفسـی دەكات ، وای لێدەكات لە زۆر خێریٚ بێبەش بێت ...

## مەسەلەكانی ئەم باسە

1- تەفسیری دوو ئایەتەكەی ئالی عیمران

2- بە ئاشكرا نەهی كراوە لەوەی كە بگوترێت ( ئەگەر ) دوای ئەوەی كە توشی موصیبەتێك بوویت .

3- هۆكاری ئەم مەسـەلەیە دیـاری كـراوە ، بـەوەی كـە ئـەو گوتەیـە دەرگـای كـاری شەیتان دەكاتەوە .

4- ڕێنمونی كردن بەرەو گوتەی جوان و چاك . لە جێگەی ئەوە .

5- ئەمر كردن بە سور بوون لەسـەر هەرشـتیٚ كـە سـودت پـیٚ بگەیـەنێت ، لەگـەڵ داوای كۆمەكی و یارمەتی لە خودا كردن .

6- نەهی كراوە لە پێچەوانەكەی كە تەمەڵی و ئیهمالیە .

## 57- باب النهي عن سب الريح

142- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

[ لَا تَسُبُّوا الرِّيحَ فَإِذَا رَأَيْتُمْ مَا تَكْرَهُونَ فَقُولُوا اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ هَذِهِ الرِّيحِ وَخَيْرِ مَا فِيهَا وَخَيْرِ مَا أُمِرَتْ بِهِ وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ هَذِهِ الرِّيحِ وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُمِرَتْ بِهِ ] صححه

الترمذي.

---

### بابی 57

## قەدەغەکردنی جوێن دان بە با

142– ﷺ ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی : ( جوێن مەدەن بە با ( واتە : زەمی مەکەن و لەعنەتی لێ مەکەن) ئەگەر هەر شتێکتان لێ بینی کە پێتان ناخۆش بوو، وەك زەرەر و زیان (ئەوا بگەڕێنەوە بۆ تەوحید و) بڵێن :(خودایە داوای چاکەی ئەو بایەت لێ دەکەین وە هەر چاکەیەکیش کە تیایدا هەیە . وە هەر چاکەیەکیش کە ئەو بایە ئەمری پێدراوە کە بیکات . وە پەنات پێدەگرین لە خراپەو بەدی ئەم بایە . (ئەگەر خراپەی تێدابوو ) وە لە خراپەی هەر چی تێدایە و هەڵی گرتووە . وە لە بەدی و خراپەی هەر چییەك کە فەرمانی پێدراوە بیکات ) تەواو

**فيه مسائل:**

الأولى: النهي عن سب الريح.

الثانية: الإرشاد إلى الكلام النافع إذا رأى الإنسان ما يكره.

الثالثة: الإرشاد إلى أنها مأمورة.

الرابعة: أنها قد تؤمر بخير وقد تؤمر بشر.

---

**142** صحيح أخرجه الترمذي (2252) والبخاري في الأدب المفرد

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1– قەدەغە کردنی جوێندان بە با. واتە حەرامە

2– ڕێنیشاندان بەرەو وتەی جوان و بەسود ، ئەگەر ئینسان شتێکی بینی کە پێی ناڕەحەت بێت .

3– ڕێ نیشاندان بەرەو ئەوەی کە دەبێت موسڵمان باوەڕی وابێت کە ئەو بایە تەنها بە فەرمانی خودا دێت و دەچێت .

4– هەندێ جار فەرمانی چاکەی بە سەردا دەدرێت و هەندێ جاریش فەرمانی پێ دەدرێت بەوەی کە زەرەر و زیان بگەیەنێت (کەواتە خۆی هیچی بە دەست نیە )

ڕوونکردنەوە : یەکەم : جوێندان ، واتە : عەیبدار کردن ، یا تانە لێدان یا زەمکردن یا لەعنەت لێکردن .

دووەم : ئەم قەدەغە کردن و نەهییە تایبەت نییە بە باوە ، بەڵکو هەرشتێ بە ئەمری خودا بجولێت ، هەمان حوکمی هەیە وەك بەفر و باران و بەحرەکان .
(ئامادەکار)

**58**– باب قول الله تعالى: (يَظُنُّونَ بِاللّهِ غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ الأَمْرِ مِن شَيْءٍ قُلْ إِنَّ الأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ)

وقوله: ﴿الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ﴾

قال ابن القيم في الآية الأولى: فسّر هذا الظن بأنه سبحانه لا ينصر رسوله، وأن أمره سيضمحل، وفسر بظنهم أن ما أصابهم لم يكن بقدر الله وحكمته،

---

## بابی 58

# باسی بەدگومانی بەرانبەر بە خودا کە پێچەوانەی تەوحیدە

﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ﴾[آل عمران:154] تا دوایی

**واتە :﴿ ئەو مونافیقانە گومانی ناحەق دەبەن بە خودا گومانێك كە ئەوپەڕی نەزانی و نەفامییە . دەڵێن ئایە ئەم كارە هیچی دەدرێتە دەست ئێمە (واتە ئەگەر بە دەست ئێمە بوایە وامان بە سەر نەدەهات )ئەی پێغەمبەر بڵێ : هەرچی ئەمر و فەرمانە چی شەرعی بێت و چی قەدەری هەر هەمووی حەقی خودایە و هەر بۆ خودایە . واتە:هەمووی بە قەزا و قەدەری خودایە ).**

﴿ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ﴾﴿الفتح 6﴾ **واتە ::(ئەوانەی كە گومانی خراپیان دەبرد بە خودا . دەوری خراپ بە سەر خۆیاندا دێت)**

**ابن القيم : لە بارەی ئایەتەكەی یەكەمەوە دەڵێت : ئەو گومانە بەوە تەفسیر كراوە كە**

1. **خوداپێغەمبەرەكەی سەر ناخات و كاری ئەم پێغەمبەرەش لە تەواو بووندایە**
2. **بەوەش تەفسیر كراوە كە وتیان ئەو شكستەی بە سەر پێغەمبەر و ئەصحابەكانیدا هات لە ئوحودا ، بە قەدەر و حیكمەتی خودا نەبووە .**
3. **بەوەش تەفسیر كراوە كە ئینكاری حیكمەت و ئینكاری قەدەریان كردووە . ئینكاری ئەوەشیان كردووە، خودا كاری پێغەمبەرەكەی تەواو بكات و زاڵی بكات بە سەر هەموو دینەكانی دیكەدا .**

ففسر بإنكار الحكمة، وإنكار القدر، وإنكار أن يتم أمر رسوله، وأن يظهره الله على الدين كله.

وهذا هو الظن السوء الذي ظنه المنافقون والمشركون في سورة الفتح، وإنما كان هذا ظن السوء؛

لأنه ظن غير ما يليق به سبحانه، وما يليق بحكمته وحمده ووعده الصادق، فمن ظن أنه يديل الباطل على الحق إدالة مستقرة يضمحل معها الحق، أو أنكر أن يكون ما جرى بقضائه وقدره أو أنكر أن يكون قدره بحكمة بالغة يستحق عليها الحمد، بل زعم أن ذلك لمشيئة مجردة، فذلك ظن الذين كفروا فويل للذين كفروا من النار. وأكثر الناس يظنون بالله ظن السوء فيما يختص بهم وفيما يفعله بغيرهم، ولا يسلم من ذلك إلا من عرف الله وأسماءه وصفاته وموجب حكمته وحمده.

فليعتن اللبيب الناصح لنفسه بهذا، وليتب إلى الله ويستغفره من ظنه بربه ظن السوء، ولو فتشت من فتشت لرأيت عنده تعنتاً على القدر وملامة له، وأنه كان ينبغي أن يكون كذا وكذا، فمستقل ومستكثر، وفتش نفسك: هل أنت سالم؟فإن تنج منها تنج من ذي عظيمة......وإلا فإني لا إخالك ناجياً

فيه مسائل: الأولى: تفسير آية آل عمران. الثانية: تفسير آية الفتح.

الثالثة: الإخبار بأن ذلك أنواع لا تحصر.

الرابعة: أنه لا يسلم من ذلك إلا من عرف الأسماء والصفات وعرف نفسه.

---

ئەمەش ئەو گومانە خراپەیە کە مونافیقەکان و موشریکەکان (بەرانبەر خودا بوویان) و لە سورەتی فەتحدا باس کراوە ، بۆیە ئەوەش ناو براوە بە گومانی خراپ ، چونکە ئەو گومانە شایستەی ئەو خودایە نیە کە پاك و بێگەردە .

ئەو گومانە شایستەی حیکمەت وستایش و وەعدە ڕاستەکانی ئەو نیە . جا هەر کەس گومانی وابێت کە خودا ناحەق زاڵدەکات بە سەرحەقدا. زاڵبوونێکی بەردەوام و جێگیر و لەگەڵ ئەوەشدا حەق تیا دەچێت . ( ئەمەش گومانی مونافیقەکان و موشریکەکانە) .

یان ئینکاری لەوە بکات کە هەرچی ڕووی داوە ، بە قەزا و قەدەری خودا بوو بێت . (ئەمەش گومانی موعتەزیلەکانە)

یان ئینکاری ئەوە بکات کە قەدەری خودا بە پێی حیکمەتی تەواوی خۆی بوو بێت . وشایستەی ئەوە بێت کە لە قەدەرەکانیدا ستایش بکرێت .

بەڵکو ئیدعای ئەوەش بکات ، کە هەرچی ڕووی دابێت تەنها بەپێی ئیرادەیەکی ڕووت بوویێت (بەبێ حیکمەت ). (ئەمەش گومانی ئەشعەریەکانە)

﴿ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ٢٧ ﴾ ص

(ئا ئەمە گومانی ئەوانەن کە کافر بوون . ئەی هاوار بە حاڵی ئەوانەی کە کافر بوون لە ئاگری جەهەنەمدا )

زۆرینەی خەڵکیش گومانی بەد دەبەن بەرانبەر خودای گەورە . لەوەدا کە تایبەت بێت بە خۆیان، لەوەشدا کە خودا بەخەڵکی دیکەی دەکات، هیچ کەسیش لەم بەدگومانیە، سەلامەت نابێت . مەگەر ئەوانەی کە ناو و صیفەتەکانی خودا دەناسن، و دەشزانن کە خودا هەر خۆی حەکیمە و هەر خۆی شایستەی حەمد و ستایشە . جابا ئینسانی ئاقلْ و دڵسۆزی خۆی، گرنگی بدات بەم مەسئەلەیە، و تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆلای خودا . داوای لێخۆشبونی لێبکات، لەوەدا کە بەد گومانی کردوە بەرانبەر پەروەردگارەکەی .

جائەگەر لە هەرکەس وورد بیتەوە و پشکنینی بۆ بکەیت . دەبینی لە قەدەر ناڕازیە و لۆمەی دەکات . و دەڵێت دەبوایە ئاوا بوایە و ئاوا بوایە .

هەیە ئەو صیفەتەی بە کەمی تێدایە و هەیشە بە زۆری تیایدا هەیە .

تۆش تەفتیشی خۆت بکەو بزانە لەو بەڵایە (بەڵای ناڕازی بوون) سەلامەتی یان نا ؟

جائەگەر لەم فیتنەیە ڕزگارت بوبێت ، ئەوا لەبەڵایەکی گەورە دەرباز بویت .

ئەگەر واش نەبوو، وانازانم کە نەجاتت ببێت) . گوتەکەی (ابن القيّم) تەواو

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری ئایەتەکەی آل عمران .

2- تەفسیری ئایەتەکەی الفتح

3- خەبەری ئەوەی کە ئەو بەد گومانیە نەوعی زۆرەو ژمێرە ناکرێت

4- هیچ کەس لەم بەلاَیە نەجاتی نابێت ، مەگەر کەسێك کە ناو و صیفەتەکانی خودا بناسێت و خۆشی بناسێت .

## 59- باب ما جاء في منكري القدر

**143**- وقال ابن عمر: والذي نفس ابن عمر بيده، لو كان لأحدهم مثل أحد ذهباً، ثم أنفقه في سبيل الله ما قبله الله منه حتى يؤمن بالقدر. ثم استدل بقول النبي ﷺ : (الْإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وتؤمن بالقدر خَيْرِهِ وَشَرِّهِ ) رواه مسلم.

وعن عبادة بن الصامت أنه قال لابنه: (يا بني إنك لن تجد طعم الإيمان حتى تعلم أن ما أصابك لم يكن ليخطئك، وما أخطأك لم يكن ليصيبك، سمعت رسول الله ﷺ يقول: (إن أول ما خلق الله القلم، فقال له: اكتب، فقال: رب، وماذا أكتب؟ قال: أكتب مقادير كل شيء حتى تقوم الساعة)

**144**- يا بني سمعت رسول الله ﷺ يقول: (من مات على غير هذا فليس مني).

---

### بابی 59

## باسی حوکمی هەرکەسێ کە ئینکاری قەدەری خودا بکات

143- عبدالله ی کوڕی عومەر دەلێت :( سوێند بەو کەسەی کە نەفسی کوڕی عومەری بە دەستە ئەگەر هەر یەکێ لەوان بە قەد کێوی ئوحود زێڕی هەبێت پاشان لە ڕێگای خودا دا صەرفی بکات , خودا لێی قبولێ ناکات، هەتا ئەو کاتەی ئیمان دەهێنێت بە قەدەری خودا ) پاشان ابن عمر ئەو فەرموودەیەی کردە بەلْگە (ئیمان ئەوەیە باوەڕت ببێت بە خودا و مەلائیکەتەکانی و کتابەکانی و ڕۆژی دوایی ، و ئیمان بێنیت بە قەدەر بە خەیر و بە شەڕەوە )

144-عوبادە کوڕی صامت بە کوڕەکەی گوت : (کوڕی شیرینم، بە تەئکید تامی ئیمان ناچێژیت هەتا دەزانیت کە ئەوەی توشت بووە (جاهەرچی بێت )

---

143 مسلم (8) وأبو داود والترمذي

144 جيد .أبو داود (4700)

نەدەبو توشت نەبێت و نەیەت بەسەرتدا . ئەوەش کە توشت نەبووە و نەهاتووە بەسەرتدا . نەدەبوو توشت ببێت و بەسەرتدا بێت .

من خۆم لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گوێبیست بووم دەیفەرموو:(یەکەم شت کە خودا خەڵقی کرد، قەڵەم بوو . پێی فەرموو: بنوسە ، گوتی چی بنوسم ؟

**145**– وفي رواية لأحمد: (إن أول ما خلق الله تعالى القلم، فقال له: اكتب، فجرى في تلك الساعة بما هو كائن إلى يوم القيامة).

**146**– وفي رواية لابن وهب: قال رسول الله ﷺ: (فمن لم يؤمن بالقدر خيره وشره أحرقه الله بالنار).

**147**– وفي المسند والسنن عن ابن الديلمي قال: أتيت أبي بن كعب، فقلت: في نفسي شيء من القدر، فحدثني بشيء لعل الله يذهبه من قلبي، فقال: (لو أنفقت مثل أحد ذهباً ما قبله الله منك حتى تؤمن بالقدر، وتعلم أن ما اصابك لم يكن ليخطئك، وما أخطأك لم يكن ليصيبك، ولو مت على غير هذا لكنت من أهل النار). قال: فأتيت عبد الله بن مسعود، وحذيفة بن اليمان، وزيدبن ثابت، فكلهم حدثني بمثل ذلك عن النبي ﷺ. حديث صحيح رواه الحاكم في صحيحه.

فيه مسائل: الأولى: بيان فرض الإيمان بالقدر. الثانية: بيان كيفية الإيمان به.

---

خودا فەرموی : (مەقادیر و ڕێژەی هەمووشتێ بنوسە هەتا ئەوکاتەی کە قیامەت بەرپا دەبێت). کوڕی شیرینم : گوێم لەپێغەمبەری خودا بوو دەیفەرموو: ( هەرکەسێ لەسەر غەیری ( ئەم ئیمانە) بمرێت ، ئەوە لە من نیە .

145– [145] لەڕیوایەتەکەی ئەحمەدا دەڵێت: (یەکەم شتێ کە خودا خەڵقی کرد قەڵەم بوو خودا پێی فەرموو: بنوسە . هەر لەوکاتەدا قەڵەم دەستی کرد بەنوسین، هەرچی دەبێت و ڕوودەدات تا ڕۆژی قیامەت هەر هەمووی نوسی ).

146– [146] لەڕیوایەتی (**ابن وهب**) دا . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (هەرکەسێ ئیمان نەهێنێت بە قەدەر، بە خێر و شەڕیەوە، ئەوا خودا بە ئاگر دەیسوتێنێت )

---

145 صحيح أخرجه أحمد والطبراني في الكبير 12500

146 صحيح ابن أبي عاصم في السنة والآجري في الشريعة

147–ابن الديلمی[بشمتر] دەڵێت : ﴿چوم بۆلای ئوبەی کوڕی کەعب گوتم پێی شتێ لە دڵمدایە لەبارەی قەدەرەوە . جا شتێکم بۆ باس بکە ، بەڵکو خودا ئەوشتە لە دڵم دا نەهێڵێت ، ئەویش گوتی : ئەگەر بە قەدەر کێوی ئوحود زێڕ ببەخشیت ، ئەوا خودا لێت قبوڵ ناکات ، هەتا ئیمان دەهێنیت بە قەدەر ،

الثالثة: إحباط عمل من لم يؤمن به. الرابعة: الإخبار بأن أحداً لا يجد طعم الإيمان حتى يؤمن به.

الخامسة: ذكر أول ما خلق الله.

السادسة: أنه جرى بالمقادير في تلك الساعة إلى قيام الساعة.

السابعة: براءته ﷺ ممن لم يؤمن به. الثامنة: عادة السلف في إزالة الشبهة بسؤال العلماء.

التاسعة: أن العلماء أجابوه بما يزيل الشبهة، وذلك أنهم نسبوا الكلام إلى رسول اللهﷺ فقط.

---

و دڵنیا دەبیت کە هەرچیەك توشت بووە و هاتووە بەسەرتا نەدەبوو توشت نەبێت و نەیەت بەسەرتدا . ئەوەش توشت نەبوە و نەهاتوە بە سەرتدا . نەدەبوو توشت نەبێت و نەیەت بەسەرتدا . خۆ ئەگەر لەسەر غەیری ئەمە بمریت، ئەوا دڵنیابە، دەبیتە خاوەنی جەهەننەم.

(ابن الديلمي) گوتی: ڕۆیشتم بۆ لای (عبدالله بن مسعود) و ( حذیفة بن الیمان) و (زید بن الثابت) یش هەر هەموویان وەك ئەم حەدیسەیان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆم باس کرد﴾

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1– ڕوونکرنەوەی ئەوەی کە ئیمان هێنان بە قەدەر ، فەرزە .

2– ڕوونکرنەوەی چۆنیەتی ئیمان هێنان بەقەدەر .

(واتە : بەو جۆرە دەبێت کە عوبادە فێری کوڕەکەی خۆی کرد)

3– هەرکەس ئیمانی بە قەدەر نەبێت ، کردەوەکانی پوچ دەبنەوە .

---

147 صحيح لغيره أخرجه أحمد و أبو داود (4699)

(چونکە بەوە کافر دەبێت و کافریش کردەوەی چاکەی لێ وەرناگیرێت )

4- ڕاگەیاندنی ئەوەی کە هیچ کەس تامی ئیمان ناچێژێت هەتا ئیمان دەهێنێت بە قەدەر .

5- باسی یەکەم شتێ کە خودا دروستی کردوە (کە قەڵەمە ).

6- قەڵەم دەستی کرد بەنوسینی ڕێژەی هەرچی شتە لەو کاتەوە تا ڕۆژی قیامەت .

7- پێغەمبەر (ﷺ) خۆی بەری کردوە و حاشای لەو کەسە کردووە کە ئیمانی بەقەدەر نەبێت

8- سەلەف عادەتیان وابووە بۆ لابردنی گومان و دوودڵی و شوبهە سوئالیان لە زانایان کردوە .

9- زانایانیش بە شێوەیەك جوابیان داوەتەوە کە شوبهەیان لە دڵدا نەمێنێ، ئەوەش بەوەی کە تەنها فەرموودەی پێغەمبەریان گێڕاوەتەوە.

<u>ڕوونکردنەوە :</u>

قەدەر چوار مەرتەبەی هەیە ، دەبێت ئیماندار باوەڕی بە هەر چوارەکە ببێت .

یەکەم : (العلم ) واتە زانستی خودای گەورە ، واتە ئیمانی بەوە ببێت کە هەرچی بووە و هەرچی دەبێت خودا زانیویەتی و دەیزانێت .

دووەم: (الكتابة) نووسین ، وەك ئەوەی لە فەرمودەکەدا باس کراوە.

سێیەم : (المشيئة) واتە : هەرچی بووە و هەرچی دەبێت ، بەویستی خودا بووە و بە ویستی ئەو دەبێت .

چوارەم : (الخلق) واتە : هەرچی شتە و هەرچی کردەوەیە خودا هەر خۆی دروستیان دەکات دەیانهێنێتە بوون .

## 60- باب ما جاء في المصورين

148- عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: [قال الله تعالى: وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا حَبَّةً أَوْ شَعِيرَةً ] أخرجاه.

149- ولهما عن عائشة رضي الله عنها، أن رسول الله ﷺ قال:( أَشَدُّ النَّاسِ عَذَابًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ بِخَلْقِ اللَّهِ )

150- ولهما عن ابن عباس رضي الله عنهما: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ « كُلُّ مُصَوِّرٍ فِى النَّارِ يَجْعَلُ لَهُ بِكُلِّ صُورَةٍ صَوَّرَهَا نَفْس يعذب بها فِى جَهَنَّمَ »

151- ولهما عنه مرفوعاً: (من صوّر صورة في الدنيا كلّف أن ينفخ فيها الروح، وليس بنافخ).

152- ولمسلم عن أبي الهياج قال: قال لي عليّ: (ألا أبعثك على ما بعثني عليه رسول الله ﷺ ؟ ألا تدع صورة إلا طمستها، وَلاَ قَبْرًا مُشْرِفًا إِلاَّ سَوَّيْتَهُ).

---

### بابی 60

## لە بارەی وێنەکێشانەوە

148-[148] (أبو هريرة ) رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : خودای بەرزو بڵند فەرمووی :﴿ کێ هەیە لەو کەسە زاڵمتر بێت ، وێنەیەك دروست دەکات بە نیازی ئەوەی لاسایی ئەو وێنەیە بکاتەوە کە من دروستم کردووە ، دەی

---

148 البخاري (5953) وسلم (2111)

(ئەگەر ڕاست دەکەن ) با زەڕەیەك (واتە مێرووویەکی بچوك) دروست بکەن، یا دەنکە گەنمێ دروست بکەن . یا دەنکە جۆیەك دروست بکەن﴾

149- عائیشه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (سەختترین سزا لەناو خەڵکانی( وێنە کێشدا)، لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ئەو کەسانەن کە لاسایی خودا دەکەنەوە ، لەوەدا کە وێنە بۆ مەخلوقاتی خودا دەکێشن )

150- ابن عباس رضي الله عنه دەڵێت : گوێبیستی پێغەمبەر بووم ﷺ دەیفەرموو ( هەموو وێنەکێشێك لە ئاگردایە ، بە هەر وێنەیەك کە کێشاویەتی، ڕۆح لەبەرێکی بۆ دادەنرێت ، لە جەهەنەمدا پێی سزا دەدرێت ).

151- دیسانەوە ابن عباس دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (هەر کەسێك وێنەیەك بکێشێت لە دونیادا ، ئەوا لە قیامەتدا داوای لێدەکرێت کە ڕۆحی بە بەردا بکات ، ناشتوانێت ڕۆحی بە بەردا بکات ).

152- موسلیم دەگێڕێتەوە کە ئەبوهەیاج گوتی: ئیمامی عەلی ، پێمی گوت ( بزانە ڕەوانەت دەکەم بۆ کارێکی گرنگ ، کە پێغەمبەریش بۆ هەمان کار ڕەوانەی کردووم ، ئەویش ئەمەیە کە لێ نەگەڕێم هیچ وێنەیەك بمێنێت ئیلا دەبێت بیسڕمەوە یا تێکی بدەم ، هیچ قەبرێکی بەرزیش نەمێنێت ئیلا دەبێت تەختی بکەم ) .

---

149 البخاري (5954) ومسلم (2107)

150 البخاري (2225) ومسلم (2110

151 البخاري (5963) ومسلم (2110)

152 مسلم (969)

فيه مسائل:

الأولى: التغليظ الشديد في المصورين.

الثانية: التنبيه على العلة، وهو ترك الأدب مع الله لقوله: (ومن أظلم ممن ذهب يخلق كخلقي).

الثالثة: التنبيه على قدرته وعجزهم، لقوله: (فليخلقوا ذرة أو شعيرة).

الرابعة: التصريح بأنهم أشد الناس عذاباً.

الخامسة: أن الله يخلق بعدد كل صورة نفساً يعذب بها المصور في جهنم.

السادسة: أنه يكلف أن ينفخ فيها الروح.

السابعة: الأمر بطمسها إذا وجدت.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- ڕەقی نواندنێکی زۆر (لە حەرام کردندا)، لە بەرانبەر وێنە کێشان و پەیکەرسازاندا

2- ئاگادار کردنەوە لە سەبەبی ئەو حوکمە، ئەویش بێ ئەدەبی کردنە بەرانبەر خودا، بەپێی ئەوەی کە فەرمووی :﴿کێ هەیە لەو کەسە ستەمکارتر بێت کە وێنەیەك دروست دەکات بە نیازی ئەوەی وەك دروستکراوەکانی من دروست بکات﴾

3- ئاگادار کردنەوە ، لە توانایی خودا ، و بێ توانایی خەڵکی . بەپێی ئەوەی کە فەرموی : (دەی با مێرووڵەیەك ، یا دەنکە گەنمێك ، یا جۆیەك ) خەڵق بکەن.

4- ڕاگەیاندنی ئەوەی : کە ئەوانە توندترین سزایان هەیە (لە قیامەتدا) .

5- (سزاکەی بەم جۆرەیە ) خودا بەقەد ژمارەی هەمو وێنەکان زیندەوەر دروست دەکات کە بەو زیندەوەرانە عەزابی وێنەکێش یا پەیکەر تاشەکە دەدات لە جەهەنەمدا .

6- (سزایەکی دیکەشی ئەوەیە) ئەو وێنە کێشە تەکلیفی لێدەکرێت کە ڕۆح بکات بە بەر وێنەکەدا .

7- فەرمان دراوە بەسڕینەوەی ئەو وێنەو پەیکەرانە، لەهەر شوێنێکدا بەدی کران .

### 61- باب ما جاء في كثرة الحلف

وقول الله تعالى: ﴿وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ﴾ [ المائدة : 89 ].

153- عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: (الحلف منفقة للسلعة، ممحقة للكسب) أخرجاه.

---

بابی 61

## باسی سوێند خواردنی زۆر بەخودا

﴿ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ ﴾واتە :(سوێندەکانتان بپارێزن )

واتە: (خۆتان بپارێزن لە سوێند خواردن . و سوێند خواردن مەکەن بەعادەت و سوێندی زۆر مەخۆن . چونکە ئەو کارە سوێند خۆرەکە وا لێدەکات سوێندەکانی خۆی بشکێنێت یان بە سوکی بزانێت ، و جورئەتی ئەوە بکات زوو زوو سوێند بخوات و سوکایەتی بە ناوەکانی خودا بکات و هەیبەتی لەدڵیدا نەمێنێت و گوێ ناداتێ کە لەسەر شتێکی هیچ و پوچ هەزار سوێندی لە سەر بخوات، و ئیحترام بۆ پەروەردگاری دانەنێت ، بەمەش تەوحیدەکەی کەم دەکات).

153–سملهتر أبــوهريرة رضي الله عنه دەڵێــت : گــوێم لــە پێغەمبــەری خــودا بــوو (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرمووو :﴿سوێند خواردن، لە کڕین و فرۆشتن دا، پاڵ دەنێت بە شمەکەوە، کەسابەت و دەستکەوتەکەش تیا دەبات (واتە: بەرەکەتی ناهێڵێت)﴾

**154**– عن سلمان رضي الله عنه أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال:

(ثلاثة لا يكلمهم الله ولا يزكيهم ولهم عذاب أليم: أشيمط زان، وعائل مستكبر، ورجل جعل الله بضاعته، لا يشتري إلا بيمينه، ولا يبيع إلا بيمينه) رواه الطبراني بسند صحيح.

**155**– وفي الصحيح عن عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ

[ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ قَالَ عِمْرَانُ فَلَا أَدْرِي أَذَكَرَ بَعْدَ قَرْنِهِ قَرْنَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا ثُمَّ إِنَّ بَعْدَكُمْ قَوْمًا يَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ وَيَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُونَ وَيَنْذُرُونَ وَلَا يَفُونَ وَيَظْهَرُ فِيهِمْ السِّمَنُ ]

**156**– وفيه عن ابن مسعود رضي الله عنه أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (خير الناس قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم، ثم يجيء قوم تسبق شهادة أحدهم يمينه، ويمينه شهادته).

**157**– قال إبراهيم: كانوا يضربوننا على الشهادة والعهد ونحن صغار..

---

154–شملهتر سەلمانی فارسی رضي الله عنه دەڵێت : پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ( سێ کەس، خودای گەورە قصەیان لەگەڵ ناکات لە ڕۆژی قیامەت دا ، و پاکیان ناکاتەوە (لە گوناهەکانیان) و عەزابێکی بە سوێیان هەیە : سەر سپی زیناکەر، و

---

**153** البخاري (2087) ومسلم (1606)

**154** جيد .أخرجه الطبراني في الكبير (6000) والصغير (821)

هەژاری خۆبەزلزان ، پیاوێکیش (سوێند خواردن ) بە خودای کردەوە بە شمەکەکەی ، هیچ نافرۆشێت ئیلا سوێندێکی لە گەڵدا دەخوات )

155– [155] عیمران کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ﴿ باشترین ئومەتەکەم ئەمانەی سەردەمی خۆمن . پاشان ئەوانی دوای ئەمان . پاشان ئەوانی دوای ئەوان – عمران گوتی نازانم دوای خۆی، دوو سەردەمی دیکەی باس کرد یان سیان – پاشان دوای ئێوە قەومێك پەیدا دەبن کە:

1– شاهیدی دەدەن، لە گەڵ ئەوەشدا داوای شاهیدیان لێنەکراوەو (ئاگاداری مەسەلەکەش نین)

2– خیانەت دەکەن و ئامانەت ناپارێزن .

3– نەزر دەکەن و نەزرەکەیان بەجێ ناهێنن .

4– قەڵەویش لە ناویاندا بڵاو دەبێتەوە

(واتە: هەموو ئاواتیان شەهوەت و ورگ و خواردنەوەیە ، ئەوەندەش تیایدا ڕۆدەچن هەتا قەڵەو دەبن ﴾.

156– [156] ابن مسعود دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : (باشترینی خەڵکی ئەوانەی سەردەمی خۆمن . پاشان ئەوانی دوای ئەمان . پاشان ئەوانی دوای ئەوان . پاشان قەومێك پەیدا دەبن . شاهیدی یەکێکیان پێش ئەوە دەکەوێت کە سوێند بخوات، وە یان سوێند خواردنەکەی پێش شاهیدیەکەی دەکەوێت) تەواو (واتە : ئەوەندە پەلە دەکات لە سوێند خواردندا، بەلایەوە گرنگ نیە بە هەر جۆرێك سوێند بخوات ).

---

155 البخاري (2651) ومسلم (2535)

156 البخاري (2652) ومسلم (2533)

157-[بی‌لهتر] ( **إبراهيم النخعي** ) كە تابیعی تابیعییە دەڵێت :﴿( عادەت و بەرنامەی سەلەف وا بوو) لێمانیان دەدا لە سەر شاهیدی دان و پەیمان دان، لە كاتێكدا كە ئێمە منداڵ بووین ).

**فيه مسائل:** الأولى: الوصية بحفظ الأيمان.

الثانية: الإخبار بأن الحلف منفقة للسلعة، ممحقة للبركة

الثالثة: الوعيد الشديد فيمن لا يبيع ولا يشتري إلا بيمينه.

الرابعة: التنبيه على أن الذنب يعظم مع قلة الداعي.

الخامسة: ذم الذين يحلفون ولا يستحلفون.

السادسة: ثناؤه ﷺ على القرون الثلاثة، أو الأربعة، وذكر ما يحدث بعدهم.

السابعة: ذم الذين يشهدون ولا يستشهدون.

الثامنة: كون السلف يضربون الصغار على الشهادة والعهد.

---

## مەسەلەكانی ئەم باسە

1- ئامۆژگاری كردن بە پاراستنی سوێند خواردن .

---

157 أثر صحيح البخاري (2652) ومسلم (2533)

2-خەبەردان بەوەی  كە سوێند خواردن (جا سوێندەكە درۆ بێت یا ڕاست). ڕەواج دەدات بە شمەك و بەرەكەت ناهێڵێت .
3- هەڕەشەی توند لەو كەسەی كە هیچ ناكڕێت و نافرۆشێت ئیلا سوێندی لە گەڵ دەخوات .
4- ئاگادار بوون لەوەی كە گوناه سزاكەی گەورە دەبێت، ئەگەر هاندەر و پاڵنەری كەم بێت
5- زەمی ئەوانەی كە سوێند دەخۆن، لەگەڵ ئەوەشدا داوای سوێندخواردنیان لێنەكراوە .
6- ستایشی پێغەمبەر ﷺ لەسەر سێ سەردەمەكە ، یان چوارسەردەمەكە . باسی ئەوەشی كرد كە چی ڕوودەدات .
7- زەمی ئەوانەی كە شاهیدی  دەدەن لە كاتێكدا داوای شاهیدیان لێنەكراوە یان ئاگاداری شتێك نین و شاهیدی تێدا دەدەن .
8- سەلەف لەسەر ئەوە بوون كە لە منداڵەكانیان بدەن . لە سەر شاهیدی دان و پەیمان بەستن (ئەمەش بۆ تەمێ كردنیان كە نابێت شاهێدی بدەن. مەگەر لە شتێكدا كە یەقینیان هەبێت ، ناشبێت پەیمانێك بدەن كە نەتوانن بیبەنە سەر .ئەمەش بۆ ئەوەی نەبێتە عادەتیان كە گەورەش بوون بۆیان تەرك نەكرێت )

## 62- باب ما جاء في ذمة الله وذمة نبيه

وقول الله تعالى: ﴿ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلْأَيْمَٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا ﴾

**158**- عن بريدة رضي الله عنه قَالَ [ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ إِذَا أَمَّرَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ أَوْ سَرِيَّةٍ أَوْصَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ وَمَنْ مَعَهُ مِنْ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا ثُمَّ قَالَ اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ اغْزُوا وَلَا تَغُلُّوا وَلَا تَغْدِرُوا وَلَا تَمْثُلُوا ، وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا

---

بابی 62

## لە بارەی پەیمانی خودا و پەیمانی پێغەمبەرەكەی

﴿ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا ﴾ ﴿النحل 91﴾

واتە :( وە بەرانبەر پەیمانی خودا بە وەفا بن . کاتیٚ کە پەیمان دەدەن بە یەکتر . وە پەیمان شکیٚنی مەکەن دوای ئەوەی کە ئەو پەیمانەتان بەناوی خوداوە پتەو کرد، وە بە تەئکید خوداتان کردووە بە کەفیل بە سەر خۆتانەوە (واتە : بە چاودێرو بە شاهید) . بە تەئکید هەر چییەك بکەن خودا دەیزانێت )

158- بورِیدە گوتی :﴿پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوننەتی وا بوو کاتیٚ کە ئەمیرێکی دادەنا بۆ سوپایەك، یا سریەیەك ،. ئامۆژگاری دەکرد بەمانە :

1. لە خۆیدا تەقوا و لە خوداترسان بەدی بهێنێت

2. لە گەڵ ئەو سەربازە موسڵمانانەشدا کە لە گەڵیدان چاکە بکات . پاشان دەیفەرموو

3.موجاهیدەکان غەزا بکەن بە پشتیوانی ناوی خودا،

4. لە ڕێگا ولە پێناوی خودا دا (بەتەنها) ،

5. بجەنگێن دژی هەرکەسێك، کافر بووە بەخودا،

6. غەزابکەن و ماڵی غەنیمەت پێش دابەش کردن مەخەنە لاوە بۆ خۆتان . غەدر (واتە پەیمان شکێنی) مەکەن . لاشەی کوژراوەکان مەشێوێنن، مناڵ مەکوژن .

وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلَاثِ خِصَالٍ أَوْ خِلَالٍ فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ فَلَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ فَإِنْ أَبَوْا أَنْ يَتَحَوَّلُوا مِنْهَا فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ يَجْرِي عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللَّهِ الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَكُونُ لَهُمْ فِي الْغَنِيمَةِ وَالْفَيْءِ شَيْءٌ إِلَّا أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ

فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَسَلْهُمْ الْجِزْيَةَ فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَقَاتِلْهُمْ وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ اللَّهِ وَذِمَّةَ نَبِيِّهِ فَلَا تَجْعَلْ

---

158 مسلم (1731) وأبو داود والترمذي

لَهُمْ ذِمَّةَ اللَّهِ وَلَا ذِمَّةَ نَبِيِّهِ وَلَكِنْ اجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّتَكَ وَذِمَّةَ أَصْحَابِكَ فَإِنَّكُمْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَمَكُمْ وَذِمَمَ أَصْحَابِكُمْ أَهْوَنُ مِنْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اللَّهِ وَذِمَّةَ رَسُولِهِ

وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ فَلَا تُنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ وَلَكِنْ أَنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِكَ فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي أَتُصِيبُ حُكْمَ اللَّهِ فِيهِمْ أَمْ لَا ]

---

7. کاتێ ڕوبەڕوی دوژمن بویتەوە ئەوانەی کە موشریکن ئەوا بانگیان بکە بۆ یەکێ لەم سێ شتە جا ئەگەر هەرکامیان پێ قبولْ بوو، تۆش لێیان قبولْ بکەو لێیان بگەڕێ

یەکەم : بانگیان بکە بۆ موسولْمان بون، جا ئەگەر قبولْیان کرد تۆش لێیان قبولْ بکە . پاشان بانگیان بکە بۆئەوەی لەشارو ولاْتی خۆیانەوە – واتە لە ولاْتی کوفرەوە – کۆچ بکەن بۆشار و ولاْتی موهاجیران . پێیان ڕابگەیەنە : ئەگەر ئەوەیان کرد، موهاجیرین چ حەقێکیان هەبێت ئەوانیش هەمان حەقیان هەیە . وەك ئەوانیش ئەرکیان دەکەوێتە سەر. جا ئەگەر نەیانویست و ولاْتی خۆیان بەجێ نەهێشت ، ئەوا خەبەریان پێ بدە کە وەك دەشتەکیە موسلْمانەکان حسابیان لە گەلْدا دەکرێت وحوکمی خودایان بە سەردا جێ بەجێ دەکرێت، لە دەستکەوت و غەنیمەتەکاندا هیچیان بەر ناکەوێت، مەگەر کاتێ کە لەگەلْ موسولْمانەکاندا بەشداری جەنگ بکەن .

دووەم : ئەگەر ئەوانەشیان قبولْ نەکرد، ئەوە داوای جزیەو سەرانەیان لێ بکە . خۆ ئەگەر بەمە ڕازی بون لێیان قبولْ بکە و لێیان بگەڕێ .

سێیەم : جائەگەر بەوەش ڕازی نەبون، ئەوا داوای کۆمەکی لەخودا بکە و لە دژیان بجەنگێ، ئەگەر خەلْکی قەلاْیەکت گەمارۆدا . داوایان لێت کرد کە پەیمانی خودا و پەیمانی پێغەمبەریان پێبدەیت، ( واتە سوێندیان بۆ بخۆیت وپەیمانیان بدەیتێ کە خۆیان و مالْیان سەلامەت دەبێت ) ئەوا پەیمانی خودا و پەیمانی پێغەمبەریان پێ نەدەیت .

بەڵکو پەیمانی خۆتو پەیمانی هاوەڵەکانت بدە پێیان , چونکە ئەگەر هاتو ( کەسانی نەفام و بیٚ ئاگا ) پەیمانی خۆت و هاوەڵەکانت بشکێنن ، تاوانەکەی سوکترە لەوەی پەیمانی خودا و پەیمانی پێغەمبەرەکەی بشکێنن

خۆ ئەگەر خەڵکی قەڵایەکت گەمارۆدا ،و داوایان کرد لێت کە دایان بەزێنیت لە قەڵاکە بەشەرتیٚ کە حوکمی خودا بەسەریاندا جێبەجیٚ بکەیت، ئەوا دایان مەبەزێنە ( لە سەر ئەوە) ، چونکە تۆ نازانیت ئایا حوکمی خودا لەو بارەوە دەپێکیت یان نا﴾ تەواو

***ڕوونکردنەوە*** :

ابن جبرين دەڵێت: ﴿حاکم بۆی نیە لە قەزیەیەکدا بڵێت بە تەئکید ئەمە حوکمی الله یە، هەروەك زۆر لە قازیەکان و هاوشێوەکانیان، ئەگەر لە بەینی دوو کەسدا حوکم بدەن ئەوا دەڵێن ئەمە حوکمی خودایەو ئەمە شەرعی خودایە . بەڵکو واجبە بڵێن عیلمی من هەتا ئێرە بڕ دەکات . ئەما ئەگەر بڵێم ئەمە وەحیەو لەلایەن خوداوە دابەزیوە، ئەوا لەوبارەیەوە بەڵگەی یەکلا کەرەوەم بەدەستەوە نیە، و لەو بارەیەوە هیچ ناڵێم والله أعلم﴾ .

فيه مسائل:

الأولى: الفرق بين ذمة الله وذمة نبيه، وذمة المسلمين.

الثانية: الإرشاد إلى أقل الأمرين خطراً.

الثالثة: قوله: (اغزوا بسم الله في سبيل الله).

الرابعة: قوله: (قاتلوا من كفر بالله).

الخامسة: قوله: (استعن بالله وقاتلهم).

السادسة: الفرق بين حكم الله وحكم العلماء.

السابعة: في كون الصحابي يحكم عند الحاجة بحكم لا يدري أيوافق حكم الله أم لا.

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- فەرق هەیە لەنێوان پەیمانی خوداوپێغەمبەرەکەی لەگەڵ پەیمانی موسوڵمانان .

2- ڕێنیشانی بە هەڵبژاردنی کارێك کە مەترسی کە متربێت لە کارێکی دیکە .

3- فەرمودەکەی (غەزابکەن بەناوی خوداوە و لەڕێگای خودادا ). واتە تەنها لە ڕێگای خودادا .

4- فەرمودەکەی (بجەنگێن دژی هەرکەسێ کافر بێت بە خودا )

5- فەرمودەکەی (داوای کۆمەکی لە خودا بکەو لە دژیان بجەنگێ )

6-جیاوازی هەیە لەنێوان حوکمی خوداو حوکمی زانایاندا .

7- ( ئەو جیاوازیەش لەوەدا دەر دەکەوێت) کە ئەصحابە لە کاتی پێویستدا حوکم دەدات . نازانێت حوکمەی ڕێك لەگەڵ حوکمی خودادا یەك دەگرنەوە یان نا.

**63**- باب ما جاء في الإقسام على الله

**159**- عن جندب بن عبد الله رضي الله قال: قال رسول الله ﷺ: (قال رجل: والله لا يغفر الله لفلان، فقال الله عز وجل: من ذا الذي يتألى عليّ أن لا اغفر لفلان؟ إني قد غفرت له وأحبطت عملك) رواه مسلم.

**160**- وفي حديث أبي هريرة أن القائل رجل عابد، قال أبو هريرة: تكلم بكلمة أو بقت دنياه وآخرته.

---

### بابی 63

# باسی سوێند خواردن لەسەر خودا

159-[159] جوندوب کوڕی عبداللە ﷺ دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی :

(پیاوێك لە نەوەکانی ئیسرائیل گوتی: واللە، خودا لە فلاّن خۆش نابێت .

خوداش فەرموی: ئەوە کێیە (خۆی کردووە بە گەورە بە سەر منەوە ) سوێند دەخوات ، کە لە فلاّن خۆش نابم . ئەوا من لێی خۆش بووم ، کردەوەکەی تۆشم پوچەڵ کردەوە ) (کە ئەمر کردن بە چاکە و نەهی کردنە لە خراپە) .

160- [160] لە حەدیسەکەی **أبوهريرة** دا هاتوە کە :(ئەوەی قصەکەی کرد پیاوێکی خوداپەرست بووە )

**أبوهريرة** دەڵێت :( گوتەیەکی لە دەم هاتەدەر دونیا و قیامەتی لە دەست خۆی دا )

***ڕوونکردنەوە*** : ئەو پیاوە خۆی بە گەورەو بەڕێز زانیوە ، مەعنای وتەکەشی ئەوەیە کە نابێت خودا لێی خۆش بێت . ئەمەش بیّ ئەدەبیە بەرانبەر خودا .

**فيه مسائل:**

**الأولى:** التحذير من التألي على الله.

**الثانية:** كون النار أقرب إلى أحدنا من شراك نعله.

**الثالثة:** أن الجنة مثل ذلك.

**الرابعة:** فيه شاهد لقوله (إن الرجل ليتكلم بالكلمة) الخ..

**الخامسة:** أن الرجل قد يغفر له بسبب هو من أكره الأمور إليه.

---

**159** مسلم (2621)

**160** صحيح . أخرجه أبو داود (4901) وأحمد، صححه الألباني

## مەسەلەكانی ئەم باسە

1- وریاكردنەوە لە سوێند خواردن لە سەر خودا.

2- ئاگری جەهەننەم لە هەر كام لە ئێمەوە نزیكترە لە پەتی نەعلەكانمان .

3- بەهەشتیش بە هەمان جۆرە .

4- ئەم حەدیسە شاهیدە بۆ ئەو حەدیسەی دیكە كە دەفەرموێ :(وا دەبێ پیاوێك كەلیمەیەك دێت بە دەمیدا، كە خودا پێی تورە دەبێت ، ئەو پیاوە نازانێت مەعنای قصەكەی بەرەو كوێ دەڕوات، بەهۆی ئەو كەلیمەوە ئەوەندە و ئەوەندە فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە ) .

5- خودا هەندێ جار ، لە عەبدەكەی خۆش دەبێت بە هۆی كارێكەوە ، كە عەبدەكە كارەكەی پێخۆش نیە .

**64**- باب لا يستشفع بالله على خلقه

**161**- عن جبير بن مطعم رضي الله عنه قال: جاء أعرابي إلى النبي ﷺ فقال: يا رسول الله: نهكت الأنفس، وجاع العيال، وهلكت الأموال، فاستسق لنا ربك، فإنا نستشفع بالله عليك وبك على الله، فقال النبي ﷺ: (سبحان الله! سبحان الله!) فما زال يسبح حتى عرف ذلك في وجوه أصحابه؛ ثم قال النبي ﷺ: (ويحك، أتدري ما الله؟ إن شأن الله أعظم من ذلك، إنه لا يستشفع بالله على أحد من خلقه) وذكر الحديث. رواه أبو داود.

بابی 64

## نابێت ناوی خودا بکرێت بە واصیتە و تکاکار لای دروستکراوەکانی

161- جوبەیر کوڕی موتعیم رضي الله عنه گوتی:( دەشتەکیەك هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ، گیان لەبەرەکان لاواز بوون ، ماڵومناڵ کەوتنە برسێتیەوە ، سەروەت و سامانمان تیا چوو ، جا داوای بارانمان بۆبکە لای پەروەردگارت ( ئێمە خودا دەکەینە شەفاعەت کار لای تۆ ( کە داوای باران باینمان بۆ بکەیت) ، تۆش دەکەین بە شەفاعەت کار لای خودا . پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموی :( سُبحان الله ، سُبحان الله، هەر سوبحانە لّلای دەکرد، هەتا ئەم ناڕەحەت بون و هەڵوێستەی پێغەمبەر (ﷺ)، لەڕوخساری هاوەڵەکانیدا بەدی کرا و ڕەنگی دایەوە . پاشان فەرمووی: هاوار بەحاڵت ، ئایا دەزانیت ألله کێیە ؟ کاری خودا زۆر لەوە مەزنترە ، بە تەئکید خودا ناکرێت بە شەفاعەت کار و تکاکار لای هیچ کەس ) .

فيه مسائل:

الأولى: إنكاره على من قال: نستشفع بالله عليك.

الثانية: تغيره تغيراً عرف في وجوه أصحابه من هذه الكلمة.

الثالثة: أنه لم ينكر عليه قوله: (نستشفع بك على الله).

---

161 ضعيف أخرجه أبو داود (4756) والطبراني في الكبير ، وهو في ضعيف الجامع6278

الرابعة: التنبيه على تفسير (سبحان الله).

الخامسة: أن المسلمين يسألونه الاستسقاء

---

## مەسەلەكانی ئەم باسە

1–پێغەمبەر (ﷺ) وتەکەی ئەو پیاوەی بە خراپ دانا ، کە گوتی: ( ئێمە خودا دەکەین بە شەفاعتکار و تکاکار لای تۆ )

2– گۆڕانکاری لە ڕوخساریدا ڕوویدا ، بە جۆرێك کە لە ڕوخساری هاوەڵەکانیدا ڕەنگی دایەوە ، بە هۆی ئەو کەلیمەیەوە .

3–ئەوەی پێناخۆش نەبو کە گوتی: ( تۆ دەکەین بە شەفاعەت کار لای خودا ). (کە داوای باران بارینمان بۆ بکەیت)

4–ئاگادار بوون لە تەفسیری ( سُبحان الله ) .

5– موسوڵمانان، داوایان لە پێغەمبەر دەکرد ﷺ کە دوعای باران بارینیان بۆبکات .

**65**– باب ما جاء في حماية النبي ﷺ حمى التوحيد، وسده طرق الشرك

**162**- عن عبد الله بن الشخير رضي الله عنه، قال: انطلقت في وفد بني عامر إلى النبي ﷺ فقلنا: أنت سيدنا، فقال: (السيد الله تبارك وتعالى). قلنا: وأفضلنا فضلاً، وأعظمنا طولاً؛ فقال: (قولوا بقولكم، أو بعض قولكم، ولا يستجرينكم الشيطان) رواه أبو داود بسند جيد.

**163**- وعن أنس رضي الله عنه ، أن ناساً قالوا: يا رسول الله: يا خيرنا وابن خيرنا، وسيدنا وابن سيدنا، فقال:

---

بابی65

## باسی پێغەمبەر (ﷺ) سنورەکانی تەوحیدی پاراستوەو دەرگا و ڕێگاکانی شیرکی داخستوه

162- [162] **عبدالله بن الشخير** رضي الله عنه **دەڵێت : لەگەڵ نوێنەری بەنی عامر دا ، ڕۆشتین بۆلای پێغەمبەری خودا (ﷺ) . گوتمان : تۆ گەورە و سەیدی ئێمەیت ، ئەویش فەرموی : (السيد) خودایە تبارك و تعالی ، گوتمان : لە هەمومان ئەوپەڕی چاکتری ، لە هەمومان گەورەتریت و بەخشندەتریت ، ئەویش فەرموی : وتەکانی پێشووترتان بڵێن یا هەندێك وتەی دیکەتان بڵێن ( واتە : بڵێن بەندەو پێغەمبەری خودا ، با شەیتان نەتانکات بەنامەبەری خۆی (یان با کێشتان نەکات بەرەو زیادە ڕەوی ) تەواو.**

163- [163] **ئەنەس** رضي الله عنه **دەڵێت : خەڵکانێك گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئەی لەهەموومان باشتر، کوڕی باشترمان و سەید و گەورەمان کوڕی سەید و گەورەمان، ئەویش فەرموی : ئەی خەڵکینە ، قصەکانی لەوەو بەرتان بڵێن ، ڕێگەمەدەن شەیتان پلە بە پلە گومڕاتان بکات . من محمدم ، عەبدی خودا و پێغەمبەری ئەوم ، پێم خۆش نییە لە پلەی خۆم زیاتر بەرزم بکەنەوە، ئەو پلەیەی کە خودا بۆمی داناوە ( واتە: عەبدایەتی و پێغەمبەرایەتی) .**

---

162 جيد . أخرجه أبو داود (4856) وأحمد والنسائي

163 جيد . أخرجه النسائي في الكبرى (10077) وأحمد

(يا أيها الناس، قولوا بقولكم، أو بعض قولكم، ولا يستهوينكم الشيطان، أنا محمد، عبد الله ورسوله، ما أحب أن ترفعوني فوق منزلتي التي أنزلني الله عز وجل). رواه النسائي بسند جيد.

**فيه مسائل:**

الأولى: تحذير الناس من الغلو.

الثانية: ما ينبغي أن يقول من قيل له: أنت سيدنا.

الثالثة: قوله: (ولا يستجرينكم الشيطان) مع أنهم لم يقولوا إلا الحق.

الرابعة: قوله: (ما أحب أن ترفعوني فوق منزلتي).

---

## مەسەلەکانی ئەم باسە

**1- وریا کردنەوەی خەڵکی لەوەی کەنابێت لە وەصف و سەنادا زیادە ڕەوی بکرێت .**

**2- هەر کەسێ پێی گوترا : (تۆ گەورەو سەیدی ئێمەی ) دەبێت چۆن جواب بداتەوە .**

**3- فەرمودەی (شەیتان نەتانکات بەنامەبەری خۆی) ، لەگەڵ ئەوەشدا هەرچیان گوتبوو، هەمووی هەق بوو .**

**4- فەرمودەکەی:( پێم خۆش نیە لەو پلەیە زیاتر بەرزم بکەنەوە کە خودا بۆمی داناوە ) واتە (پلەی عەبدایەتی و پێغەمبەرایەتی )**

**ڕوونکردنەوە: ( خاوەنی فتح المجيد ئیشارەتی بەوە داوە، کە دروست نییە ڕوو بە ڕوو بە یەکێ بگوترێ (سەید) بەڵام ئەگەر خۆی لەوێ نەبوو، ئەوە دروستە ) صالح الفوزان**

**66– باب ما جاء في قول الله تعالى: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾**

**164– عن ابن مسعود رضي الله عنه قَالَ :{ جَاءَ حَبْرٌ مِنَ الأَحْبَارِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ : يَا مُحَمَّدُ ، إِنَّا نَجِدُ أَنَّ اللَّهَ يَجْعَلُ السَّمَاوَاتِ عَلَى أُصْبَعٍ ، وَالأَرَضِينَ عَلَى أُصْبَعٍ ، وَالشَّجَرَ عَلَى أُصْبَعٍ ، وَالْمَاءَ وَالثَّرَى عَلَى أُصْبَعٍ ، وَسَائِرَ الْخَلْقِ عَلَى أُصْبَعٍ ، فَيَقُولُ : أَنَا الْمَلِكُ ، فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ تَصْدِيقًا لِقَوْلِ الْحَبْرِ ، ثُمَّ قَرَأَ : وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ القيامة}**

---

## بابی 66 تەفسیری ئەو ئایەتە

﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴿٦٧﴾ ﴾ **(الزمر)**

**واتە : ﴿ئەو موشریکانە خودایان بە گەورە نەزانیوە، ئەوەندەی کە شایستەی گەورەیی و عەزەمەتی ئەوبێت ، زەمینیش هەمووی لە مشتی ئەودایە ، لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەکانیش پێچراوەن لە دەستی ڕاستیدا . خودا پاکە ومەزنە و دوورە لەوەی کە شەریکی بۆ دابنرێت﴾**

**164 –ابـن مسـعود ﷺ گـوتی:( زانایـەکی جولەکـە هـات بـۆلای پێغەمبـەر (ﷺ) گـوتی: ئـەی محمـد لای ئێمـە لـە تەوڕاتـدا ئـەوە هەیـە کـە (کـە خـودا ئاسمانەکان لەسەر پەنجەیەك دادەنێت ، و زەمینـەکان لەسـەر پەنجەیـەك ، دارو درەخـت لـە سـەر پەنجەیـەك ، ئـاو لەسـەر پەنجەیـەك ، ئینجا دەڵێـت: تـەنها خـۆم مەلیکم )**

**پێغەمبەریش (ﷺ) لێرەدا دەستی کرد بەپێکەنین هەتا خرێکانی دەرکەوتن . ئەمەش بۆ سەلماندنی وتەی زانا جولەکەکە و بەڕاست زانینیی، پاشان ئەو ئایەتەی خۆندەوە { وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ } متفق علیه**

---

**164** البخاري فی التفسیر(4811) ومسلم (2787)

وفي رواية لمسلم: والجبال والشجر على إصبع، ثم يهزهن فيقول: أنا الملك، أنا الله. وفي رواية للبخاري: يجعل السماوات على إصبع، والماء والثرى على إصبع، وسائر الخلق على إصبع) أخرجاه

**165**- ولمسلم عن ابن عمر مرفوعاً: [ يَطْوِي اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ السَّمَاوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى ثُمَّ يَقُولُ أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ الْجَبَّارُونَ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ ثُمَّ يَطْوِي الْأَرَضِينَ بِشِمَالِهِ ثُمَّ يَقُولُ أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ الْجَبَّارُونَ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ ]

**166**- وروي عن ابن عباس، قال:

((مَا السَّمَواتُ السَّبْعُ فِي كَفِّ الرَّحمن إلاَّ كَخَرْدَلَة فِي يَدِ أَحَدِكُمْ))

**167**- وقال ابن جرير: حدثني يونس، أنبأنا ابن وهب، قال: قال ابن زيد: حدثني أبي، قال: قال رسول الله ﷺ: (مَا السَّمَاوَات السَّبْع فِي الْكُرْسِيّ إلَّا كَدَرَاهِم سَبْعَة أُلْقِيَتْ فِي تُرْس)

---

لە ڕیوایەتەکەی مسلیم دا :(شاخەکان و دار و درەختەکان لەسەر پەنجەیەك دادەنێت، پاشان ڕایاندەوەشێنێ، ئینجا دەڵێت : من خۆم مەلیکم، من الله م )

165 لە ڕیوایەتێکی دیکەی بوخاریدا بەم جۆرەیە ﴿خودا، هەموو ئاسمانەکان لەسەر پەنجەیەك دادەنێت . ئاو وخاکیش لەسەر پەنجەیەك . هەموو ئاسمانەکان لە ڕۆژی قیامەتدا دەپێچێتەوە . پاشان بە دەستی ڕاستی دەیان گێڕێت، پاشان دەڵێت : من خۆم پادشام، ستەمکاران لە کوێن، ئەوانە لە کوێن کە خۆیان بە گەورە دەزانی ؟ ﴾

166- ابن عباس دەڵێت : (حەفت ئاسمانەکان و حەفت زەمینەکان لە نێو لەپی خودای ڕەحماندا، هیچ نیە تەنها وەك ئەوە وایە، یەکێکتان دەنکە خەردەلەیەك بکاتە دەستیەوە ) .

167- پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : (هەر حەفت ئاسمانەکان لە بەرانبەر کورسیەکەدا وەك ئەوەیە حەوت درهەم بخرێتە ناو قەڵغانێکەوە ) .

---

**165** مسلم (2788)

**166** حسن لغيره .أخرجه الطبري (30212) وابن أبي حاتم (18410)

**167** حسن لغيره . أخرجه الطبري (5795) قال ابن جبرين هذا الحديث مرسل لكن له شواهد

168- قال: وقال أبو ذر رضي الله عنه: سمعت رسول الله ﷺ يقول: (ما الكرسي في العرش إلا كحلقة من حديد ألقيت بين ظهري فلاة من الأرض).

169- وعَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ : مَا بَيْنَ السَّمَاءِ الدُّنْيَا وَالَّتِي تَلِيهَا مَسِيرَةُ خَمْسمِائَةِ عَامٍ وَبَيْنَ كُلِّ سَمَاءٍ خَمْسُمِائَةِ عَامٍ وَبَيْنَ السَّمَاءِ السَّابِعَةِ وَالْكُرْسِيِّ خَمْسُمِائَةِ عَامٍ وَبَيْنَ الْكُرْسِيِّ وَالْمَاءِ خَمْسُمِائَةِ عَامٍ وَالْعَرْشُ فَوْقَ الْمَاءِ وَاَللَّهُ فَوْقَ الْعَرْشِ ، لا يخفى عليه شيء من أعمالكم).

أخرجه ابن مهدي عن حماد بن سلمه عن عاصم عن زر عن عبدالله ورواه بنحوه عن المسعودي عن عاصم، عن أبي وائل، عن عبد الله. قاله الحافظ الذهبي رحمه الله تعالى، قال: وله طرق.

170- وعن العباس بن عبد المطلب رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: (هل تدرون كم بين السماء والأرض؟) قلنا: الله ورسوله أعلم

---

**168-[168] ئەبوزەڕ ﷺدەڵێت : گوێبیستی پێغەمبەر بووم (ﷺ) دەیفەرمو: (کورسی لەبەرانبەر عەڕشی خودا دا، تەنها وەك حەڵقەیەکی ئاسن وایە، کە لە بیابانێکی سەر زەمیندا فڕێ درابێت ) .**

**169- [169] ابن مسعود ﷺ گوتی: (بەینی ئاسمانی دونیا و ئەوەی دوای ئەو (500) ساڵە، وە بەینی سەرو و خواری هەر ئاسمانێك (500) ساڵە . نێوانی ئاسمانی حەفتەم و کورسی (500) ساڵە، بەینی کورسی و ئاو(500) ساڵە وە عەرش لەسەروو ئاوە، خوداش لەسەروو عەرشەوەیە . هیچ شتێ لە کردەوەکانی ئێوەی لێ وون نابێت ) .**

---

[168] **صحيح .أخرجه الطبري في التفسير (5795) والبيهقي في الأسماء والصفات . وعبدالله ابن أحمد في السنة ، وابن حبان في صحيحه .**

**169 حسن . موقوف أخرجه الطبراني في الكبير ( 8987)**

قال: (بينهما مسيرة خمسمائة سنة، ومن كل سماء إلى سماء مسيرة خمسمائة سنة وكثف كل سماء خمسمائة سنة، وبين السماء السابعة والعرش بحر بين أسفله وأعلاه كما بين السماء والأرض، والله سبحانه وتعالى فوق ذلك، وليس يخفى عليه شيء من أعمال بني آدم). أخرجه أبو داود وغيره.

## فيه مسائل:

الأولى: تفسير قوله: (وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) .

الثانية: أن هذه العلوم وأمثالها باقية عند اليهود الذين في زمنه ﷺ لم ينكروها ولم يتأولوها.

الثالثة: أن الحبر لما ذكر للنبي ﷺ ، صدقه، ونزل القرآن بتقرير ذلك.

الرابعة: وقوع الضحك من رسول الله ﷺ ، لما ذكر الحبر هذا العلم العظيم.

الخامسة: التصريح بذكر اليدين، وأن السماوات في اليد اليمنى، والأرضين في الأخرى.

السادسة: التصريح بتسميتها الشمال.

السابعة: ذكر الجبارين والمتكبرين عند ذلك.

الثامنة: قوله: ( كخردلة في كف أحدكم ).

التاسعة: عظم الكرسي بالنسبة إلى السماوات.

العاشرة: عظم العرش بالنسبة إلى الكرسي.

الحادية عشرة: أن العرش غير الكرسي والماء.

الثانية عشر: كم بين كل سماء إلى سماء. الثالثة عشر: كم بين السماء السابعة والكرسي.

الرابعة عشر: كم بين الكرسي والماء. الخامسة عشر: أن العرش فوق الماء.

170- [170] عەباس کوڕی موتەلیب ﵁ گوتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموی : ( ئایا دەزانن بەینی ئاسمان و زەوی چەندە ؟

گوتمان: خودا و پێغەمبەرەکەی دەزانن . فەرموی : ( نێوانیان ڕێگای 500ساڵە . لە هەر ئاسمانێکەوە هەتا ئاسمانێکی دیکە ڕێگەی 500ساڵە . چڕی و ئەستوری هەر ئاسمانێك ڕێگەی 500 ساڵە . بەینی ئاسمان و عەرش بەحرێکە کە نێوانی بنی بەحرەکە وسەرەوەی بەحرەکە وەك بەینی ئاسمان وزەوییە .خوداش لە سەرووی ئەوانەوەیە . هیچ شتێ لە کردەوەکانی نەوەی ئادەمی لێ گوم نابێت .

## مەسەلەکانی ئەم باسە

1- تەفسیری وتەی خودای بڵند وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ

2- ئەم زانستەو وێنەکانی لای جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم )مابونەوە و ئینکاریان لێ نەدەکرد و تەئویلیشیان نەدەکرد.

3- کاتێ زانا جولەکەکە ئەوەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد بە ڕاستی دانا و ئایەتی قورئانیش بۆ سەلماندنی ئەو مەسئەلەیە دابەزی .

4- پێکەنینی پێغەمبەر(ﷺ)، پاش ئەوەی ئەو جولەکەیە ئەو زانستە مەزنەی باس کرد .

5- ڕاگەیاندنی ئەوەی کە خودا دوو دەستی هەیە، گشت ئاسمانەکان لە دەستی ڕاستیدایە، زەمینەکانیش لە دەستەکەی دیکەیدایە .

---

170 أخرجه الترمذي (3320) وأبو داود (4723) وأحمد وابن ماجة . ضعّفه الألباني . وقال عبدالرحمن آل الشيخ : وهذا الحديث له شواهد في الصحيحين وغيرهما ، مما يدل على صريح القرآن فلا عبرة بقول من ضعّفه

6- بەئاشکرا ناو بردنی ئەوەیان بە شیمال واتە ( چەپ) .

7- باسی زۆرداران و خۆبە گەورەزانان لەو کاتەدا .

8- فەرموودەکەی :( وەك خەردەلەیەکە لە دەستی ئێوەدا )

9- گەورەیی وعەزەمەتی کورسیەکە لە بەرانبەر ئاسمانەکاندا .

10- گەورەیی عەرش لە بەرانبەر کورسیەکەدا .

11- عەرش جیایە لە کورسی و ئاوەکە .

السادسة عشرة: أن الله فوق العرش.

السابعة عشر: كم بين السماء والأرض.

الثامنة عشر: كثف كل سماء خمسمائة عام.

التاسعة عشر: أن البحر الذي فوق السماوات بين أعلاه وأسفله مسيرة خمسمائة سنة.

والله سبحانه وتعالى أعلم.

والحمد لله رب العالمين، وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

12- بەینی هەر ئاسمانێك تا ئاسمانێکی دیکە چەندە .

13- بەینی ئاسمانی حەفتەم وکورسی چەندە .

14- بەینی کورسی و ئاو چەندە .

15- عەرش لە سەروو ئاوە .

16- الله لە سەرووی عەرشە .

17- بەینی ئاسمان و زەوی چەندە

18- چڕی و ئەستوری هەر ئاسمانێك500ساڵە

19- ئەو بەحرەی کە لە سەرووی ئاسمانەکانە نێوانی سەروو بنەکەی 500 ساڵە .

والله أعلم انتهى بحمدلله

سەرچاوە سەرەکیەکان:لە گەڵ چەند سەرچاوەیەکی دیکەدا


| | | |
|---|---|---|
| 1 | تفسير السعدي | عبدالرحمن السعدي |
| 2 | فتح المجيد | عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ تحقيق حامد الفقي |
| 3 | فتح المجيد | بتحقيق عبد الرزاق المهدي |
| 4 | السبك الفريد | عبدالله بن عبدالرحمن بن الجبرين |
| 5 | إعانةالمستفيد | صالح بن فوزان بن عبدالله الفوزان |
| 6 | القول السديد | عبدالرحمن السعدي |
| 7 | التمهيد لشرح كتاب التوحيد | صالح بن عبدالعزيز آل الشيخ |
| 8 | شرح فتح المجيد شرح كتاب التوحيد | عبدلله بن محمد الغنيمان |
| 9 | القول المفيد | محمد بن صالح العثيمين |
| 10 | قرة عيون الموحدين | عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ |

بسم الله الرحمن الرحيم

# خاتیمە

**الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله وصحبه ومن والاه.**

دانەر شێخ محمد پێشەکی بۆ ئەم کتێبە نەنوسیوە وا دیارە لەوەدا شوێن پێی ئیمامی بوخاری کەوتووە، هەروەك لە نوسینەوەی ئەم کتێبەشدا هەر وای کردووە . بۆیە وەك گوتویانە ئەم کتێبە وەك پارچەیەکە لە صەحیحی بوخاری بۆیە منیش لە جیاتی پێشە کی خاتیمەم نوسیوە، ڕەحمەت لەو کەسەی داوای خاتیمەی باش لای خودا بۆ خۆشی بۆ ئێمەش دەکات. خودا لەو کەسانەش ڕازی بێت کە ئەم تەوحیدەی بە ئێمە گەیاند .

پاشان لەبارەی بەکارهێنانی هەندێ کەلیماتی عەرەبیەوە، دەڵێم : هەندێ کەلیمە هەیە ناکرێن بە کوردی وەك: زەکات ،حەج، حەڵاڵ، حەرام ، کوفر، ئیمان ، واجب . جا ئەگەر لە جێی ئەوانە وشەی کوردیان دانا ئەوا مەعنا ئەصلیەکەی نادات . دەبێتە هۆی سەر لێ تێکدانی خوێنەران ئەوانەش کە شارەزای ئوصولی فیقهن باش لەم مەسەلەیە تێدەگەن .

ئەمەش کورتەیەکە لەبارەی دانەرەوە ئیمام محمد ی کوڕی عبدالوهاب کوڕی سلیمان ساڵی 1115کۆچی لە **العیینە** لە دایك بووە لە بنەماڵەیەکی بەڕێزدا . باوکی یەکێ بووە لە عولەما ناسراوەکانی نەجد . باپیریشی ناسراو بووە بە فیقه وفەتواکانی. ئەمانەش هانی داوە هەر زوو دەست بکات بە کۆکرنەوەی زانست وخۆی بۆ یەکلایی بکاتەوە . لەگەڵ ئەوانەشدا خودا زیرەکی و بیرتیژیەکی کەم وێنەی پێ دابوو . ئەوە بوو لە پێش تەمەنی دە ساڵیدا قورئانی حیفز کردووە. چەند کتێبێکی گرنگی داناوە . لەوانەش ئەم کتابەیە کە لەلایەن زانایانەوە گرنگی زۆری پێ دراوە . چەندین شروحاتی لەسەر نوسراوە . دانەر ڕەحمەتی خودای لێ بێت ساڵی 1206 لەپاش هیجرەتی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە .

ئنجا بە باشم زانی ئەم قاعیدەیە بخەمە ئێرە  کە  بۆ جیاکردنەوەی شیرکی گەورەو بچوك زۆر گرنگە , شێخ عبدالرحمن السعدى دەڵێت :

فإن حد الشرك الأكبر وتفسيره الذي يجمع أنواعه وأفراده:

(أن يصرف العبد نوعا أو فردا من أفراد العبادة لغير الله).

فكل اعتقاد أو قول أو عمل ثبت أنه مأمور به من الشارع فصرفه لله وحده توحيد وإيمان وإخلاص، وصرفه لغيره شرك وكفر.

فعليك بهذا الضابط للشرك الأكبر الذي لا يشذ عنه شيء.

كما أن حد الشرك الأصغر هو:

(كل وسيلة وذريعة يتطرق منها إلى الشرك الأكبر من الإرادات والأقوال والأفعال التي لم تبلغ رتبة العبادة).

فعليك بهذين الضابطين للشرك الأكبر والأصغر، فإنه مما يعينك على فهم الأبواب السابقة واللاحقة من هذا الكتاب، وبه يحصل لك الفرقان بين الأمور التي يكثر اشتباهها والله المستعان.)

**لەبارەی حەدیسە زەعیفەکانەوە  ابن الفوزان دەڵێت**

:( فالشيخ رحمه الله قد يذكر بعض الأحاديث الضعيفة إذا كان لها ما يؤيِّدها من القرآن أو من السنّة. وهذه قاعدة معروفة عند أهل العلم.)

**گوتەی ﴿ الشيخ عبد الرحمن بن قاسم ﴾ لە بارەی ئەم کتابەوە :**

ليس له نظير في الوجود، وقد اشتهر الكتاب وعم نفعه، وكثرت شروح العلماء عليه، وسارع الطلاب إلى حفظه.

**سبحانك اللّهم**

**وبحمدك أشهد أن لاإله إلاّ انت**

**أستغفرك وأتوب إليك**

**شایەتی دان بە محمد کە ڕەوانەکراوی خودایە بە چوار شت دێتە دی 1.هەرچی خەبەرێکی دابێت بە ڕاستی بزانیت. 2. هەر چی ئەمرێکی دابێت بە قصەی بکەیت 3. هەر چیەکی قەدەغە کردبێت خۆتی لێ بە دوور بگریت 4. نایێت هیچ جۆرە عیادەتێك بکرێت ، ئیلا بەو جۆرە نەبێت کە خۆی فەرمویەتی.**

**15 – السَّبُّ هُوَ الْكَلاَمُ الَّذِي يُقْصَدُ بِهِ الاِنْتِقَادُ وَالاِسْتِخْفَافُ ، وَهُوَ مَا يُفْهَمُ مِنْهُ السَّبُّ فِي عُقُول النَّاسِ ، عَلَى اخْتِلاَفِ اعْتِقَادَاتِهِمْ ، كَاللَّعْنِ وَالتَّقْبِيحِ (1) .**
**وَحُكْمُ سَابِّهِ ﷺ أَنَّهُ مُرْتَدٌّ بِلاَ خِلاَفٍ (2) .**
**وَيُعْتَبَرُ سَابًّا لَهُ ﷺ كُل مَنْ أَلْحَقَ بِهِ ﷺ عَيْبًا أَوْ نَقْصًا ، فِي نَفْسِهِ ، أَوْ نَسَبِهِ ، أَوْ دِينِهِ ، أَوْ خَصْلَةٍ مِنْ خِصَالِهِ ، أَوِ ازْدَرَاهُ ، أَوْ عَرَّضَ بِهِ ، أَوْ لَعَنَهُ (3) ، أَوْ شَتَمَهُ ، أَوْ عَابَهُ ، أَوْ قَذَفَهُ ، أَوِ اسْتَخَفَّ بِهِ ، وَنَحْوَ ذَلِكَ (4) . الكتاب : الموسوعة الفقهية الكويتية22 | 148**

صادر عن : وزارة الأوقاف والشئون الإسلامية – الكويت